# دەوڵەتی فاطیمی

دانەر

علي محمد محمد الصلابي

وەرگێڕانی

إبراهيم حسن سعيد

## پێشکەش کردن

ئەم کتێبە بەتایبەت پێشکەش دەکەم بەکوڕان و نەوەی باکوری ئەفریقیاو بەگشتیش بۆ هەموو ئوممەت ، داوا لە خوای بەرزو شکۆمەند دەکەم بەناوە جوانەکان و سیفاتە بەرزەکانی، کەوا ئەو کارەم تەنها و تەنها لە بەر خاتری خۆی ئەنجام دابێت.

﴿يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا﴾ (الكهف :١١١)

## پێشەکی

إن الحمدلله نحمده ونستعينه، ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا، ومن سيئات أعمالنا، من يهدي الله فلا مضل له، ومن يضلل الله فلا هادي له، وأشهد أن لاإله إلا الله وحده لاشريك له، وأشهد أن محمداً عبده وسوله.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ آل عمران: ١٠٢.

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ النساء: ١.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِنْدَ اللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا﴾ الأحزاب: ٧٠_ ٧١.

خودایە ئەی پەروەردگارم بە سوپاسێك سوپاست دەكەم، كە هەر شایەنی گەورەو شكۆی خۆت بێتو، سوپاس و ستایشت دەكەم هەتاوەكو ڕازی دەبیت لە پاش ڕازی بونیش هەر بەردەوام دەبم لە پیا هەڵگوتن و سوپاس و ستایشت.

ئەمە كتێبی سێهەمە دەوڵەتی فاطیمي كەوا باس لە دەوڵەتی عوبەیدی فاطیمي ڕافیزی دەكات هەر لە سەرەتایی دروست بوونی هەتاكو ڕووخانو دارمانیو، دەكۆڵێتەوە لە شیعەو گرووپەكانی و باس لە ترسناكیان دەكات لە سەر ئەو ئومەتە بەڕێزە، چەند تیشكێكیش دەخاتە سەر هۆكارەكانی سەركەوتنی دەوڵەتی فاطیمي لە باكوری ئەفریقیاو بەڕوونیش حەقیقەتی ئەو كێشەیە دەردەخات، كە لە نێوان رافضة و ئەهلی سوننەدا هەیەو باسی شێوازە جۆراو جۆرەكانی رافیزە دەكات لەدژایەتی كردنی ئەهلی سوننەو هەڵوێستی ئەهلی سوننەش لەم بارەیەوە ڕوون دەكاتەوە، هەروەها باسی ئەو ماندووبوونو هەوڵو كۆششە گەورەیە دەكات، كەوا خەڵكی باكوری ئەفریقیا خستیانە گەڕو سەرفیان كرد، بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی عوبەیدی، كە زانایانی ئەهلی سوننە ڕۆڵێكی بەرچاویان هەبوو لە هەر یەكە لە بواری زانست و پەروەردەو هەڵگرتنی چەك لەدژی ڕەوافیزەكان.

هەروەها ئەم کتێبە تیشك دەخاتە سەر کاریگەری دەوڵەتی صەنهاجی لە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەو لابردنی ڕەگ و ڕیشاڵی ڕەوافیزەکان لەباکوری ئەفریقیا، بەتایبەتی لەسەردەمی موعیزی کوڕی بادیس‌و کوڕەکەی تەمیم ، هەروەها باسی کۆمەڵێك ڕوداو دەکات، کە لەنێوان دەوڵەتی عوبەیدی لەمیسرو دەوڵەتی صەنهاجی ڕوویان داو، ڕاڤەی ئەو هۆکارانەش دەکات، کە بوونە هۆی ڕووخانی دەوڵەتی صەنهاجی، هەروەها ئەم کتێبە خوێنەر لەگەڵ خۆی دەبات بۆئەو کێشەیەی لە نێوان ڕەوافیزەکان و ئەهلی سوننە لەعیراق ڕوویاندا بۆ ئەوەی جەخت بکاتەوە لەسەر مانایەکی گرنگ: ئەویش، کە مێژووی باکوری ئەفریقا بەشێکە لەمێژووی ئوممەت‌و ئەورۆژێ و کاریگەر دەبێ بەو ڕووداوانەی ڕوو دەدەن لە میسرو حیجاز و شام و عیراق...هتد.جا چ بەباش یان خراپ، چونکە ئێمە ناتوانین مێژووی ئوممەت لەگەڵ یەکتریدا بیچڕێنین، هەروەها ئەم کتێبە جەخت لە سەر مەسەلەی فیقهی تەمکین دەکاتەوە لەلای هەردوو سەرکردەی خاوەن شکۆ نورالدین محمود و صلاح الدين الأيوبي لەمیانی ژیانە جیهادیە پیرۆزەکەیان ،هەروا باس لە هەوڵ و تێکۆشانی زانایان و پەروەرەدەکاران دەکات، کە ڕۆڵیان بینی لە بەدیارکەوتنی نەوەی سەرکەوتن و جێگیربوون جیل النصر والتمكين، هەرەوەها ئەم کتێبە دەیەوێ ڕاڤەی سوننەتی خوا بکات لە کۆمەڵگەکان و دەوڵەتەکان و هۆزەکان، ئەمەش لە میانی تەفسیری مێژوویی بۆ ڕووداوەکان‌و گرنگی ڕۆڵی زانایان لە سەرکردایەتی کردنی ئوممەت بەرەو سەروەری و غیرەت و کەرامەت و داکۆکی کردن لەسەر بەکارهێنانی هۆکارە ماددی و مەعنەویەکان، کەوا زامینی سەرکەوتن دەکات بەسەر دوژمنان ، هەروەها باس لە سوننەتی تدرج دەکات لە گۆڕانی گەلەکان و دامەزراندنی دەوڵەتەکان، کە لەمەوە گرنگیەکی هەرە گەورە دەداتە پەروەردەکردنی خوایی التربية الرَّبانية لە بەدیهێنانی ئامانجە گەورەکانی ئوممەت جا یەکسانە، لەسەر ئاستی سەرکردەکان بێت لەمەڕ ئەخلاق و زانست و جیهادیان، یان لەسەر ئاستی گەلەکان لەمەڕ باوەش کردنەوەیان بۆ کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ و سەرکردە دڵسۆزەکانی.

ئەم هەوڵە مل کەچانەیە هیچ بابەتێکی نوێی نەهێناوە، بەڵکو تەنها کۆکردنەوەو ڕێکخستنەو هەوڵێکیشە بۆ شیکردنەوەو تەفسیرکردنی ئەو ڕووداوە مێژووییانەی لەوکات

لەباكوری ئەفریقیا ڕوویانداوە ، كە لە بزووتنەوە مێژووییەكەی زۆر كاریگەر بووە بە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی ، جا ئەگەر ئەم هەوڵ و كۆششە باشو چاك بێت ئەوە تەنهاو تەنها لەلایەن خواوەیە، ئەگەریش ڕێم ون كردبێت و بەهەڵە داچووبم ئەوا ئەگەر بۆ دەركەوت لێی پەشیمان دەبمەوەو، بواریش كراوەیە بۆ ڕەخنەو بەرپەرچدانەوەو تەعلیق لێدان .

ئامانجیشم لەو كتێبە ئەم خاڵانەی خوارەوەیە:

١ـ جەخت كردنەوە لەوەی كەوا بنچینەكانی مەددی ئیسلامی لەوڵاتەكانمان بنچینەیەكی سوننی یە نەوەك شیعی و شتی دەرەكەی تر بەڵكو ئەوەن، كە **پێغەمبەری** خوا ﷺ و هاوەڵەكانی لە سەری بووینە.

٢ـ سانا كردنی مەبدەئی پەندوەرگرتن لە زانین و ناسینی باروودۆخی دەوڵەتەكان و فاكتەرەكانی بنیات نانیان و هۆكارەكانی ڕووخانیانو، ڕوانین بۆ سوننەتەكانی خوا لە بەرزایی و دەرون و كۆمەڵگاكاندا.

٣ـ گرنگیدان بەزانین و ناسینی عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتو، پەوەردەكردنی نەوەی ئوممەت لە سەریو، كەشف كردنی بیروباوەڕی ڕەوافیزەكان، كە دژو پێچەوانەیە لەگەڵ قورئانی پیرۆزو سوننەتی **پێغەمبەرەكەی** ﷺ و ئیجماعی زانایە سەر ڕاستەكان.

٤ـ ناسندن بە هەندێك سەركردەیی خواناس لە ڕۆژئاوای ئیسلامی وەك: موعیزی كوڕی بادیس و تەمیمی كوڕی موعیز، لە ڕۆژهەڵاتیش وەك نورالدین محمود و صلاح الدین الأیوبي هەتاكو نەوەكانی داهاتوی موسوڵمانان سوود لەو ژیانە پڕخێرەی ئەوان وەربگرن، كەوا بەئاواتن بگەن بە سەركەوتن و جێگیر بوونی دینی خواو هەردەم ئەم ئاوازە لە خولیایان دایەو ئەزرینگێتەوە.

٥ـ دەوڵەمەندكردنی مەكتەبەی ئیسلامی لە بارەی ئەو بابەتە مێژوویانەی كەوا هەڵقوڵاوە لە عەقیدەیەكی ڕاست و ڕەوان و تێگەیشتنێكی ساغ و دوور لەو ژەهری ڕۆژهەڵاتناسەكانو، هزری ئەو عەلمانیانەی كەوا هەوڵ دەدەن ڕاستیە مێژووییەكان بشێوێنن لە بەر خاتری خزمەتكردنی ئامانجەكانیان.

سەبارەت بە پلانی كتێبەكەش ئەوا هەڵساوم بە دابەش كردنی بۆ چوار بەش:

**باسی یەکەم: دەوڵەتی شیعی لە باکوری ئەفریقا ئەمەش، کە لە پێنج باس پێك دێت.**

**تەوەرەی یەکەم:** پێناسەی شیعە لەزمانەوانیدا.

**یەکەم:** پێناسەی شیعە لە زمان و زاراوەدا.

**دووەم:** پێناسەی رافضة.

**سێ یەم:** هۆی ناونیان بەم ناوە.

**چوارەم:** سەرەتایی سەرهەڵدانی شیعەگەرایەتی.

**تەوەرەی دووەم:** پێناسەی گرنگ ترین گروپەکانی شیعە.

**یەکەم:** نوصەیریەکانو بیروباوەڕیان.

**دووەم:** شیعەی دوانزە ئیمام.

**–بەردەوام بوونی ئەو شیعە دوانزەئیمامیە لە سەردەمی ئێستاد.**

**–ئیمامی شیعی لە سەردەمی ئێستا و ئەو دەوڵەتەی، کە بنیاتی ناوە.**

**–ئەزمونی شێخ موسی جاراللە**

**سێ یەم:** شیعەی ئیسماعیلی.

أـ ترسناکی مەزهەبی باطيني لە سەر ئوممەت.

ب ـ بیروباوەڕە گەندەکەی باطنیەکان.

**تەوەرەی سێ یەم:** بانگخوازی باطنیەکان لە باکوری ئەفریقیا.

**تەوەرەی چوارەم:** الخليفة الشيعية عبيدالله المهدي الرافضي.

**تەوەرەی پێنجەم:** عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە بارەی مەهدی.

**- ناوو سیفەتەکانی.**

**- شوێنی دەرچوونی.**

**یەکەم:** ئەو فەرموودانەی باس لەمەهدی دەکەن لە ڕێگایی‌تەواتورەوە هاتوە.

**دووەم:** ئەوانەی ئینکاری لە فەرموودەکانی مەهدی دەکەن و بەرپەرچ دانەوەیان.

**باسی دووەم: کێشە لە نێوان دەوڵەتی عوبەیدی و خەڵکی باکوری ئەفریقیا ئەمەش، کە هەشت باس لە خۆ دەگرێت:**

**تەوەرەی یەکەم:** شۆڕش کردنی هۆزی هەوارە لە تەرابلس.

**تەوەرەی دووەم:** هەڵکشان و خشینی عوبەیدیەکان بۆ بەرقە.

شۆڕش کردنی خەڵکی بەرقە لە سەر عوبەیدیەکان.

**تەوەرەی سێ یەم:** دەرچوونی أبي يزيد الخارجي لە سەر عوبەیدیەکان.

**تەوەرەی چوارەم:** خەلیفەی دووەمی رافضي القائم بأمرالله.

**تەوەرەی پێنجەم:** خەلیفەی رافضي سێ یەم مەنصور.

**تەوەرەی شەشەم:** الموعیزلدین الله أبو تمیم سعد.

- چوونی موعیز بۆ میسر.

**تەوەرەی حەوتەم:** تاوانی عوبەیدیەکان لە باکوری ئەفریقیا.

**تەوەرەی هەشتەم:** هەڵوێستی زانایانی ئەهلی سوننە و شێوازەکانی بەرگریکردن.

وتوێژەکانی پێشەوا أبی عثمان سعد الحداد.

**باسی سێ یەم:** دەوڵەتی صنهاجی ئەمەش شەش باس لە خۆ دەگرێت:

**تەوەرەی یەکەم:** أبوالفتح یوسف بلکین.

**تەوەرەی دووەم:** الموعیز بن بادیس الصنهاجی.

**تەوەرەی سێ یەم:** خشانی بنی هلالو بنی سلیم.

**تەوەرەی چوارەم:** پێکدادانی چەکداری لە نێوان موعیزی کوڕی بادیس و هۆزە عەرەبیەکان.

**تەوەرەی پێنجەم:** کوڕەکانی موعیز و نەوەکانی.

**یەکەم:** تمیمی کوڕی الموعیز.

**دووەم:** ئەمیر یەحیا.

**سێ یەم:** ئەمیر علی کوڕی یەحیا.

**چوارەم:** ئەمیر حەسەنی کوڕی علی کوڕی یەحیا.

أـ والیی طرابلس لە سەردەمی ئەمیر حسن.

ب ـ رەجار هێرش دەباتە سەر طرابلس.

ج ـ قات وقوڕی وبرسیەتی لە طربلس.

**تەوەرەی شەشەم:** هۆکارەکانی ڕووخانی دەوڵەتی زیری لە باکوری ئەفریقا.

## باسی چوارەم.

هۆکارەکانی ڕووخانی دەوڵەتی عوبەیدی ئەمەش، کە سێ کۆباس لە خۆوە دەگرێت.

**تەوەرەی یەکەم:** هۆکارەکانی ڕوخانی دەوڵەتی عوبەیدی.

**تەوەرەی دووەم:** نورالدين

ـ یەکگرتنی وڵاتانی شام و هەرێمە میسریەکان.

ـ وەفات کردنی نورالدین.

**تەوەرەی سێ یەم:** صلاح الدين الأيوبي:

أـ القاضي الفاضل.

ـوەفات کردنی.

ب ـ وەفات کردنی الناصر صلاح الدين.

ج ـ ڕوخسارە سەرەکیەکان لە کەسایەتی صەلاحەدیندا.

د ـ پیا هەڵگوتنەکی قەشەنگ و جوان لە بارەی وەفات کردنی صلاح الدين.

ھ ـ چەند پەیامێکی جوان لە مەڕ هەواڵی وەفات کردنی صلاح الدين.

## پاشان ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە.

لە کۆتایی لە خودا داواکارم کەوا ئەو کارەم تەنها لەبەر خاتری ڕووی پڕشنگداری بێت و لە باتی هەر حەرفێك، کە نوسیومە پاداشت و چاکەم بداتەوەو بیخاتە تەرازووی چاکەکان، هەروەها پاداشتی ئەو بریانەشم بداتەوە، کەوا هانیان دام و یارمەتیان دام بەوەی پێیان کراو ڕەخسا لە تەواکردنی ئەم کتێبە.

سبحانك اللَّهُمَّ وبحمدك ،أشهد أن لا إله إلا الله إلا أَنْتَ، أستغفرك وأتوب إليك، وآخر دعونا أن الحمد لله رَّب العالمين.

دانەر

د. علي محمد محمد الصلابي

## له باكوری ئەفریقیا

### باسی یەكەم: بێژەی شیعە لە زمانەوانیدا.

جەوهەری رحمە الله وتویەتی: (شیعة الرجل)، واتە: شوێن كەوتەو دۆستی. وتراوە شایَعَهُ: هەروەكو،كە دەوترێ: (والاهُ)، كە لە (وَلي) هاتووە...

(تَشَيَّعَ الرَّجلُ) واتە: بانگەشەی شیعەگەرایەتی بۆ خۆی كرد، (تشايع القوم صار وأشيعا)، واتە: بوونە پاڵپشتو خۆشەویستی یەكتری، هەر گەلێكیش كاروباری یەك بێت و شوێن ڕای یەكتری بكەون پێیان دەوترێ (شِّيع) خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ﴾(سبأ: ٥٤) واتە: بەهاوشێوەیان، لەو ئوممەتانەی، كە ڕابردوون.[١]

لەكتێبی(مصباح المنیر)دا هاتووە، كە بێژەی شیعە مانای: شوێن كەوتەو دۆست دەگەیەنێ، هەر گەلێكیش كۆببنەوە لەسەر كارێك ئەوا شیعەیان پێ دەوترێ، پاشان شیعە بویتە وەسفێك بۆ كۆمەڵەلێكی دیاری كراوو تایبەت، كۆیەكەشی(شیع) وەكو(سِدرة و سِدَر)، (أشیاع)یش (جمع الجمع)( وشیعت رمضان بست من شوال)، واتە: لە دوایی مانگی ڕەمەزان شەش ڕۆژی مانگی شوال وەك پاشكۆیەك دێت.[٢]

پێناسەی شیعە بە پێی چەمكە زمانەوانیەیەكەی هەریەكە لەواتای قەوم و دۆست و یارمەتی دەردەگەینێ، ئەم واتایەش لە هەندێك ئایەتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووی: ﴿فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِ﴾ (القصص: ١٥) لە ئایەتێكی تریش دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِ لَإِبْرَاهِيمَ﴾ (الصافات: ٨٣) بێژەی شیعە لە ئایەتی سورەتی(قصص) بەمانای قەوم دێت، لە سورەتی (صافات)یش ئاماژە بەو دۆست و شوێن كەوتوانە دەكات، كە لە سەر یەك ڕاوبیر كۆكن و بەشداری تێدا دەكەن.[٣]

---

١ـ الصحاح للجوهری، ولسان العرب: شیع.

٢ـ المصباح المنیر: شیع.

٣ـ المصباح المنیر: ب ١ـ ٣٢٩.

وشەی شیعە مانایەکی(إصطلاح)ی سەربەخۆی وەرگرتوەو بەسەر کۆمەڵێك دادراوەو گوتراوە، کە بیروباوەڕیان وابوو ئیمامەت لە بەرژەوەندیە گشتیەکان نیە بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە لای بیروراو دیدی ئوممەت بۆ ئەوەی هەڵیبژێرن و دەست نیشانی بکەن، بەڵکو ڕوکنێکی ئاینو بنچینەیەکی ئیسلامەو بۆ هیچ پێغەمبەرێك نیە ئەم مەسەلەیە فەرامۆش بکات یان بیگەڕێنێتەوە لای ئوممەت، بەڵکو لەسەر ئیمام پێویستە بەخۆی دەست نیشانی بکات بۆ ئوممەت.[1]

أبو الحسن الأشعري لەمیانی باسکردنی شیعەدا وتویەتی: شیعە بۆیە بەم ناوە ناوبراون، چونکە عەلییان خۆش ویست و پێشیان خست لەسەر سەرجەم هاوەڵەکانی پێغەمبەرﷺ.[2]

عبدالرحمن بن خلدون وتویەتی: بزانە کە پێناسەی شیعە لە زماندا بەواتای دۆست و شوێن کەوتە دێت، لە نەریتی شەرعزانانەکانو موتەکەلمینەکان لە خەلەف و سەلەف بەو کەسانە دەوترێت: کە شوێنی عەلی و کوڕەکانی کەوتن ،جا ڕێڕەوو مەزهەبی هەموویان ئەوەیە، کە ئیمامەت ناکەوێتە ناو بەرژەوندیە گشتیەکان، بۆئەوەی بگەڕێتەوە لای بیروبۆچوونی ئوممەت ، بەڵکو لە سەر پێغەمبەرﷺ پێویستە ئیمامیان بۆ دەست نیشان بکات و دەشبێ دوور بێت لە گوناهی گەورەو بچوك، عەلیش پێغەمبەرﷺ خۆی دەست نیشانی کرد بە بەڵگەی چەند دەقێك، کە بەگوێرەی مەزهەبەکەی خۆیان دەیهێنن و ڕاڤەی دەکەن، کە ئەو دەقانە زانا بلیمەتەکانی سوننەت و شەریعەت نایناسن، بەڵکو زۆرینەی هەڵبەستراوە یان بەڕێگایەك داهاتووە، کە تانەی لێدراوەو ڕەخنەی لێگیراوە، یان دوورە لە ڕاڤە گەندەکەیان.[3]

---

١ـ بروانە: کتێبی مقدمة إبن خلدون لا ١٩٦ـ ١٩٧.

٢ـ مقالات الإسلاميين: ب ١/ ٦٥.

٣ـ بروانە: کتێبی مقدمة إبن خلدون لا ١٩٦ـ ١٩٧.

**دووەم: پێناسەی رافضە:** الرفض لە زماندا بەمانای وازلێهێنان دێت، وتراوە رَفَضَهُ، واتە: وازی لێهێنا، ئەصمەعی وتویەتی: بۆیە بە رافضة ناوبراون، چونکە وازیان لە زەیدی کوڕی عەلی هێنا.[1]

کەواتە وشەی رَفض لە زماندا بە مانای وازهێنان لە شتێك دێت.

بەڵام لە زاراوەدا: بە کۆمەڵێك لە شیعەکان دەوترێت ، بۆیەش ئەوها ناونراون، چونکە وازیان لە زەیدی کوڕی عەلی هێنا، ئەصمەعی زانایی پایە بەرز وتویەتی: پێشتر ئەوانە بەیعەتیان دابوە زەید، پاشان پێیان وت: حاشا لە أبوبكر وعمر بكە لەگەڵت شەڕدەکەین، ئەویش ڕازی نەبوو وتی: ئەم دووانە وەزیری باپیرەم بووینەو قەت حاشایان لێناکەم، ئەوانیش وازیان لێهێناو ناونران بەرافضة[2]

عبدالله ی کوڕی ئەحمەد وتوویەتی: بەباوکم وت: رافضي کێیە؟ وتی: رافضي ئەو کەسەیە، کە جوێن بە ئەبوبەکرو عومەر دەدات.[3]

**سێ یەم: هۆی ناونانیان بەم ناوە:**

کاتێك زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسێنی کوڕی عەلی بن أبي طالب یاخی بوو لە ژێر دەسەڵاتی هیشامی کوڕی عبدالملك لە ناو سوپاکەی هی وای تێدا هەبوو جنێویان بە ئەبوبەکرو عومەر دەدا ئەویش بەم کارە ڕازی نەبوو قەدەغەی کردن، ئەوانیش ڕەفزیان کردەوەو وازیان لێهێناو کەسی لە تەك نەمایەوە، تەنها دوو سەد سوار چاك نەبێت، زەیدی کوڕی عەلی لەودەمە پێیانی وت: رفَضتُموني واتە: وازتان لێ هێنام ، وتیان: بەڵێ ،هەر لەو کاتەوە ئەو ناوەیان بەسەردادراو مایەوە[4]، ئەمەش لە ساڵی(١٢٢)ی کۆچی بوو، پێشەوا إبن كثير لە میانی باسکردنی ڕووداوەکانی ئەم ساڵەدا وتویەتی: زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسێن کوڕی عەلی بن أبي طالب کوژرا، هۆیەکەشی ئەوە بوو، کە کاتێك ئەهلی کوفە ئەوانەی بەیعەتیان پێدا فەرمانی پێکردن لەسەرەتایی ئەوساڵە خۆیان ئامادە بکەن و

---

١ـ الصحاح للجوهري ب٢/ ١٠٧٨، ولسان العرب/ ب٧/ ١٥٧ مادة رَفَضَ.

٢ـ لسان العرب ب٧/ ١٥٧.

٣ـ مناقب الإمام لأبن الجوزي.

٤ـ إعتقادات فرق المسلمين والمشركين لا ٥٢.

دەربچن، کە خۆیان ئامادە کرد، لە ناویان پیاوێك بەناوی سولەیمانی کوڕی سوراقە ئەو هەواڵەی زەیدی گەیاندە یوسفی کوڕی عومەر، کە لە عیراق بریکاربوو لە شوێنێك بە ناوی(حیرة) یوسفی کوڕی عومەر ناردی بۆ ئەوەی چاوی بە زەید بکەوێ، بەڵام کاتێك شیعە بەمەیان زانی چوونە لای زەیدو پێیان وت: ڕەحمەتی خوات لێبێ ڕات چیەو چ دەڵێی دەربارەی ئەبو بەکرو عومەر؟ وتی: خودایان لێخۆش بێت، نەم زانیوە لە ئەهل و بەیتی من یەکێك هەبێت حاشای لێکردبن و بە خراپە ناوی هێنابن، منیش هەر بە باشە ناویان دەبەم، وتیان: ئەی بۆچی داوای تۆڵەو خوێنی ئەهل و بەیت دەکەیت؟ وتی: ئێمە شایەنترین کەس بووین بۆ ئیمامەت بەڵام کۆمەڵێك خۆیان پێش ئێمە خست و ئێمەیان لەو کارە دوور خستەوە، بەڵام ئەوان سەرەڕای ئەو کارەی کردیان لەلای ئێمە کافر نەبووینە، چونکە کاتێك حوکمیان کەوتە دەست دادگەریان کردو کاریان بە قورئان و سوننەت کرد، وتیان: ئەی بۆچی شەڕیان لەگەڵ دەکەی؟ وتی: ئەوانە وەك ئەوان نین، ئەوانە ستەمیان لە خۆیانو خەڵك کردو منیش بانگەشە بۆ قورئان و سوننەت دەکەمو هەوڵدەدەم بۆ زیندوو کردنەوەی سوننەتەکان و مراندنی بیدعەکان، ئەگەر گوێڕایەڵ دەبن ئەوا بۆ من و ئێوە باشترە ، ئەگەریش سەرپێچی دەکەن، ئەوا لە ئێوە کوجا مەرحەبا ، ئەوانیش ڕەفزیان کردەوەو لە دەوروبەریەوە نەمان و پەیمانەکەیان لەگەڵی هەڵوەشاندەوەو وازیان لێهێنا، بۆیە هەر لەم ڕۆژەوە ناونران بەرافضة[1]

جا هەرلێرەدا هۆی ناونانیان بە رافضة ڕوون دەبێتەوە، چونکە ڕەفزی زەیدی کوڕی عەلییان کرد، کە قەدەغەی کردن جنێو ئەبو بەکرو عومەر بدەنو وای لێهات وشەی رافضة بەو کەسانە وترا: کە زیادە ڕۆییان لە مەزهەبی شیعە دەکردو ڕێیان بەجنێو و تانە وتەشەردان دەدا بە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەرﷺ.

**چوارەم: سەرەتای سەرهەڵدانی شیعەگەرایەتی:**

کتێبە مێژووییەکان باس لەوە دەکەن، کە یەکەمین کەس بیرو هزری شیعە گەرایەتی چاند لەناو ئوممەت پیاوێکی جولەکە بوو پێیان دەوت: عبداللهی کوڕی سبأ، کە بۆ تانەو

---

١ـ البداية والنهاية ب٩/ ٣٧٠ـ ٣٧١

تەشەر لێدان لە ئیسلام، ئیسلامەتی خۆی ئاشکرا کرد، ئەمەش لە سەردەمی خەلیفەی ڕاشید عوسمانی کوری عەفان بوو، ناوە ناوە عبداللە دەگەڕا لە مەدینەو بەسرەو کوفەو میسرو شام ، هەتا کاتێك تێك دەردو داخ لە دڵەکان لە مونافیق و نەفامەکان بە حەقیقەتی دین لە دەورەی کۆبوونەوە، ئەو عبداللەیە ناسرا بوو بە إبن سوداء ، زۆر زیرەكو ژیرانە توانی دوو بیرۆکەی بنەڕەتی بڵاو بکاتەوە بۆ هێنانەدی ئامانجە یەهودیەکانی:

یەکەم: بانگەشەکردنی بۆ گەڕانەوەی **پێغەمبەر** ﷺ ودەیوت: سەیرم بەو کەسەدێ، کە گومان دەبا عیسا دەگەڕێتەوە، بەڵام باوەڕ ناکات محمد دەگەڕێتەوە، خودای گەورەش دەفـــەرموێت ﴿ إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨٥﴾ ﴾ القصص: ٨٥.

دووەم: بانگەشەکردنی بۆ بیروباوەڕی ئەوەی، کە هەموو **پێغەمبەرێك** شوێن گرێکی هەیە و عەلیش شوێن گری موحەممەدەو، موحەممەدیش کۆتایی **پێغەمبەرانە**و عەلیش کۆتای شوێن گرانەو کەسیش لەو کەسە ستەم کارتر نیە شوێن گری **پێغەمبەر** قەدەغە بکاو ئەو هەقە بفەوتێنێ و بۆ خۆی زەوت بکاو کاروباری ئوممەت بۆ خۆی بگرتە بەر.

إبن سبأ هاوەڵ و شوێن کەوتوەکانی نارد بۆ شوێنە جیاجیاکان بۆ ئەوەی درۆو بوختان بنوسن و بڵاو بکەنەوە بۆ ناشیرین کردنی والی و کاربەدەستەکان و، نیسبەتی ئەوەشیان دا پاڵ خەلیفەی موسڵمانان و ڕای سپاردن، کە لە دەوریان کۆببنەوەو، چەند نامەیەکیشیان تەزویر کردو دایانە پاڵ عوسمان بۆ ئەوەی کەلێن بخەنە نێوان ئوممەت و خەلیفەکەی و نێوانیان تێك بدەن، چەند شوێنێك یاخی بوون و خەڵکی بەسرەو کوفەو میسر بەدەم بانگەوازەکەی إبن سبأ هاتن و قەبوڵیان کرد، ئەمەش بۆ هێنانەدی چەند ئامانجێك ، کە یەکێك لە پیلانە هەرە گڵاوەکانی کوشتنی خەلیفەی ڕاشید عوسمانی کوڕی عەففان بوو، کە بە زولم کوشتیان.

شیخ الإسلام إبن تیمیة: ڕوونی کردۆتەوە، کە یەکەمین کەس رَفض و زیادەڕەوی داهێنا إبن سبأ بوو، إبن تیمیة لە میانی باس کردنی بۆ ئەم مەسەلەیە وتویەتی: بنچینەی رَفض مونافیقەکان و زیندەقەکانن دایان هێنا، چونکە بیرۆکەکە إبن سبأ دورستی کرد ،

ئیمامەتیشی کردە هەلێك بۆ ئەوەی زیادەڕۆیی تێدا بکاتو وتی: علی دورە لە گوناهو مەعصومە.[1]

هەروەها وتویەتی: بەڕاستی ئیبن سەبەئی مونافیق و زەندیق ویستی ئاینی ئیسلام تێك بدات و بشێوێنێو، ویستی ئەوەی بۆڵص بەسەر نەصرانیەکانی هێنا ئەویش ئاوا بەسەر موسڵمانان بێنێ، بەڵام ئەوەی بۆ بۆڵص ڕێککەوت و چووە سەر بۆ ئیبن سەبەء نەچووە سەر، چونکە نەصرانیەکان عەقلێکی سادەیان هەبوو، کاتێك عیسا –علیه السلام– بەرز کراوە بۆ ئاسمان خەڵکێکی کەم دوای کەوتبوون و فێرە ئاینەکەی ببوون، جا ئەوەی بۆڵص دایهێنا لە زیادەڕۆیی لە عیسا خەڵکێکی زۆر دوای کەوتن و زیادە ڕۆییان لە خۆش ویستنی عیسا کرد ، بەڵام ئەهلی حەق لێیان هەڵسان و ئەوەیان ڕت کردوەو دژیان وەستان هەتا کارەسات بەوە گەیشت، هەندێك پادشا یەکتر بکوژنو، هەندێکیش گۆشەگیربوون لە کەنیسەو دێرەکان، بەڵام سوپاس بۆ خوا ئەم ئوممەتە بەردەوام کۆمەڵێکی لە نێودایە، کە لە سەر هەقە، بە جۆرێك هیچ بێ باوەڕو بیدعەچیەك ناتوانێ تێکی بدا، یان بیەوێ خۆی زاڵ بکات بەسەر هەقدا ، بەڵام ئەو کەسەی بیەوێ گومرا بێ ئەوا شوێن ئەو گومڕایە دەکەوێ.[2]

لە بەر پیسی و نگریسی و فێڵ و دوژمنایەتی سەختی بۆ ئیسلام و موسڵمانان کەس لە ئەهلی ئیمان بە باش ناوی إبن سبأی نەبردووە، بەڵکو بەوە وەسفیان کردوە، کە یەکەمین کەسە سەرشۆڕو دۆڕاوەکانی فێری جنێو تانەو تەشەردان کرد بە ئەبوبەکرو عومەرو هەروەها وەسفیان کردوە بەدرۆ و نیفاق و بێ باوەڕیو گومڕایی.

ئیبن حەجەر لە ڕێگایی أبی إسحاق الفزاری باسی کردوە ، کە سوەیدی کوڕی غەفلە لە سەردەمی پێشەوایەتی عەلی چویتەلای و پێی وتوە: بەلای چەند کەسێك تێپەڕیم باسی ئەبوبەکرو عومەریان دەکردو دەشیان وت: کە تۆش لە دەروونەوە قسەیان پێ دەڵێی، عەلی وتی: من زۆر زۆر دوورم و لەو ڕەوشتە پیسە ، پاشان وتی: پەنا بەخوا من لە باشە بەولاوە هیچم لە ناو دڵ دانیە بەرامبەریان، پاشان عبداللّٰە‌ی کوڕی سەبەئی پەرگەندەی

---

١ـ مجموع الفتاوى لشيخ الإسلام إبن تيمية ب٤/ ٣٤٥.

٢ـ منهاج السنة ب٣/ ٢٦١.

مەدائین کردو، وتیشی: لێ مەگەڕێن لە هیچ شوێنێك بمێنێتەوە، پاشان کاتێك خەڵکی کۆبوونەوە هەڵسا ڕۆیشت بەرەو لای مینبەرەکەیو سەرکەوتە سەری‌و مەدح و سوپاس گوزاریەکی زۆری ئەبوبەکرو عومەری کردو لە کۆتایی وتارەکەشی وتی: هەواڵی هەرکەسێك لە ئێوەم پێ بگات من بە باشتر بزانێ لە ئەبوبەکرو عومەر ئەوا حەددی درۆزنی لێ دەردەکەم.[1]

هەندێك سەرچاوەی تریش باس لەوە دەکەن، کە عەلی ویستی بیکوژێ‌و شمشێریشیان بۆ هێنا پاشان وتی: دووریکەنەوە لێم، دوایی پەرگەندەی مەدائینی کرد.[2]

إبن عساکریش بە سەنەدێك لە أبی الجلاس ڕیوایەتی کردووەو وتویەتی: گوێم لە عەلی بوو بە عبداللەی کوڕی سەبەئی وت: کەسی درۆزن پەیدا دەبن تۆش لە ڕۆژی قیامەتدا یەکێکی لەوان.[3]

عەلی ڕایگەیاند،کە ئیبن سەبەء تۆخمێکی پیسەو ، ویستیشی بیکوژێ، بەڵام کاتێ پەشیمان بۆوە لە کوشتنی پەرگەندەی مەدائینی کرد ڕوونیشی کردەوە، کە یەکێکە لە پیاوە هەرە درۆزنەکان.

پێشەوا زەهەبی لە بارەی إبن سەبەء وتویەتی: عبداللەی کوری سەبەء یەکێکە لە هەر زەندیق‌و گۆمڕاو گومڕاکەرەکان، وا بزانم عەلی بە ئاگر سوتاندی، ئەو عبدالله یە گومانی برد قورئان پێك هاتووە لە نۆ جزم، کە عەلی بەمەی زانی یەکسەر دەری کرد پاش ئەوەی، کە ویستی بیکوژێ.[4]

إبن حجر پاش ئەوەی چەند ڕیوایەتێکی هێناوە لە زەم کردنی وتویەتی: هەواڵ و دەنگوباسی عبداللەی کوڕی سەبەء زۆر باوە لە مێژووەکان، سوپاس بۆ خوا، کە هیچ ڕیوایەتێکی نیەو، چەند شوێن کەوتەیەکی هەیە پێیان دەڵێن: سەبەئیەکان ئەوانە

---

١ــ بروانە: تلبيس إبليس لا ١٠٠ــ ١٠١.

٢ــ تأريخ دمشق لإبن عساكر. ب ٣٤/ ٦

٣ــ ميزان الإعتدال ب٢/ ٤٢٦.

٤ــ لسان الميزان ب٣/ ١٢٢ــ ١٢٣.

بیروباوەڕیان وایە، کە عەلی کوڕی ئەبو طالیب خوایە، عەلی لە خیلافەتی خۆی بە ئاگر سوتاندنی[1].

دەڵێم: سزادان بە ئاگر لە شەرعدا قەدەغەکراوە، دەیتوانی تەنها بە شمشێر بیان کوژی[2]، بەم شێوەیە بۆ خوێنەری سەنگین ڕوون دەبێتەوە، کە ئیبن سەبەئی یەهودی یەکەمین کەس بوو، کە بیرۆکەی شیعەگەرایەتی چاندو وتیشی، کە محمد وەك عیسا دەگەڕێتەوەو شوێن گری پێغەمبەریش عەلیە، جا شوێنکەوتەکانی و هەندێك لەو زانایانەی، کە بەشکێکی ئەوتۆیان لەعیلم و هیدات بەرنەکەوتبوو باوەڕیان بەو درۆو بوختانانە کردوو بڵاویان کردەوە.[3]

ئەوەی لە مێژوو بکۆڵێتەوەو دیراسەتی بکا بۆی دەردەکەوێ، کە کاتێك ئوممەت جولەو خورپەیەکی بە هێزدەکا، ئەوا هۆیەکەی چەند کەسێکی داخ لە دڵە لە ئیسلام، کە خۆیان شاردۆتەوە لەنێوەندی موسڵمانانو هیچ ماندوو بوون و بێزاری ڕوویان تێ ناکا لە بڵاوکردنەوەو چاندنی تۆی هزرە نگریسو شەیتانیەکانیان، کە دژ بەعەقیدەی ئیسلامیە، ئەو عەقیدەیەی لەکتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺ هەڵقوڵاوە.

---

١ـ لسان المیزان ٣/١٢٢، ١٢٣.

٢ـ لە ناوبردن بە ئاگر لەشەرعدا قەدەغە نەکراوە بەڵکو سزادان قەدەغە کراوە جیاوازیەکی زۆریش هەیە لە نێوانیان، بەڵگەشمان ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەرە کە دەفەرموێ: ((پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران چوو لە ژێر دارێك پشوو بدات جا مێروولەیەك گەستی ئەویش فەرمانی کردە ئەوانەی لەگەڵی بوون مێروولەکانی ناو شارە مێروولەکە هەمووی دەربێننو پاشان هەمووی بسوتێنن خوای گەورەش سروشی بۆ هەناردوو فەرمووی هەر یەك مێروولەت لەناو ببردبایە)) رواه الامام أحمد وغیره و إسناده صحیح علی شرط الشیخین. پاشان عەلی خوا لێی ڕازی بێ یەکێکە لە خولەفای ڕاشدین کە فەرمانمان لەلایەن پێغەمبەرەوە پێکراوە شوێن سوننەتەکانی بکەوین ئەمەش یەکێکە لە سوننەتەکانی ، پاشان ئەوانە گەورەترین تاوانیان ئەنجامدا بەوەی عەلیان کردە خوا بۆیە ئەویش گەورەترین سزای دان بۆ ئەوەی کەس جورئەتی ئەوە نەکات شتی وا بلێت جونکە زەمەنەکە زەمەنی فیتنە بوو عەلیش ویستی ڕێ لەو جۆرە کوفرو شیرکانە بگرێت. والله أعلم.وەرگێڕ

٣ـ إبن سبأ حقیقة لا خیال(سعد الهاشمي).

## تەوەرەی دووەم : پێناسەی گرنگ ترین گروپەکانی شیعە :

لە ڕاستیدا ئەو زانایانەی لە کۆمەڵ و مەزهەبەکانیان کۆڵیتەوە، ئەوا کتێبێکی زۆریان داناوە لە سەر گروپەکانی شیعە، لەم لێکۆڵینەوەیە وام بەباش زانی هەندێکیان باس بکەم بێ ئەوەی درێژەی پێبدەم تەنهاباطنیەکان نەبێت، چونکە ئەوان حوکمی باکوری ئەفریقیان کرد ،لەگەڵ شیعەی دوانزە ئیمام، چونکە ئەوانە ئەمڕۆ دەوڵەتیان هەیە و هەڵدەستن بە بڵاوکردنەوەو یارمەتی دانی مەزهەبی شیعە، هەروەها نوصەیریەکانیش، چونکە هەر لە سەرەتای حەفتاکاتەوە هەتاوەکو ئێستا حوکمی سوریا دەکەن.

ئەوگروپە شیعانەی، کە زانایانی گروپ ناس باسیان لێوەکردوە ئەمانەن:

١ـ السبئية. ٢ـ الغرابية.٣ـ البياتية.٤ـ المغيرية.٥ـ الهاشمية.٦ـ الخطابية.٧ـ العلبائية.٨ـ الكيسانية.٩ـ الزيدية الجارودية.١٠ـ السليمانية.١١ـ الصالحية.١٢ـ البترية.

هەندێك لەو گروپانە زیادەڕۆیی زۆر گەورەیان کردووە، هەندێکیشیان کەمتر، ئەوەی دەیەوێ زیاترو فراوانتر زانیاریان لە بارەیەوە بزانێ ئەوە با بگەڕێتەوە بۆ کتێبی(مقالات الإسلاميين لابي حسن الأشعري) و (الملل والنحل للشهرستاني) و(الفرق بين الفرق بن طاهر البغدادي)

**یەکەم:** النُصيرية:

ئەم گروپە یەکێکە لە هەرە گروپە توندڕەوو زیادەڕۆکانی شیعە ڕەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر محمدی کوڕی نصرالمنیری ،ئەو گروپە هەڵقولاوی شیعەی دوانزەئیمامی ڕافزییە، کە زیادە ڕۆییان لە عەلی کوڕی ئەبو طالیب کردو کردیانە خوا.

ئەم گروپە ناوسراوە بە دژایەتی کردنی ئیسلامو موسڵمانان، هەروەها بە یارمەتیدانی نەصارا داخ لە دڵەکان و یەك هەڵوێستی لەگەڵ تەتەرە تێکدەرکان، هەروەها ناسراون بەڕەتکردنەوەو تەحریف کردنی ناوە پیرۆزەکانی خواو ئایەتەکانیو لادانی فەرمایشتی خواو فەرمایشتی پێغەمبەرەکەی لە شوێنی خۆی، ئێستاش وا لە خوارەوە وەلامی شَیخُ الإسلام دەخەینە ڕوو سەبارەت بە پرسیارێك، کە لێی کرا دەربارەی نوصەیریەکان، شَیخُ الإسلام وتی: سوپاس بۆ خوای فرەجیهان، ئەو گروپەی ناونراون بە نوصەیریە و لەگەڵ

چینی قەرامیتە باطنیەکان ئەوانە زۆر کافرترن لەجولەکەو فەلەکان، بەڵکو زۆر کافرترن لە زۆربەی موشریکەکانو، زەرەریشیان لەسەر ئوممەتی موحەممەد صلی الله علیە وسلم زۆرگەورەتر و ترسناکترە لە زەرەری کافرە شەڕکەرەکان، وەك تەتەرە کافرەکان و فەلەکان و جگە لەوانەش، چونکە ئەوانە لەلای موسوڵمانە نەفامەکان خۆیان بەلایەن گرو خۆشەویستی ئەهل و بەیت نیشان دەدەن ، کە لەڕاستیدا نەباوەڕیان بەخواو نە بە پێغەمبەرو نە بەکتیابەکەی نیە، هەروەها باوەڕیان نیە بە ئەمرو نەهی و بەپاداشت و سزاو بەهەشتو ئاگرو نە بەیەکێك لەو موسوڵمانانەی پێش ئوممەتی موحەممەد نیە، بەڵکو ئەوانە بە درۆو بوختان وتەی خواو پێغەمبەرەکەی دەگۆڕنو لادەدەن بە بەهانەی ئەوەی ئەوە عیلمی باطینەو، کە لەوەش هیچ سنورێکیان نیە لە لای ڕاوەستن لە ڕەتکردنەوەی ناوو ئایەتە پیرۆزەکانی خواو لادانی وتەی پێغەمبەرەکەی لە شوێنی خۆی، پاشان فەرمویەتی: زانراویشە لە لای ئێمە، کە فەلەکان بە یارمەتی نوصەیریەکان توانیان کەنارەکانی شام داگیری بکەن، ئەوانە هەردەم لەگەڵ دوژمنی موسوڵماناندا دۆستن و یارمەتیان دەدەنو، هەردەمیش لەگەڵ فەلەکانن دژی موسوڵمانەکانن و، یەکێك لە هەرە چورتمە[1] گەورەکانیشیان سەرکەوتنی موسوڵمانانە بەسەر تەتەرەکانداو، خۆشترین چەژنیشیان ئەوەیە کاتێك فەلەکان زاڵ دەبن بەسەر زەوی موسوڵماناندا..کاتێك ئەو دوژمنانەی خواو پێغەمبەر ژمارەیان زۆر بوو لەسەر کەنارەکان ئەوا فەلەکان توانیان بەسەر ئەو کەنارانە زاڵ بن، پاشان هەر بەهۆی ئەوان توانیان زاڵ بن بەسەر قودسی پیرۆز و چەند شوێنێکی تر، پاشان، کە خوای گەورە کاروباری موسوڵمانە موجاهیدەکانی ڕێك خست بە هۆیی کەڵە پیاوانی وەك: نورالدین الشهید و صلاح الدین الأیوبیو شوێن کەوتوەکانیان ئەوا توانیان کەنارەکان ڕزگار بکەنو زەوی میسریش بسەنننەوەو ڕزگاری بکەن لەژێر چەپۆکی نوصەیریەکان پاش ئەوەی دووسەد ساڵ لەژێر دەستیان بوو،جا ئەوان لەدژی موسوڵمانان لەگەڵ فەلەکان ڕێککەوتن، بەڵام موسوڵمانان کۆڵنەدەرانە بەرەو ڕوویان وەستان و جیهادیان لەگەڵ کردن هەتا فەتحیان کردو ڕزگاریان کرد... پاشان

---

[1] ـ چورتم واتە: المصیبة والبلاء.

تەتەرەکان هەرگیز نەیان دەتوانی بێنە ناوی زەوی ئیسلام و خەلیفەی بەغداو چەند خەلیفەیەکی تر بکوژن، ئەگەر بە یارمەتی و ڕێگەخۆشکردنی ئەو نوصەیریانە نەبوایە... ئەو نوصەیریانە لەلای موسوڵمانان بەچەند نازناوو ناوێك ناسراون وەك (الباطنية) و(الإسماعيلية) و(الخرمية) (المحمرة).

ئەو ناوانە جاری وا هەیە هەمووی دەیانگرێتەوە، جاری واش هەیە بە یەك چینیان دەوترێ: گومانی تێدانیە، کە جیهاد کردن لەگەڵ ئەوانەو دەرکردنی حەد لێیان لە هەرە کردەوە باشەکان و واجبە گەورەکانە، جیهاد کردن لەگەڵ ئەوانە باشترە لەجیهاد کردن لەگەڵ ئەوانەی، کە موشریکن و ئەهلی کتابن ، بەڵام شەڕ لەگەڵ موسوڵمانان ناکەن، جیهاد کردن لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە دەچێتە نێو جیهادی(مرتدین))، ئەبوبەکر و تێکڕای هاوەڵە بەڕێزەکان پێش ئەوەی جیهاد لەگەڵ کافرەکانی ئەهلی کیتاب بکەن جیهادیان لەگەڵ(المرتدين) کرد، چونکە زەرەری ئەوانە زۆر زۆر زیاترو دژواترە لە وانیتر، پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێکیش بەوکارە هەڵبستێ ئەوەندەی لە توانایدایە و بەهیچ شێوەیەکیش دروست نیە کەسێك بیان ناسێ پاشان باسیان نەکاو بیشارێتەوە، بەڵکو دەبێ بڵاوی بکاتەوەو، ئاشکرای بکات، بۆ ئەوەی موسوڵمانان حەقیقەتی حالیان بزانن و دروستیش نیە بۆ هیچ کەسێك بێدەنگ بێت لەمەڕ ئاشکرا کردنی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ لەسەریان... ئەوەی لە موسوڵمانیش لە شەڕی ئەوانە کەم بکاتەوە یان ببێتە مایەی هیدایەتیان ئەوەندەی لە توانای دایە ئەوا هەر خوا دەزانێ چەندو ئەجرو پاداشتی جنگ دەکەوێ.[1]

ئەم گروپە پیس و نەگریسە لە سەردەمی ئەمڕۆدا ناویان لە خۆناوە(العلويين) ئەم گروپە لەماوەی داگیرکاری فەڕەنسی بۆ وڵاتانی شام یەك هەڵوێست بوون لەگەڵ فەلە داخ لە دڵەکان‌و یارمەتی دەریان بوون بەجۆرێك ئیستعماری فەڕەنسی لە سوریا نەچوە دەرێ هەتاوەکو ئەوانەی پێگرو قایم نەکرد، کاتێك کاروباری وڵاتیان کەوتە دەست بەجۆرێك تۆڵەیان سەندەوە لە ئەهلی سوننە، کە کاریگەری دیمەنەکان‌و ترسناکیان سەری منداڵی

---

١ ـ مجموع الفتاوى لشيخ الإسلام إبن تيمية ب٣٠/ ١٤٩ـ ١٥٠.

سپی دەکردوو، هەموو خاوەن زگێکیش زگەکەی خۆی دادەنا لە دڕندایەتی کوشتن و سزاو ئەشکەنجەیان و هەتکردنی شەرەفی ئافرەتە داوێن پاکەکانی ئەهلی سوننەو بەندکردنیان لەگەڵ پیاوەکان لە بەندیخانەکان، بەردەوامیش ئەوانە وا حوکمی پایتەختی وڵاتی شام دەکەن، داوا لە خوای گەورە دەکەین چەندی زووە کۆتاییان پێ بێنێت و ئەهلی دین و شەریعەتەکەی پێ قایم و جێگیر بکات.

ئێستاش ئەوانە لە سوریا لە لای چیای لاذقیە بەربڵاونو بە زۆری لەشاری حەما و حیمصدا جێگیر بوبینە، لەتورکیاش لە لیوای ئەسنکەندەریەو طە رطوس و ئەدەنەو هەندێکیشیان لە کوردستاندا دەژین.[1]

## هەندێك لەو بیروباوەڕە گەندانەی هەیانە ئەمانەن:

١ـ بەخوا کردنی پێشەوا عەلی کوڕی أبی طالیب، کەوا گومان دەبەن لە هەورەکان نیشتەجێیەو، گەوارەش دەنگە کەیەتیو، بروسکیش پێکەنینیەتی، لەبەر ئەمە زۆر ڕێزی هەور دەگرنو بەگەورەی دادەنێن، هەندێکیشیان بیروباوەڕی وایە، کە لە ڕۆژو مانگدا نیشتەجێیە.

٢ـ تناسخ الأرواح بیروباوەڕێکە لە عەقیدەکەیان، دەڵێن: ئەوانەی عەلی ناپەرستن سەر لەنوێ لەسەر شێوەی وشترو کەر لەدایك دەبنەوە ، بەڵام ئەو باوەڕدارانەی عەلی دەپەرستن، ئەوا لای ئەوان حەوت جار گۆڕانکاری بەسەردا دێت، پاشان جێگایی خۆی لە نێو ئەستێرەکان دەکاتەوە، ئەوەی لە لای ئەوانیش لاڕێ بێت[2]، ئەوا سەر لەنوێ لە دایك دەبێتەوە، بۆ ئەوەی پاك ببێتەوەو کەفارەتی گوناهەکانی بدات.[3]

بگرە شتی تریش لە عەقیدە گەندو پیسەکانیان.

چەند چەژنێکیان هەیە بۆ ڕابوردان، کە تیادا ئارەق پێشکەش دەکەن و گوناهی گەورەی لە نێویدا ئەنجام دەدەن ، ئەو چەژنانەش چەژنی(غطاس) و(بربارا)ن، کە دوو چەژنی

---

١ـ بروانە: کتێبی الموجز في الأديان والمذاهب، لناصر العقل و القفاري.

٢ـ لاڕێ: واتە: منحرف.

٣ـ بروانە: کتێبی الموجز في الأديان والمذاهب، لناصر العقل و القفاري لا ١٣٨.

فەلەکانن، لەگەڵ (نیرۆز)[1]، کە چەژنی مەجوسەکانە[2]، ئەم دیندارییە گەندەش بە یەکێك لە نهێنیەکانیەکانی خۆیان دەزانن، واش دەڕواننە ئافرەتەکانیان، کە هیچ ئاینێکیان نیە، چونکە وا سەیریان دەکەن ، کە کەم هۆش و بیرنو ناتوانن نهێنیەکان بپارێزن، پیاویش ئاشنا نابێت بە نهێنیەکانی ئاینەکەی هەتا تەمەنی نەگاتە نۆزدە ساڵ، ئەو کات لە چەند کۆڕێکی تایبەتدا و لە نێو چەند کاریگەریەکی زۆر و تۆقاندنێکی هزری و چەند نەریتێکی ئاینی سەیر جۆش دەکرێ بە عەقیدەی نوصەیری ، درێژەی ئەم باسەش هەموو دەدۆزییەوە لە کتێبی (الباروکة السلیمانیة)، کە هی (سلیمان الأردني)یە کە پێشتر نوصەیری بوو دواتر هەڵگەڕایەوەو بوو بە نەصرانیو ئەم کتێبەی دانا خزم کەسانیشی هەر لە دوای گەران هەتا دەستیان گەیشتێو بە خراپترین شێوە بە زیندوی سوتاندیان.[3]

ئەوەی شایەنە ئاگادار بین لێی ئەوەیە، کە دەوڵەتە نەصرانیەکان وەك ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنساو ئیسرائیل هتد... هەوڵدەدەن بەو خەنجەرە ژەهراویانە تانەو تەشەر لەم ئوممەتە بدەن و لەکەداری بکەن بەوەی ئەوانە بە هێز بکەن و لەگەڵیان بن هەتا دەیانگەیەننە سەر حوکم، چونکە وادەزانن ئەمە باشترین ڕێگایە بۆ لاوازکردنی ئوممەتی ئیسلام﴿وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ الأنفال: ٣٠

**دووەم : شیعەی دوانزە ئیمام** :ئەمانە چەند ناوێکی تریشیان هەیە لەناو خەڵکی پێی ناسراون لە وانە الإمامیة ، چونکە ئەوانە إمامة بە دەقی ئاشکراو دەست نیشان کردنێکی ڕاست بەواجب دادەنێن، خاوەنی کتێبی أعیان الشیعة وتویەتی: ئەو ناوە تانەو تەشەرێکە ئەو کەسانە بەکاری دێنن، کە عەلی پێش دەخەن بۆ خیلافەتو زیاتریش بەکار دێت بۆ دڵ خۆشکردن و تۆڵەسەندنەوە.[4]

بەڵام کولەینی شیعە لەکتێبەکەی بەناوی کافي کە کتێبێکی سەرەکیە لە مەزهەبەکەیان، بەڵکو گرنگترین و باشترین کتێبە لە لایان بە جۆرێك دەیهێننە ریزی صحیح البخاري لە لای

---

١ـ نیروز: واتة: نەورۆز

٢ـ سەرچاوەی پێشو ل١٣٩ .

٣ـ بڕوانە: کتێبی الموجز في الأدیان والمذاهب، لناصر العقل و القفاري ل ١٣٧.

٤ـ أعیان الشیعة لمحسن الأمین: ب١ ل٢٠.

ئەهلی سوننە، چەند ڕیوایەتێکی زۆر دێنێتەوە، کە ئەوان ڕازینە بەو ناوو نازناوە، کە بەمەش درۆ بەرامبەر خوا دەکەن و بوختان دروست دەکەنو دەڵێن: خودا ناوی ڕەوافضی لێ داماڵینە[1] ئەوانە بە بەدو دزێو ناوبانگانیان دەرکردوەو هیچ گوێ نادەنە ئەوەی درۆو بوختان بەخواو بەدورستکراوەکانی بکەن.

لەو ناوانەی، کەوا ناوبانگیان پێدەرکردوە الإثنا عشرية چونکە بیروباوەڕیان وایە، کە دوانزە ئیمام هەنە، کە لە خوارەوە بەریز دەیاننووسین:

١ـ أبو الحسن على بن أبى طالب ( ت ٤٠هـ )

٢ـ الحسن بن على بن أبى طالب( ت ٥٠ هـ )

٣ـ الحسين بن على بن أبى طالب( ت ٦١ هـ )

٤ـ على بن زين العابدين بن الحسن بن علي( ت ٩٥ هـ )

٥ـ محمد الباقر بن على( ت ١١٤ هـ )

٦ـ جعفر الصادق بن محمد( ت ١٤٨هـ )

٧ـ موسى الكاظم بن جعفر( ت ١٨٣هـ )

٨ـ على بن موسى الرضا( ت ٢٠٣هـ )

٩ـ أبو جعفر بن على( الجواد )( ت ٢٢٠هـ )

١٠ـ أبو الحسن على بن محمد( الهادي )( ت ٢٥٤ ت )

١١ـ أبو محمد الحسن بن على( العسكري )( ت ٢٦٠هـ )

١٢ـ أبو القاسم محمد بن الحسن( المهدي )( ت٢٥٦هـ )[2]

ئا ئەوانە ئەو دوانزە ئیمامەن لە لای شیعە ئیمامیەکان، ئەو شیعە دوانزە ئیمامیانە هەندێك بیروباوەڕیان بەرامبەر بەو ئیمامانە هەیە، کە هەمووی زیادەڕۆییە و هەر خۆیان دایاننـاوەو خـودای گـەورە داینەبەزانـدوە، یـەکێك لـەو بیروباوەڕانـەی هەیانـە بەرامبـەر ئیمامەکانیان ئەوەیە، کە ئەو ئیمامانە هەر لە تەمەنی منداڵیەوە هەتا دەمرن پاکن و دوورن لە هەموو خراپ و بەدڕەوشتیەکی ئاشکراو نادیار ، جا چ بە ئەنقەست بێ یان بەبێ ئاگایی، هەروەکو واجبیشە دووربن و پاك بن لە هەڵەو لەبیرچوون، چونکە ئیمامەکان

---

١ـ الفروع الكافي ب٨/ لا ٢٨١) حديث رقم ٦ من كتاب الروضة

٢ـ بروانە: بیروباوەڕی ئیمامیەکان محمد رضا مظفر لا(٦٢ـ ٦٢)

پـارێزەری شـەرعن و شـەرع بـەوان ڕاوەسـتاوەو لـەم کـارەدا حالیـان وەك پێغەمبـەری خوایە ﷺ.[1]

ئەوانـە ئیمامـەکانیان بەهەنـدێك وەسـف نـاوبردوە، کـە لـە مـەنقول و مـەعقول تێیـان پەڕاندوەو لایان داوە، جا وەك نمونەیەك دەیهێنینەوە، کە کُلَیْني لـە کتێبەکـەی بـە نـاوی الکافی ، کە لای ئەوان ناو زەند دەکرێت بە أصول الکافی چەندە کۆباسێکی داناوە، کە پێك هاتووە لە چەند فەرموودەیەك کە بەدرۆو بوختان هەڵیان بەستووە لە سەر زێدە ڕۆیی لـە ئیمامەکانیان.

جا هەندێك لە ناونیشانی ئەو کۆباسانە ئەمانەی خوارەوەیە:

(باسێك لەبارەی ئیمامەکان، کە کار بەدەستی خوانـەو خەزێنـەی زانسـتی ئـەون)[2]( باسـێك لـەبارەی ئیمامـەکان کۆڵەگـەی زەویـن)[3]( باسـێك لـەبارەی ئیمامـەکان، کـە هـەموو ئـەو کتێبانەی لە لایـەن خـوا هاتونەتـە خـوار لـە لای ئەوانـە هەیـەو دەیـزانن بـە پێـی جیـاوازی بەڵگەکانیان)[4] (باسێك سەبارەت بە قورئان، کە هەر ئیمامەکان کۆیان کردۆتەوە)[5] (باسـێك سەبارەت بـەوەی ئیمامـەکان هـەموو عیلمـەکان دەزانـن، کـە لـە فریشـتەو پێغەمبـەر ﷺ و پەمامبەرەکانەوە دەرچوە)[6] (باسێك سەبارەت بـەوەی ئیمامـەکان دەزانـن کـەی دەمـرن و ناشمرن تـەنها بە سەرپشکرنی خۆیان نەبێ)[7] (باسێك سەبارەت بـەوەی ئیمامـەکان ئـەوەی ڕووی داوەو ڕوی نـەداوە دەیـزانن و هـیچ شـتێك لـەوان نادیـار نیـە)[8]( (باسـێك سـەبارەت بەوەی، کـە خـوای گـەورە پێغەمبەرەکـەی فێـرە هـەر عیلمێك کردبێ ئەمریشـی بـە أمـیر

---

١ـ عقائدالإمامية محمد رضا مظفر لا(٥١)

٢ـ الكافي(ب١/١٩٢)

٣ـ الكافي(ب١/٢٢٧)

٤ـ الكافي(ب١/٢٢٨)

٥ـ الكافي(ب١/٢٥٥)

٦ـ الكافي(ب١/٢٥٨)

٧ـ الكافي(ب١/٢٦٠)

٨ـ الكافي(ب١/٢٦٣)

المؤمنين يش كرديه ڕاپبگەینێ و ئەویش هاوبەشیەتی لە عیلم)[1](باسێك سەبارەت بەوەی، کە ئیمامەکان ئەگەر شتێکیان لێ بشارییەوە پێت دەڵێن، کە چی بۆ هەیەو چی لەسەرە )[2](باسێك سەبارەت بەوەی ئیمام دەزانێ ئەو ئیمامەی لە دوای دێ کێیە )[3](باسێك سەبارەت بەوەی، کە ئەگەر ئیمامەکان بە دەرکەوتن ئەوا بەحوکمی داود و شوێن کەوتوانی داود حوکم دەکەن و داوای ڕوون کردنەوەش ناکەن)[4]( (باسێك سەبارەت بەوەی، کە ئەو هەقەی لە لای خەڵکیە ئەوا سەرچاوەکەی هی ئیمامەکانەو هەرشتێکیش لە لای ئەوانەوە سەرچاوە نەگرێ ئەوا پوچ و ناڕەوایە).[5]

ئا بەم شێوەیە خوێنەری سەنگینم زیادەڕۆیی بێ سوود دەبینیەوە لە لای زانایانی شیعەی دوانزەئیمام، ئەگەر بگەڕێیەوە بۆ کتێبی(مرآة العقول للمجلسي) دەبینی، کە کەوتۆتە ناو زەلکاوێکی لێڵ و ناسازگار، کە گومانی بردووە عیصمەتی ئیمامەکان لە سەرووی عیصمەتی پێغەمبەرانە، چونکە ئەوان پلەیان بەرزترە[6]، سەبارەت بە ئیمامی هاوچەرخ و مەرجەعی گەورەیان و ئایەتی گەورەیان، کە بەسەرکردەی شۆڕشی ئێرانی ناسراوە ئەوا تۆزێك پێویستی بە ڕۆنکردنەوەو ئاشکرا کردن هەیە، چونکە کارەکە لەلایەن گەنجانی ئەهلی سوننە تێکەڵ بە یەکتری بووە، بەڵکو هەتا بانگخوازەکانیش و هەندێك لە زانایانیش ئەوانەی هەڵخەڵەتاون بە چەند دروشمێکی شیعەی درەوشاوە بۆ کەسب کردنی ئەهلی سوننە، کە هیچ گوێ نادەنە ئەو بەڵێنو پەیمانانەی ، کە خۆیان بەستویانە، بەڵکو لە ئێران غەدریان لێکردن و کوشتنیان و بەندیان کردن و ماڵەکانیان ڕوخاندن، ئەگەر بێتو بگەڕێیەوە بۆ کتێبی(وجاء دور المجوس)[7] ئەوا شتی سەیرو سەمەرەو نامۆ دەبینیت لە کردەوە نگریسو بەدەکانیان، ئەو کتێبە بەشێوەیەکی زۆر بەر فراوان و باش وەسفی

---

١ـ الكافي(ب١/٢٦٤)

٢ـ الكافي(ب١/٢٧٦)

٣ـ الكافي(ب١/٢٩٧)

٤ـ الكافي(ب١/٢٩٩)

٥ـ بڕوانە: کتێبی(مرآة العقول)ی(مجلسي) بەرگی دووەم لا ٢٨٩

٦ـ بڕوانە: کتێبی(مرآة العقول)ی(مجلسي) بەرگی دووەم لا ٢٨٩

٧ـ ناوی دانەرەکەی(عبدالله محمد الغريب)

کردینــە و ئـابڕوی بردینــەو ئـەو هۆکارانــەی ڕوون کردۆتــەوە، کـە خۆیـان پێدەشـاردنەوە، هەروەها باسی ئەو پەیوەندیە بەهێزەدەکات لەگەڵ سـەرجەم گروپـەکانی تـری شـیعە، کـە چۆن یارمەتیان دەدەن و شان بەشان لەگەڵیان ڕادەوەستن لە دژی ئەهلی سوننە.

بەڕاستی شیعەی دوانزە ئیمام ڕێزیان لـە عـەقڵ نـەگرتووەو هـیچ شـەرعێکیان بـە پـیرۆز دانەناوەو پابەند نەبووینە بەهیچ نەقڵێك و هیچ ڕێزێکیشیان دانەناوە بۆ زانـاو شـێخەکانیان بە پێچەوانەی ئەهلی سوننە، کە زۆر ڕێزی ئیمامەکانی خۆیان گرتـووەو لـە شـوێنی شیاوی خۆیانیان داناون ، جا لێرەدا زۆر سەرسامم بە وتەی پێشەوا ذهـبي ڕەحمـەتی خـوای لێبـێ کە باسی بیروباوەڕی ئـەهلی سـوننە دەکـاتو لـە بارەیانـەوە دەڵـێ: گـەورەمان عـەلی لـەو خەلیفە ڕاشیدیانەیە، کە مژدەی بەهەشتی پێداوەو زۆر خۆشمان دەوێت و ناشلێین: نە ئەو نە ئەبوبـەکر مەعصـومن ، کوڕەکانیشـی حەسـەن و حوسـێن کچـەزای پێغەمبـەری خوانـەو گەورەی گەنجانی ئەهلی بەهشتن، ئەگەر بووبانە خەلیفە ئەوا ئەهل بوون شایستە بوون.

زیـن العابـدینیش زۆر بـەڕێزەو یەکێکـە لـە زانـا هەرەباشـەکانو ئیمامەتیشـی پێـدەکراو شایستەی بوو ، هەروەها کوڕەکەی جعفر الباقر پێشەوا بووەو فەقیهێکی زیرەك بـووەو بـۆ ئیمامەت شایەن بووە.

هەروەها کوڕەکەی جعفر الصادق یەکێکە لـە زانایـە پایـە بـەرزەکان و لـە پێشـتر بووە بـۆ ئیمامەت لە ئەبو جعفر المنصور، کوڕەکەشی موسا زۆر پایـەدار بـووەو زۆر زانـا بـووەو لـە پێشتر بووە بۆ خیلافەت لە هارون الرشیدو ئیدیکەی وەکو ئەوانەش هەبووینـە وەك ئەوانـە بەقەدر وڕێز خانەدان.

کوڕەکەشی موسی الرضـا زۆر پایـەدارو زانایـەکی گـەورەو قسـەکانی زۆر جێگـایی خـۆی کردۆتەوە لە دەروونی خەڵکیدا ، مأمون لە بەرگەورەیی ئەم کەڵە پیاوە کردیە وەلی عەهدی خۆی، لە ساڵی (٢٠٣)ی کۆچی وەفاتی کردوە.

کوڕەکەشی، کە ناسراوە بە الهادی قەدر گران و خانەدان بووە.

هەروەها کوڕەکەشی حەسەن بن علی العسکری رحمهم الله تعالی.[1]

---

١ـ سیر أعلام النبلاء ب١٣/ ١٢٠ـ ١٢١

سەبارەت  بە ئیمامی دانزەهەمینیش وتویەتی: ئەو محمد مەهدیەی، کە گومان دەبەن خەلەفەو حوجەیەو خاوەنی ڕۆژگارەو خاوەنی سیردابە لە سامەڕا، کە زیندوەو نامرێ هەتا دەرنەچێ، کە دەریشچوو زەوی پڕ دادگەری دەکات، هەر وەك، کە پێشتر  پڕ زوڵم و ستەم بووبو، ئێمەش سوێند بەخوا ئەوەمان پێ خۆشە، ئەوە(٤٧٠)ساڵە[1] چاوەڕیی دەکەین‌و وتراشە، کە ئەوەی ڕەوانەی لای نادیارێکت بکات مونصیف نەبوە لەگەڵت چ جای ئەوەی ڕەوانەی لای شتێکی ئەستەمت بکات! ئینصافیش شتێکە دەگمەنە پەنا بەخوا لە نەفامی و هورێنە.[2]

## بەردەوام بوونی شیعەی دوانزە ئیمام لەم سەدەیەدا

### ئیمامی شیعی لەم سەردەمەداو ئەو دەوڵەتەی بنیاتی ناوە:

جیهانی ئیسلامی تەفاعولی کرد لەگەڵ تەزوی شیعەگەرایەتی پاش ئەوەی، کە گەیشتە دەسەلاَت لە ئێران و نیزامی شای ڕووخاند.... دەزگاکانی ڕاگەیاندنی شیعەی دوانزەئیمام توانیان خەڵکێکی زۆر لە موسڵمانان هەڵبخەڵێتن لە تەرحی ئەمڕۆیاندا، لەمەشدا دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاواش پشتی گرت و یارمەتی دا، خومەینی توانی زۆر لێزانانە ڕۆڵێکی فێڵاوی بنوێنێ، لێرەدا چەند نوسەرو ڕۆژنامەنوس و بانگخوازێك ئەوانەی لە سەر ئەهلی سوننە حیسابن لایەن گیری خومەینیان کردو سۆزیان بۆ جولاَو وەسفیشیان کرد بەوەی، کە وەك شیخ الإسلام إبن تیمیەو محمد بن عبدالوهاب و عبدالحمید بادیس و محمد بن علی السنوسی و حسن البنا موجەددیدوەو چاکسازە.

ئەم ڕاپۆرت و نوسراوەش کەوتنە زاکیرەی مێژوو بووە هۆیەکیش بۆ بە فیرۆدانی زۆر حەقیقەت بۆ چەند سەدەیەکی موسڵمانان بۆیە وام بینی و وام بەباش زانی وەکو ئامۆژگاریەك بۆ ئوممەت و نەوەکانی ڕوونی بکەمەوە، کە خومەینی درێژە پێدەری قوتابخانەی  شیعەی دوانزە ئیمامیە، کە خاوەن بیروباوەڕێکی گەندەو لاڕێیە لە ڕێبازی خودا، بەناو شۆڕشە ئیسلامیەکەی و کۆمارە ئیسلامیەکەی تەنها خەنجەرێکی ژەهراویە

١ـ مەبەست ڕۆژگاری ئیمامی زەهەبیە، کە تێیدا ژیاوە، لەساڵی (٧٤٨)ی کۆچی وەفاتی کردوە.

٢ـ سیر أعلام النبلاء(ب٣/ ١٢٠)

هێناویەتی بدات لە هەر هەوڵدانێك بیەوێ بەدڵسۆزی تەتبیقی شەریعەتی خوا بکات، بەڵکو جیهان ئەو کارەی بۆ شۆڕشی ئیسلامی ڕەخساند بۆ ئەوەی وێنەی ئیسلامی ساف وبێگەرد بشێوێنێ ئەوەی، کە پێغەمبەرﷺ هێناویەتی.

بەو پێیەی، کە دەوڵەتی ئێرانی سەری هەڵدا لە جیهانی ئیسلامی و بیروباوەڕە گەندو پیسەکەی خۆی لە ئەفریقیاو ئاسیاو کۆمارەکانی سەر بە إتحادالسوفیتی و باکوری ئەفریقی و ئەوروپاو ئوستڕالیا و ئەمریکا بڵاوکردەوەو زۆریش لە خەڵکی ڕەش و ڕوتی موسڵمانان ئەوانەی تێگەیشتن و زانستێکی ئەوتۆیان نیەو باش لە حەقیقەتی ئەمری خۆیان ورد نەبوینەوە، ئەوا کاریگەربوون بەم بانگەشەیە بۆیە بەباشم زانی بیروباوەڕی قدیس خومەینی و ئەوەی لە دوای هاتوون ڕوون بکەمەوە بۆ ئەوەی نەوەکان ئاگادار بکەینەوە لەو قوتابخانە شەیتانییەی، کە بونیاتی ئوممەتی گۆڕیو پوکاندیەوەو، بەردەوامیش و بەبێ ماندوبوون درێژە دەدا بەم کارە بەدو نەگریسە.

لەو بیروباوەڕە گەندانەی، کە ئیمامی خومەینی لە کتێبەکەی الحكومة الإسلامية دا باسی کردووە ئەوەیە، کە دەڵێ: لە شتە گرنگ و پێداویستیەکانی مەزهەبی ئێمە ئەوەیە، کە ئیمامەکانمان مەقام و پلەو پایەیەکیان هەیە کە هیچ فریشتەیەکی نزیك و هیچ پێغەمبەرێکی خاوەن پەیام نایگاتێ.[1]

ئەمە دان پیانانێکی ڕوون و ئاشکرایە لەوەی شیعەی دوانزە ئیمام ئیمامەکان گەورەترو بەڕێزتر دەگرێ لە پێغەمبەرەکان، ئەمەش کە مەزهەبی غولاتی ڕەوافیزەکانە لە حوکم دان بەسەر گەورە پیاوانی ئیمامەکانی سوننە.

عبدالظاهر البغدادي وتوویەتی: ڕەوافیزە توندڕەوەکان گومان دەبەن، کە ئیمامەکان باشترن لە پێغەمبەرەکان ئێمەش دەزانین، کە ئەمە پوچوو ناڕەوایە.[2]

قاضي عياض وتویەتی: بە پێی وتەی ڕەوافیزە توندڕەوەکان ، کە وتویانە ئیمامەکان باشترن لە پێغەمبەران ئەوا بێ گومان کافر بوونەو بە کافریان دادەنێین.[3]

---

١ـ الحكومة الإسلامية لا ٥٣.

٢ـ أصول الدين لا ٢٩٨.

٣ـ الشفاء ب١/ لا ٢٩٨.

شیخ الإسلام إبن تیمیة: وتویەتی: ڕەوافیزەکان دوانزە ئیمامەکان بە باشتر دادەنێن لە پێشینە یەکەمەکانی موهاجیر و ئەنسارەکان ،توندڕەوەکانیشیان دەڵێن: هەتا باشترن لە پێغەمبەرەکان.[1]

محمدی کوڕی عبدالوهاب وتویەتی:هەر یەکێك کەسێك بەباشتر بزانێ لە پێغەمبەرەکان یان بڵێ وەك یەکن ئەوا کافر دەبێت، ئەمەش ئیجماعی زانایانە،کە باسیان لێوە کردوە.[2]

بەڕاستی بیروباوەڕو دیدە شیعیەکەی خومەینی سەرچاوەکەی ، چەند مامۆستایەکە، کە لە پێشە خۆی بوونە و هەر ئەوان ئەو ڕێبیرە لاڕێی و گومڕاییەیان داهێناوە، ئەو کتێبی الكافي للكُلَيني و کتێبیالإحتجاج للطبرسي و جگە لە وانەش زۆر بە گەورە دادەنێ و لە کتێبەکانی زۆر بە باشە باسی حسین النوری ئاگر پەرست دەکات، کە خاوەنی کتێبی فصل الخطاب في اثبات تحريف كتاب رب الأربابە ، هەروەها دەبینی، کە کتێبێك پشت ڕاست دەکاتەوە بەناوی دعاءٌ على صَنَمِي قُرَيش کە مەبەستی ئەبوبەکر و عومەرە، هەر لە ناو ئەو کتێبە باسی ئەو دوو شێخە دەکات، کە کتێبی خوایان دەستکاری و تحریف کردوەو[3]چەند تەفسیرێکی باطینیش دەکات بۆ چەند ئایەتێك لەوانە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾ (النساء: ٥٨) دەڵێت: خوای گەورە فەرمان بە پێغەمەرەکەی دەکات، کە ئیمامەت بگەڕێنێتەوە بۆ ئەهلی خۆی، کە مەبەستیان عەلییەو، ئەویش لە سەریەتی بیگەڕێنێتەوە بۆ نزیکەکانی،[4]بەڵام بیروباوەڕی سەبارەت بە هاوەڵەکان، ئەوا وەك بیروباوەڕی شیعەی دوانزە ئیمامیە ، کە هیچ شیعەیەك ویلایەتی نیە، ئەگەر ڕقی لە دوژمنەکانی نەبێتەوە، وەك ئەبوبەکر وعەمەرو ئەوانەی بەچاکەش شوێنیان کەوتوون هەتا ڕۆژی دوایی.

خومەینی وتویەتی: دەبێ پشت لەو پیاوانە بکەن و حاشایان لێ بکەن و لە بری ئەمانەش ڕوو بکەنە دوانزە ئیمامەکە هەتا بەجۆرێك خومەینی بە ڕەوای دەبینێ، کە

---

١ـ مناهج السنة ب١/لا ١٧٧.

٢ـ الرّد على الرافضة ب١/ ٢٩.

٣ـ مسألة التقريب بين أهل السنة والشيعة ب٢ لا ٢٣٧.

٤ـ مسألة التقريب بين أهل السنة والشيعة ب٢ لا ٢٣٧. لەو بەشە زۆر سودم لەو کتێبە وەرگرتووە.

نوێژکەر لە کڕنوشەکەی بڵێت: الإسلام ديني، ومحمد نبي، وعلي والحسن والحسين ــ کە هەژمارەیان دەکات هەتا دوایی ـ أئمتي بهم أتولى ومِن أعدائهم أتَّبَرأ.[1]

هەروەها تانەو تەشەر لە هاوەڵەکانیش دەدات، چونکە وا گومان دەبەن ئەوان پێچەوانەی ئەو ئایەتەیان کردوە، کە باسی ئیمامەتی عەلی دەکات و دەڵێت: پێغەمبەرﷺ لەحەجی ماڵ ئاوایی لە شوێنێك بەناوی غەدیرخەم عەلی دەست نیشان کرد وەك حاکمێك لە دوای خۆی ، هەر لەو کاتەوە دووبەرەکی درەی کردە نێو هاوەڵەکان.[2]

کتێبەکەی خومەینی، کە ناوی الحكومة الإسلامية یەو هی تریشی پڕە لە لاڕێبوون لە ڕێگای ڕاست، چونکە خومەینی بیروباوەڕەکەی وەك بیروباوەڕەی ڕەوافیزەکانە ئەگەر توندتریش نەبێ، خومەینی پێش وەفات کردنی کاری دەکرد بۆ ئەوەی بەزۆر شیعەگەری بەسەر گەلەکەی بسەپێنێو دەوڵەتەکەشی هەڵسان شۆڕشەکەیان هەناردە کرد، لەمەدا شیعەکان زۆر پشتیان بەمراوەغەو درۆو هەڵخەڵەتاندن بەست، ئەو شیعە مۆدێرنانە هیچ جیاوازیەکیان نیە لەگەڵ شیعەکانی دوێنێ لەمەڕ مراوەغەو فرت و فێڵ و زیادەڕۆی.

هەروەها پشت دەبەستن بە ڕێبیری[3] توقیە بۆ کۆکردنەوەی خەڵکی لە دەوری خۆیان ئێستاش لەگەڵم بە بۆ وتەیەکی خومەینی، کە لە یەکێك لە وتارەکانی وتویەتی: خەڵکی یەك یەك لە خۆتان دوور مەکەنەوەو، تۆمەتباریان مەکەن جارێك بە وەهابی و جارێك بە کوفر، چونکە ئەگەر ئەو شێوازەتان بەکار هێنا کێ لە دەورتان دەمێنێ؟.[4]

بۆیە خومەینی فەرمانی بە حاجیە ئێرانیەکان کرد، کە لەگەڵ ئەهلی سوننەدا نوێژ بکەن، ئەمەش وەك توقیەیەك و فێڵ کردنێك لە خەڵکی، هەروەك، کە سەرکردەکانی شیعە نوێژیان لە پشت دەکردن و پاشان نوێژەکانیان دەکردەوە، ئەمەش یەکێك لە زانایانی ئەو سەردەمەی خۆیان ئاماژەی پێکردوە، کە بوغزو ڕق و قینی شیعە لەسەر موسڵمانان بەتایبەت ئەهلی سوننە گەیشتۆتە ئاستێك ، کە خوێنو ناموسیان حەلاڵ بکەن و لە

---

١ـ الخميني تحريرالوسيلة ب١ لا١٦٩.

٢ـ الحكومة الإسلامية لا ١٣١

٣ـ ڕێبیر: واتە: مبدأ

٤ـ فرق معاصرة للخواجي ب١ لا ٢٦٢.

ماڵەکانی خۆیان هەڕەشە لە ئاسایشیان بکەن، جا بۆی هەیە ئەوەی ساڵی ١٤٠٧ کۆچی کردیان گەورەترین شاهێد بێت لە سەر بوغزو کین و ڕقیان، کاتێك لە حەرەمی خوا کردیان لە نزیك مەککە نزیکەی(١٥٠) هەزار کەس خۆپیشانیان کردو هێرشیان کردە سەر ماڵی خوا، کە لەمەدا دەیانویست پیلانێکی زۆر ترسناك بهێننەدی، کە بە پیاو ژنەوە دروشم و وێنەی گەورەکەیان بەرزکردبۆوەو دەیانویست بێنە ناو حەرەم و تێکیش گیران لەگەڵ موسوڵمانان و پاسەوانەکان، کە کوشتارێکی زۆری لێ کەوەتەوە، لە حەجی ساڵی ١٤٠٩ش بە دارو دەستە بەکرێ گیراوەکانی خۆیان ڕاگەیاند بۆ ئەوەی ماددەی(متفجر) لە دەوری حەرەمی مەککی دابنێن ئەمەش لە ڕۆژی(٧)ی (ذي الحجة) بوو، کە زۆر لەو حاجیانەی هاتبوونە ئەو شوێنە پیرۆزە بۆ بەجێهێنانی حەجیان بوونە قوربانی.[1]

سەبارەت بە سزادانیشیان بۆ ئەهلی سوننە لە ئێران ئەوا عبدالله محمدالغريب لە کتێبەکەی أهل السنة في إيران جۆرەها شێوازی سزاو هەتك و کوشتنو دەست درێژی کردنە سەرناموسی باس کردوە، لێرە تەنها ئاماژە بە هەندێك لەو شێوازو سزاو کوشتنانە دەکەین، کە ئەو بەد ناوانە لە ئێران بەرامبەر ئەهلی سوننە کردویانە

١ـ بەستنەوەی پێیەکان بەگوریس ولێدانیان بە قامچی.

٢ـ بەستنەوەی دەستەکان لە دواوەو دانانی بەندکراو لە سوچێکی بەندیخانەکەو، ڕشتنی ئاو بەسەری، یان نەوت کردنە بنیەوە، ئەو شێوازەیان لەگەڵ ژمارەیەك موسوڵمانان بەکارهێناوە.

٣ـ بەستنەوەی بەندکراوو لێدانی لە شوێنی جیاجیا لە جەستەکەی بگرە لە دەقامچی تا سەدوپەنجا.... تا پانزە ڕۆژ ئەم لێدان و کوتانەیان بۆکراوە.

٤ـ بەندکراوەکەیان لە تەوێڵەی ئاژەڵان بەجێدەهێشت هەتا دەمرد.

٥ـ جۆرێکی تر لە جۆرەکانی سزادان ئەوەبوو، کە پێستی سەریان کەوردەکردو کون کونیان دەکرد لەگەڵ کون کردنی چاو بە ئامێری کونکەر، پاشان سوتاندنی بە زیندویی، هەروەها پارچە پارچەکردنی ئەندامەکانی و هەڵکێشانی نینۆنەکانیشی.[2]

---

١ـ سەرچاوەی پێشو ب ١ لا ٢٦٣

٢ـ أهل السنة في إيران لا ٥٤.

ئەمەش مشتێکە لە خەروانێك، ئەوان زۆر هاوەڵەکان دەبوغزێنن و لە قورئانیش بەگومانن و تانەو تەشەریش لە سوننە دەگرن، جا چاوەڕێی چ لەوانە بکەین؟؟!

بەڕاستی هەموو ئەو هەوڵانەی ئەنجام درا لەمەڕ نزیك بوونەوەی سوننەو شیعە پوچەڵ بوویەوە، چونکە خیلاف لە نێوان ئێمەو ئەوان لەئوصولە نەوەك فروع.

بەهیچ جۆریکیش سوننەو شیعە پێکەوە یەك ناگرن، مەگەر یەکێکیان دەست بەرداری بیروباوەڕەکەی خۆی بێت.

زانایانی شیعە حەزیان لێیە لەگەڵ ئەهلی سوننە لێك نزیك ببنەوە بە مەرجێك، ئەگەر ئەهلی سوننە جوێن بە هاوەڵەکان بدەن و بیروباوەڕە پوچەکەی ئەوان هەڵبگرن، هەر ئەمەشە، کە شیخ مصطفى السباعي لە ئەزمونەکەی لەگەڵ ئەم بابەتە لەگەڵ یەکێك لە شێخەکانی شیعە عبدالمحسن شرف الدین الموسوی گەیاندە ئەنجام، چونکە مصطفى السباعي زۆر گەرم وگوڕ بوو بۆ بیرۆکەی نزیك بوونەوەو پەیوەندی زۆر بەستا لەگەڵ سیاسەتمەدارو ئەدیب و بازرگانەکانو پەیمان و قسەی هەنگویناویان زۆر پێدا ، لە سەروی هەموانیشەوە شێخ عبدالمحسن الشیعی، کە ئەویش زۆر بە گەرمی باوەڕی بەو نزیك بوونەوەیە هەبوو، ئەو شێخ موسەویە کتێبێکی دەرهێنا لە بارەی ئەبوهوریرە، کە پڕبوو لە جنێودان هەتا ئەوەی تێدابوو، کە ئەبوهوریرە دوو ڕوویەکی کافربووەو، پێغەمبەریش هەواڵی داوە، کە یەکێکە لە ئەهلی ئاگر.[1]

مصطفى السباعي دەڵێت: سەیرم بە هەڵوێستی عبدالمحسن هات لە بارەی قسەکەی و کتێبەکەی، کە ئەمە هەڵوێستێکە بەڵگە نادا لەسەر حەزلێبوون لە نزیك بوونەوەو لە بیرکردنی ڕابردوو.[2]

ئامانجی شیعەش لە مەسەلەی نزیك بوونەوە ئەوەیە، کە هەڵیان بۆ بڕەخسێ بۆ ئەوەی لە زەوی سوننیەکان بیروباوەڕیان بڵاوبکەنەوەو ، بەردەوامیش بن لە تانەو جنێودان بە هاوەڵان و ئەهلی سوننەش بێدەنگ بن لە ڕوون کردنەوەی حەق، ئەگەریش ڕەوافیزەکان

---

١ـ السنة ومكانتها في التشريع للسُّباعي لا ٩.

٢ـ سەرچاوەی پێشو لا ١٠

گوێیان له دەنگی حەقیش بوو ئەوا توڕە دەبن و بەدەمی خۆیان هاوار دەکەن، کە یەك ڕیزی ئیسلامی له مەترسی دایە.

### ئەزمونی شێخ موسی جارالله:

موسی جارالله خەڵکی تورکستانە قازانیەو ڕوسیە، یەکێکە لە هەرە شێخە گەورەکانی روسیا، ئەمەش لە کۆتایی عەهدی قەیسەری و سەرەتای حوکمی سۆڤییەتی بێ باوەڕ، لە ڕوسیا خاوەنی وشەی سەرەتاو کۆتابوو لە کاروباری موسڵمانان ، کە ژمارەیان زیاتر لە سی ملیۆن کەسە، پاشان گەردەلولی شوعیەت هەڵی کوتایە سەریان‌و بەهۆیەوە لە وڵاتی خۆی دوورکەوتەوە ، زۆر نووسین و کتێبی هەیەو زۆر لە نێوان هیندو حیجازو میسرو عێراق و ئێران هاتوو چۆی کردوە، بەخۆی لە بارەی خۆی دەڵێ: ئەگەر دەست بەرداری باوەڕەکەم بوویام دەم توانی ببمە نوسەری ڕوسیای یەکەم و ببمە یەکێك لەسەرکردەکانی، ، بەڵام من بە دونیا ئاخیرەتی خۆم کڕی..[1]

ئەو زانا بەڕێزو بەحورمەتە شارەزایەکی زۆری هەبوو لە زمانی فارسی و تورکی وتەتەری و ڕووسی و لە زمانی عەرەبیش هەر مەپرسە، چونکە شارەزای ئوصول و صەرف و نەحو بوو ڕەوانبێژیەکی قوڵ و بەرفراوانی هەبوو، ئەگەر هەر بابەتێکی زمانی عەرەبی لە پێشی باس بکرابا، ئەوا یەکسەر وەڵامی دەدایەوە، کە لە قورئاندا هەیە یان ناو چەند جاریش پێی دەگوتن هاتوەو لە فلانە سوڕەتیشە، چونکە زۆر شارەزا بوو.[2]

ئەو زانا بەڕێزە ویستی ئوممەت لەسەر یەك وشە کۆبکاتەوەو، ئەهلی سوننەو شیعەش یەك بخات،کە لەمەدا هەوڵێکی زەبەلاحی سەرف کرد، سەرەتا دەستی کرد بە دیراسەکردنی کتێبەکانی شیعە و زۆر بەگرنگیەوە موتاڵای دەکردن، هەروەك خۆی باس دەکات، کە موتاڵای(أصول الكافي وفروعه)و (من لا يحضر الفقيه) و (وافي) و (مرآة العقول) و (بحار الأنوار) و (غاية المرام) و چەند کتێبێکی تری زۆریش جگە لەم کتێبانە[3]

---

١ـ مسألة التقريب بين السنة والشيعة ب٢ لا ٢٠١

٢ـ مجلة المجمع العلمي العربي ب٤ لا ٢٦٦.

٣ ـ مسألة التقريب بين السنة والشيعة ب٢ لا ٢٠١

پاشان سەردانی شوێنە شیعەکانی کردوەو زیاتر لە حەوت مانگ تیادا ماوەتەوە، کە سەردانی پەرستگاو مەشاهیدەکان و قوتابخانەکان و مەحافیل و حەفەلاتەکانی کردووەو لە خۆشی و ناخۆشی لەماڵەکان و حوجرەو مزگەوتدا ئامادەی بازنەی وانەکان بووە ، ڕۆژانی(محرم)یش چوویتە نەجەف و هەموو ئەو شتانەی دیوە، کە شیعە دەیکەن وەك ماتەمێك لە ڕۆژی عاشورا.

ئەو زانا بەڕێزو بلیمەتە گەیشتە ئەنجامێکی زۆر راستو ڕەوان ئەویش کتێبەکانی شیعە هەمووی یەك ڕان لەسەر چەند شتێك، کە ئوممەت ناتوانێ بەرگەی بگرێ و ڕێکیش کەوتوونە لەسەر چەند شتێك، کە ئوممەت پێی ڕازی نیەو بەرژەوەندی ئیسلام نایخوازێ، بەڵکو زۆربەی دژی بەرژەوندیەکانی ئوممەتە، پاشان چەند شتێکی بەدو خراپیان تێدایە، کە نەدەبا لەو کتێبە شیعیانە هەبێو گومانیش ناکرێ ئەمە بیروباوەڕی ئیمامەکان بێت ، کە ئەم قسانە نە عەقڵ و نە وێژە قەبولی ناکا، پڕو پاگەندەی پێکەوە ژیانیشیان لەگەڵ ئەهلی سوننە تەنها ئاگری دوژمنایەتی بەهێز دەکات، ئێستا پێویستە لەسەر زانایە موجتەهیدەکانی شیعە ئەم جۆرە بیروباوەڕانە دەربهێنن لەو کتێبانە بۆ ئەوەی لە دڵەکان تۆوی ببڕێتەوە ، ئەگەریش وەنەکەن ئەوا قسەکانیان هەڵیت و پەلیتەو ئەو کۆنگرانەی دەیبەستن تەنها بۆ دوژمنایەتیە.

شێخ بەچاوە وردبینیەکەی و زانستە چڕو پڕەکەی وای بینی، کە ڕەخنە گرتن لە بیروباوەڕی شیعە دەستپێکی قۆناغی یەکگرتنی دڵەکانی ئوممەتە، کە بەبێ ئەمە یەکگرتن نایەتەدی.

شێخ دڵی پڕ خەفەت بوو لەو شتە خراپ و بەدانەی بەدی کرد لە کتێبەکانی شیعە، یەکەم هەوڵیش، کە سەرفی کرد لە مەسەلەی پێکەوە ژیان و نزیك بوونەوە چاوپێکەوتنی بوو لەگەڵ شێخی شیعە محسن الأمین لە تاران، کە لە نێوانیان وت وێژ کرا، پاشان شێخ موسی وەرەقەیەکی بچوکی پێش کەش کرد ، کە ئەم خاڵانەی خوارەوەی لە نێو تۆمار کرابوو.

١ـ دەبینم مزگەوتەکان لە وڵاتی شیعە کەس نوێژی جەماعەتی تێدا ناکات، کاتەکانی نوێژیش موراعات ناکرێ و نوێژی جومعەش هەر بەتەواوەتی وازی لێهێنراوە، هەروەها دەبینیم، کە مەشاهیدەکان و قەبرەکان لەلای ئێوە دەپەرسترێ، هۆی ئەمانە چنە؟

٢ـ نابینم له نێو منداڵان یان خوێندکاران یان لەنێو زانایان یەکێك هەبێ قورئانی پیرۆزی لە بەربێت یان له بەچاکی بتوانێ بیخوێنێ، دەبینم کە وازتان لە قورئانی پیرۆز هێناوەو، هۆی چیه وڵاتتان گەیشتۆتە پلەیەکی زۆر نزم؟، هۆی ئەم هەموو ئیهمالیە چیە؟ ئایە لەسەرتان پێویست نیە لە نوسینەکانتان و خوێندنگاکانتان و مزگەوتەکان گرنگی بە قورئان بدەن؟

٣ـ رووتو رەجالی ئافرەت و هەتك کردنی حورماتی ئیسلام لە شەقامەکانی وڵاتەکان گەیشتۆتە سنورێك، که مرۆڤ جگە لە وڵاتی ئێوە نەبێ هەستی پێ ناکات!.

مێژووی ئەم نامەیەش لە ١٩٣٤/٨/٢٦ زاینی بوو، پاشان نامەیەکیشی نووسی بۆ زاناکانی نەجەفو هەر هەمان نامەشی نارد بۆ زاناکانی کاظمیة.

لەو نامەیەدا نووسیبووی: ئەمە چەند مەسەلەیەکە پێشکەشی مامۆستایانی نەجەفی ئەشرەف دەکەم بە سوپاسەوە، بەهیوای سود لێ وەرگرتن بەدڵێکی پاك و ڕاستگۆیانە، کە هەمووی حەزو خواستە له پێکەوە ژیان و یەکخستنی هەردوو جیهانی ئیسلام: جیهانی شیعەی ئیمامی وجیهانی ئەهلی سوننەو جەماعە هیوام وایە لەلایەن هەموو مامۆستایان وەڵامی هەبێت ، یان هەریەکە بەتەنیا ڕونکردنەوەیەکی ڕوون و ڕەوان بداتو بەدەستی خۆشی واژووی لەسەر بکات ، له نامەکەدا باسی له هەندێك مەسەلەی ترسناك کردبوو، کە لە کتێبەکانی شیعەدا هەیە، کە ڕێگرە لە بەردەم ئوممەت بۆ ئەوەی بیەوێ یەك بگربێت، لەوانە:

١ـ کافرکردنی هاوەڵان.

٢ـ ناردنی لەعنەت بۆ سەدەی یەکەم.

٣ـ تەحریف کردنی قورئانی پیرۆز.

٤ـ لەکتێبەکانی شیعه حوکمەتە ئیسلامیەکانو قازی و زاناکان بە تاغوت لە قەڵەم دراون.

٥ـ هەموو کۆمەڵە ئیسلامیەکان کافرن و نەفرەتینەو دەچنە نێو ئاگر تەنها شیعە نەبێ.

٦ـ له کتێبەکانی شیعه جیهادکردن بەبێ ئیمامی خۆیانو گوێڕایەڵی کردنی وەك گۆشتی مردارو بەراز حەرامە، کەسیش شەهید نیه تەنها شیعە نەبێ، شیعەش ئەگەر لەسەر جێی

خۆشی بمرێ شەهیدە ، ئەوانەی لە پێناوی خواش دەجەنگێن لە غەیری شیعە ئەوا بەپەلە دەڕۆن بۆناو ئاگر.

پاشان شێخ ئەو مەسەلانەی ،کە لە کتێبە باوەڕ پێکراوەکانی شیعە نقل کردبوو بە شێخەکانی شیعەی ڕاگەیاند، کە ئەو شەش مەسەلەیە بیروباوەڕێکی جەخت کراوە لە لایان ، ئایە هیچ هیوایەك هەیە بۆ یەکگرتنی وشەی موسوڵمانان لە جیهانی ئیسلامی لەکاتێك ئەمە بیرواوەڕی شیعە بێت؟

ئایە پاش ئەو جۆرە بیروباوەڕە هیچ شوێنەوارێك دەمێنێ لە دڵی ئەوانەی عەودالّی یەکگرتن و نزیك بوونەوەن؟ ئایە کاتێك ئەوە بیروباوەڕی ئوممەتی ئیسلام بێت هیچ ڕێگایەکی لەبەردەم دەمێنێ بۆ سەرکەوتن لە دواڕۆژدا؟

پاشان چەند مەسەلەیەکی تری جگە لەوانە لە لاڕێبووەکانی شیعە باس کردو ، پاشان وتی: فەرموون مامۆستا بەڕێزەکان وەڵام بدەنەوە بۆ ئەوەی ئیسلام ببێتە یەك وشەو، موسڵمانانیش کۆببنەوە لەسەر کیتابی خوا، شێخ ساڵێك زیاتر چاوەڕوانی وەڵامی کرد، بەڵام کەسیان وەڵامیان نەبوو، تەنها موجتەهیدی گەورەی بەسرە نەبێت، کە هەڵسا بوو بەکاری خۆی و هەموو وەڵامەکانی دابۆوە لە کتێبێك، کە لە (٩٠) لاپەڕە زیاتر بوو، کە هەمووی تانەو تەشەربوو لە سەدەی یەکەمو توندڕەو تربوو لەکتێبەکانی تری شیعە لە جنێودان ، ئینجا شێخ موسی جاراللە کتێبە بەناوبانگەی نووسی و ناوی نا(الوشیعة في نقد عقائد الشیعة) تیایدا وتی: من بەمە بەرگری لە شەرەفی ئەو ئوممەتە و حورمەتی ئەو ئاینەو سەدەی یەکەم دەکەمو ، دەیکەمە پێویستیەکیش لەسەر خۆم و هەموو تاکەکانی ئوممەت.[1]

ئەو شێخە بەڕێزە لە ساڵی ١٣٦٩ هـ وەفاتی کرد هەزاران ڕەحمەت و بەزەیی خوا برژێت بەسەری و خودا لەگەڵیدا کۆمان بکاتەوە لەگەڵ پێغەمبەران ڕاست گۆیان و شەهیدان و پیاو چاکان.

---

١ـ بڕوانە: کتێبی(الوشیعة) لا (٣٩) لە ڕاستیدا لەمەسەلەی نزیك بوونەوە(تقریب) باشترم نەخوێندۆتەوە لە پەیامێکی جامیعی بە ناوی (مسألةالتقریب بین أهل السنة والشیعة).

بۆیەش ئەوها درێژەم بەم باسەدا، چونکە لە سەدەی ئەمڕۆ شیعە ترسناکیەکی زۆری هەیە، بە جۆرێك، کە هاوپەیمانە لەگەڵ نوصەیریەکان لە سوریەو، حزبی ئەمەلیش لە لوبنان، بەنهێنیش هاوپەیمانە لەگەڵ جولەکەو فەلەکان بۆ لەناو بردنی ئەو ئوممەتە بەڕێزو گەورەیە، هەروەها من ئاگام لە گرنگی دانێکی زۆر هەیە، کە بە باکوری ئەفریقیاو باشورەکەی دەدەن بۆ ئەوەی دەسەڵاتیان بگاتێ و کاریشی بۆ دەکەن بۆئەوەی خانە خوێیە کۆنەکەیان بگەڕێننەوە.

لەمەغریبی عەرەبی سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بەوەی چەند گەنجێکیان لە جەزائیر مەشق پێکردو لەو وڵاتی تونسیش هەر کاریگەریان تێکردو هاوپەیمانیشیان بەست لەگەڵ لیبیا ، لەئامانجە ئیستراتیجەکەیان لە جەنگی عێراقدا.

بەڵکو جەخت کراوەتەوە لە هەبوونی کۆمەڵێك، کە ژمارەیان کەم نیە لە کوڕانی باکوری ئەفریقی لە ئێران بۆ ئەوەی لە سەر دەستی مامۆستا و شێخەکانیان پێ بگەن، پاشان بەو هزرە ژەهراویە بگەڕێننەوە وڵاتی الفاتحین العظام کە لەمەدا بە ڕێکخستنێکی وردو بە نهێنیەکی تەواو کاریان بۆ کرد.

ئەو ڕوداوە خوێناویەی جەزائیریشیان بە هەڵ قۆستەوە لە نێوان حوکمەت و برا موسوڵمانەکان، کە ڕا گەیاندنی ئێرانی سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆ بزووتنەوەی ئیسلامی لە جەزائیر نیشاندا، جا زۆر جار لە براکانمان ئەو ڕاگەیاندە ساختە و فێڵاویە کاری تێکردن.

هەر یەکێك دەیەوێ لە کوڕانی ئەم ڕابوونە ڕۆشەنبیریو زانیاری خۆی زیاد بکات لەم بابەتەوە با بگەڕێتەوە بۆ ئەو کتێبەی، کە سعید الحوی نوسیویەتی بەناوی( الخمينية شذوذ في العقائد والمواقف) هەروەها کتێبی أحمد عبدالعزيز الحمدان بەناوی( مايجب أن يعرفه المسلم عن العقائد الروافض الإمامية).

خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٤﴾ وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ ﴿٤٥﴾﴾ القلم.

**سێ یەم: شیعەی ئیسماعیلی**: پاش مردنی ئیمام جعفر بن محمد الصادق شیعە بوون بە دوو

کۆمەڵە:

کۆمەڵێك ئیمامەتی دا بە کوڕەکەی موسی الکاظم ئەوانەش شیعەی دوانزەئیمامین ،کۆمەڵەکەی تریش ئیمامەتی موسی الکاظم ی ڕەت کردەوەو وتی: ئیمامەت پاش جعفر بۆ ئیسماعیلی کوڕیەتی، هەر لەو کاتەوە ئەو کۆمەڵە ناسرا بە شیعەی ئیسماعیلی.

عبدالقادر البغدادی لە بارەی الإسماعیلیة وتویەتی: ئەوانە ئیمامەتیان پاڵداوەتە لای جعفر و گومانیش دەبەن، کە ئیمامەت لە دوای ئەو بۆخۆیو ئیسماعیلی کوڕی بێت.[1]

شەهرستانیش وتویەتی: ئیسماعیلیەکان بەوە جیا دەکرێنەوە لە موسەوییەوەو شیعەی دوانزەئیمامی، کە ئیمامەت دەدەنە پاڵ ئیسماعیلی کوڕی جەعفەر، کە کوڕە گەورەیەتیو لەسەرتا ئەو بۆ ئەم ئیمامەتە ئاماژەی بۆ کراوە.

دەڵێن: جعفر الصادق ژنی بەسەر دایکی ئیسماعیل دانە هێنانەوەو، هیچ کەنیزەیەکیشی نەکڕیوە ئەمەش وەك سوننەتێکی پێغەمبەری خواﷺ، کە دەرحەق خەدیجەی کردو عەلیش، کە دەرحەق فاطیمەی کرد[2].

جا ئیسماعیلیەکان یەکێکن لە گروپەکانی شیعەو، خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسماعیلی کوڕی جعفرالصادقو زۆر ناوی تریشیان هەیە کە پێی ناسراون ، لەوانە الباطنیة، بۆیەش ئەوها ناونراون، چونکە وتویانە: هەموو ظاهیرێك باطنێکی هەیە و هەموو دەقێکیش تەئویلێکی هەیە، هەروەها قەرامیتەشیان پێدەگوترێ: ئەم دوو نازناوە زیاتر لە عێراقدا پێی ناسراون، هەروەها لە خوراسان پێیان دەوترێ: التعلیمیة والملحدة بەلاّم ئەوان حەز ناکەن بەم نازناوە بناسرێن، بەڵکو دەڵێن: ئێمە ئیسماعیلین، چونکە بەم ناوە جیا دەکرێنەوە لە گروپەکانی تری شیعە.[3]

**أ_ ترسناکی مەزهەبی باطینی:** ئەی برای بەڕێزم بزانە ، کە مەزهەبی باطيني لەو هۆکارانە بوو، کە ئوممەتی دارزاندو شەکەتو ماندوی کردو، ئەهلەکەی تووشی جۆرەها بیروباوەڕی پوچ و گەند کرد، کە ئەم بیروباوەڕنە لە بنەڕەتەوە بنیاتنرا بوو لەسەر

---

١_ الفرق بین الفرق لا ٦٢.

٢_ الملل والنحل ب١ لا ١٩.

٣_ الملل والنحل ب١ لا ١٩٢.

فەلسەفەی کۆن و ئوصولی ئیلحادی،جا کەم عەقڵەکانیان فریوداو ئەوانەش، کە هیچ بەشێکیان نەبوو لە مەنهەجی خوایی مەتین، خاوەنی ئەو مەزهەبە پوچە لەدژی ئیسلامو موسوڵمانان هاوپەیمانیان بەست لەگەڵ جولەکەو فەلەو تەتەرەکان ، کاتێك بەهێز بوون دەوڵەتی بەحرێنیان داگیرکردو کەوتنە خوێن ڕشتن و دزی و تالآن و دەست درێژی کردن بۆ سەر خەڵکەکەی، کە ئەوەی بیخوێنێتەوە یان بیبیستێ موچرکی پێدا دادێت و سەری سپی دەبێ لە تاو ئەو تاوانە گەورانە، هەر ئەوەش نا، بەڵکو هەڵیان کوتا سەر حاجیانی ماڵی خواو أبوطاهر الجنابي کاری زۆر خراپ و دزێوی کرد بەرامبەر حاجیەکان، کە ژمارەیەکی زۆر لەو حاجیانەی کوژران لە بیری زەم زەم ناشتو هەندێکیشی هەر لە حەرم و مزگەوتی حەرام ناشت.

کاتێکیش، کە لە باکوری ئەفریقیا دەوڵەتەکەیان دامەزراند ئەوا بیروباوەڕ پوچەکەی خۆیان دیارو ئاشکرا کردو دەستیان کرد بەکوشتنی زانایان و ئەهلی سوننەیان سەرشۆڕو زەبوون کرد، ئەمەش کە دواتر دەیزانینو باسی لێوە دەکەین.

العلامة البغدادي دژایەتی کۆمەڵی باطيني سەبارەت بە ئیسلام و موسوڵمانان کورت و پوخت کردوّتەوە وتویەتی: خوا بەختەوەرتان بکات، بزانن، کە زەرەری باطنیەکان لە سەر موسوڵمانان بەگشتی گەورەترە لە زەرەری جولەکەو فەلەو ئاگر پەرستەکان، بەڵکو گەورەترە هەتا لە دەهریەکان و زۆربەی کافرەکانی تر، بەڵکو زەرەیان گەورەترە لە(دَجَّال)، کە لە ئاخیری زەمان بەدیار دەکەوێ، چونکە ئەوانەی گومڕا بوون بە بانگەشەی باطینی لەکاتی بەدیارکەوتنی بانگەوازەکەیان هەتاوەکو ئەمڕۆ زیاترە لەوانەی ،کە بەهۆی(دجال)وە لەکاتی بەدیارکەوتنی گومڕا دەبن ، چونکە فیتنەی(دَجَّال) کاتەکەی لە چل ڕۆژ تێناپەڕێ، بەڵام کارە بەدو خراپەکانی باطنیەکان ژمارەیان لە ژمارەی دەنکی لم و باران زیاترە.[1]

إبن كثير باسی لەخراپەکانیانی کردوە، یەکێك لە توند ڕەوەکانیان کە ناوی أبوطاهر الجنابي الباطنية کاتێك گەیشتە مەککە سەربازەکانی ماڵەکانیانی بەتالآن بردنو خوێنی

---

١ـ الفرق بين الفرق ٣٨٢

حه‌لاڵ كردن جا له‌ ده‌وروبه‌ری مه‌ككه‌ و دۆڵه‌كانی و له‌ مزگه‌وتی حه‌رام و ناو كه‌عبه‌ حاجیه‌كی زۆری كوشت ، ئه‌میره‌كه‌شیان أبوطاهر به‌ نه‌فره‌ت بێ له‌ لایه‌ن خوا له‌ به‌رده‌رگای كه‌عبه‌ دانیشت، له‌كاتێك كه‌ خه‌ڵك له‌ بن ده‌ست و پێی به‌رده‌بوونه‌وه‌و ده‌كوژران له‌مزگه‌وتی حه‌رام و له‌مانگی حه‌رام له‌ ڕۆژی ته‌رویه‌ كه‌ ڕۆژێكه‌ له‌ پیرۆزترین ڕۆژه‌كان ده‌یوت:

أنااللـــــهُ وباللـــــه أنا        أنا أخُلقُ الخَلْقَ وأفنيهم أنا

جا خه‌ڵكی له‌به‌ری هه‌ڵده‌هاتن‌و خۆیان هه‌ڵده‌واسی به‌ په‌رده‌كانی كه‌عبه‌، به‌ڵام ئه‌م كاره‌ هیچ دادی نه‌ده‌دان و به‌و شێوه‌یه‌ ده‌كوژران، به‌ڵكو كه‌ ته‌وافیان ده‌كرد له‌كاتی ته‌واف كردنیان ده‌كوژران، هه‌تا كه‌ ده‌ڵێ: كاتێك ئه‌و نه‌فره‌تیه‌ ئه‌وه‌ی كردی كردی به‌ حاجیه‌كانی ماڵی خوا، كه‌ لێبۆوه‌ فه‌رمانی كرد ئه‌و كوژراوانه‌ بنێژن له‌ بیری زه‌م زه‌م‌و، زۆربه‌شیان هه‌ر له‌ حه‌ره‌م له‌ شوێنی خۆیان نێژران، ئه‌و نه‌فره‌تیه‌ قوببه‌ی زه‌مزه‌میشی ڕوخاند و فه‌رمانیشی كرد ده‌رگای كه‌عبه‌ له‌ بنچینه‌دا هه‌ڵكێشن و په‌رده‌كانیشی لێبكه‌نه‌وه‌و له‌ نێوانه‌ خۆیان پارچه‌ پارچه‌ی بكه‌ن...[1] هه‌ندێك له‌ زانایان ژماره‌ی ئه‌و كه‌سانه‌ی كوژران دیاریان كردوه‌، كه‌ ده‌گاته‌(١٣) هه‌زار كه‌س هه‌ندێكیش ده‌ڵێن: ده‌گاته‌ نزیكه‌ی(٣٠)كه‌س[2] ئه‌مه‌ش مێژووه‌كه‌ی ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ ساڵی(٣١٧) كۆچی.

به‌ڵام سه‌باره‌ت به‌وه‌ی، كه‌ ئایه‌ كه‌ی مه‌زهه‌بی باطيني سه‌ری هه‌ڵداوه‌ ئه‌وا زانایان له‌م باره‌یه‌وه‌ ڕایان جیاوزه‌ ، هه‌نێك ده‌ڵێن: له‌ ساڵی(٢٠٥)كۆچی، هه‌ندێكیش ده‌ڵێن: ساڵی(٢٥٠) كۆچی جا به‌ پێی ئه‌و نهێنیه‌ی، كه‌ فه‌رز كرابوو له‌سه‌ر شوێن كه‌وتوانی ئه‌و مه‌زهه‌به‌ ئه‌سته‌مه‌ ساڵی دروست بوونیان به‌ شێوه‌یه‌كی ورد دیاری بكرێ، ئه‌گه‌رچی وته‌ی زانایان زیاتر له‌ سه‌ر ساڵی(٢٠٠)ی كۆچیه‌، جا پاش بڵاوبونه‌وه‌ی ئیسلام و عه‌زیز بوونی ئه‌هله‌كه‌ی و كوژانه‌وه‌ی ئاگری ئاگرپه‌رسته‌كان‌و ڕووخانی جوله‌كه‌كان و، نه‌مانی بتی بتپه‌رستان و، دۆڕانی ئوممه‌تی خاچ په‌رستی، حه‌ساده‌ت دڵی ئه‌وانه‌ی، كه‌ له‌ ئیسلام ده‌رچوبوون ته‌قاندو سوتاند ، بۆیه‌ به‌نهێنیه‌كی زۆر ورد پیلانیان داده‌ناو خۆیان خه‌نیكرد

---

١ــ البداية والنهاية ب١ لا ١٦٠

٢ــ كشف الأسرار الباطينية لا ٣٩، سيرأعلام النبلاء ب٥ لا ٣٢

بەوەی جنێو بە ئیسلام و ئەهلەکەی بدەن‌و ئاڵای شەیتان و حیزبەکەی بڵند بکەن ، بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە پیس‌و نزمە چەند قیناعێکیان کردە سەر بۆهێنانەدی ئەو ئامانجانەی مەبەستیان بوو لەوانە:

١ـ پشت بەستنیان بە تەئویل کردنی دەقەکان، تەئویل کردنێك، کە پێچەوانەی ئەوەبوو، کە ئیسلام بڕیاری لەسەرداوەو فەرمانی پێکردوە.

٢ـــ دیارخستنی مەزهەبی شیعەگەرایەتی لەگەڵ زانینیان بەوەی، کە مەزهەبی شیعەگەرایەتی زۆر تێك ناکاتەوە لەگەڵیان، بەڵام ئەوان ئەگەر هیچ ڕێگەیەکیان نەدیتەوە بۆ چوونە ناو ئیسلام ئەوە لایان ئاساییە خۆیان بدەنە پاڵ مەزهەبی شیعی و دەری بخەن، ئەو مەزهەبەش دروست بووە، هەروەك، کەغەزالی بۆمان باس دەکات و دەڵێت: ئەو مەزهەبە لە کۆبونەوەیەك دروست بوو، کە پێك هاتبوون لە کوڕانی ئاگرپەرست و ئەو بێ باوەڕانەی کە لە گاورو بتپەرستەکان پێك هاتبوون، کە پێیان دەوترا: المزدکیة، هەروەها لە کۆمەڵێکی تریش لە گاورە فەیلەسوفە کۆنەکان، وەك زاد الدیلمي و هەندێك لە پاش ماوەی خورەمیەکان و جولەکەکان، کە پیاوێك بەناوی نادوشنۆ کۆی کردنەوە بۆ ئەوەی بە فروفێڵ و تەڵەکەبازی بێنە ناو ئیسلام، چونکە ئەوان وتیان: بەڕاستی محمد زاڵ بۆتە سەرمان و ئاینەکەی ئێمەی بودەڵ کردۆتەوەو، خەڵکێکی زۆری هەیە شوێنی کەوتون، کە ناتوانین بەرانگژیان بینەوەو ناش توانین ئەوەی لە دەستی موسوڵمانانە بە شمشێر بەدەستی بێنین ، چونکە بەهێزن و سەربازیان زۆرە، هەروەها ناتوانین بەگفتوگۆو وتوێژ بەرامبەریان ببینەوە، چونکە زاناو بلیمەت‌و زیرەکیان زۆرە، هیچ ڕێگا چارەیەکیش نیە تەنها پەنا بردنە بەر فێڵ و تەڵەکەبازی نەبێت، پاشان ڕێککەوتن لەسەر دانانی چەند فرت وفێڵێك و دانانی چەند پیلانێك بۆ ئەوەی ئامانجەکانیان بێننەدی.

بۆ هێنانەدی ئامانجەکنیان یەکێك لە هۆکارەکانیان چوونە ناو موسوڵمانەکانە لە ڕێگایی شیعەگەرایەتی لەسەر مەزهەبی رافیضة، ئەگەر چی ئەو باطنیانە ڕەوافیزەکان بە ئەهلی گومڕا دادەنێن و دەڵێن: ئەوانە لە هەموو کەس کەم ژیرترن و لە هەموو کەس ڕایان سەخیف ترەو زۆر خۆش باوەڕن‌و زۆر بەپەلە باوەڕ بەدرۆ دەکەن، لە هەموو کەس ساویلکەترن لە باوەڕکردن بە ڕیوایەتی درۆو شتی پڕوپوچ و تورەهات، بەو خۆپاڵدانە

بۆلایان خۆیان شاردەوە بۆ ئەوەی بگەنە خەڵکە سادەو ساویلکەکان، کە ڕواڵەتیان(رفض) بوو باطینشیان کوفرێکی تەواو بوو، هەروەك غەزالیو چەند زانایەکی تر باسی لێوە کردون و دەڵێن[1]: ئیمامیەکان وەك ڕێڕەوێك وانە بۆ باطنیەکان، ئەو ڕاڤەکردنەش ڕاڤەکردنێکی مەعقولە، چونکە ئەوەی تێبینی دەکرێ نزیك بوونەوەیەکی زۆر هەیە لە نێوان باطنیەکان و رافضةکان[2]

إبن کثیر لە ڕووداوەکانی ساڵی(٢٧٨)ی کۆچی دا وتویەتی: لەو ساڵەدا قرامیطةکان ، کە گروپێکن لە گاورە بێ باوەڕەکان و شوێنکەوتەی فارسەکانن دەستیان بەجولە کرد ، کە بیروباوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی زەرداشت مەزدك هەیە، ئەوانە حەرامەکانیان حەلال کرد، ئەوانە هەریەك دۆڵ بکوتێ بۆ شتی ناوەڕوا و پڕوپوچ ئەوا شوێنی دەکەون، زیاتریش مل کەچی(روافضة)کانن‌و لە ڕێگای ئەوان دەچنە ناوشتی پڕوپوچ و ناڕەوا، چونکە لە هەموو کەس گەمژە ترن‌و پێشیان دەوترێ: الإسماعیلیة لە بەر خۆدانە پاڵیان بۆلای إسماعیل الأعرج ی کوڕی جعفرالصادق.[3]

**ب ـ بیروباوەڕی پووچی باطنیەکان:** بەڕاستی ئەوەی شارەزای کۆمەڵی باطنیەکان و مەزهەبەکانی بێت ئەوا دژایەتیەکی زۆر ڕوون وئاشکرا بەدی دەکات، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەهلی ئەو گروپە باطنیە پیسە بۆ ئەوەی ئەو قسەو باسانەی لە لای خەڵکی لە سەریان هەیە هەمووی یەك نەبێت و(تضارب)ی هەبێت، بەم هەڵوێستە ئەوەی بیانەوێ ڕەتی دەکەنەوەو ئەوەی بیانەوێش دەیکەن، بنچینەی مەزهەبەکەشیان هەمووی لە سەر درۆو حیلەو فروفێڵ بنیات نراوە، مەزهەبەکەیان لەسەرپێیەکانی خۆی ڕاناوەستێ، مەگەر بەو هەمە ڕەنگیە زۆرە نەبێت، بۆیە غەزالی وتویەتی: ئەوشتانەی لە بارەی مەزهەبی باطنیەکان باسمان لێوەکرد – بێ گومان – وادەخوازێ کە گواستنەوە لێیانەوە یەك نەبێت و پەرتەوازەیی تێدابێت، چونکە ئەوان بە یەك جۆرو شێواز قسە لەگەڵ خەڵکیدا ناکەن، ئامانجیشیان لەمەدا فێڵ کردنە، جا بۆیە قسەیان هەموو یەك نیە و گواستنەوەش لە

---

١ـ فضائح الباطنية لا ٣٧

٢ـ بڕوانە: کتێبی: فرق معاصرة للعواجی

٣ـ البداية والنهاية ب١١لا ٦١.

مەزهەبەکەیان هەمووی وەك یەك نیە.[1]

هەر بۆیە بۆ لێکۆڵەر دەردەکەوێ، کە بیروباوەڕی باطنیەکان پێك هاتووە لە کۆمەڵە ئەفکارێکی گۆڕاوو لاڕێ بوو لە چەند مەزهەبێکی جیاواز، کە هەمووی تێکچون و لادان و جیاوازی و شپرزەییە، هەندێك جاریش بەڵگە بە فەرمودەی هەڵبەستراو درۆ دێننەوەو ئایەتەکانیش لە مانا ڕەواکەی خۆی لادەدەنو دەردێنن.

بیروباوەڕەکەشیان دەگەڕێتەوە بۆ چەند خاڵێك:

١ـ ئینکارکردنی بوونی خودا.

٢ـ ڕەتکردنەوەی ناو وسیفەتەکانی خودا.

٣ـ گۆڕینی شەرعی پێغەمبەران و پەیامبەران.

٤ـ ئەوشتانەی، کە ئەنجامی دەدەن هەنجەتیان ئەوەیە، کە ئەوان خۆ دەدەنە پاڵ(آل البیت) و خۆشیانیان دەوێت، یان شتی نوێ دێننەکایەوەو، توانایەکی ئێجگار سەیریشیان هەیە لە دروستکردنی دروشم و هەڵبەستانی درۆ.

بابەتەکەش زۆر لەوەفراوان ترە، لەو کتێبانەی، کە لەو باسەوە بەسوودن کتێبی فضائح الباطنیة للغزالي و فرق معاصرة للعواجي.

---

١ـ فضائح الباطنیة لا ٣٨

## تەوەرەی سێ یەم : بانگەوازی باطنیەکان لە باکوری ئەفریقیا

## أبو عبداللە الشیعی

وا ڕێکەوت وڵاتی یەمەن ببێتە چەقێك بۆ بانگەوازی شیعەی ئیسماعیلی، چونکە دوور بوو لە بەر چاوی دەوڵەتی عەبباسی، هەر لەوێ بە نهێنی دەستیان کرد بە ئامادەکردنی هێزی سەربازی ، کە دەبێتە زەخیرەی دوڕۆژیان، سەرکردایەتیش پیاوێك لە یەمەن گرتیە دەست پێی دەوترا: ڕۆستەمی کوڕی حەوشەب کە توانی هەندێك لە فارسەکان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، کە دژی موسڵمانان بوون، بەڵام ڕۆستەم وای بینی، کە زەوی ڕۆژئاوا زۆر بە پیتە بۆ چاندنی شیعەگەرایی، هەر بۆیە لە یەمەن دوو پیاوی لە ئەنساری خۆی بەناوی سوفیان و حەلەوانی نارد بۆ تەرابلس‌و تونس بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبی شیعی ،جا توانیان بە ئەفکارەکانی خۆیان هۆزی بەرانس تێوەگلێنن، کە هۆزێکی بەهێزو خاوەن دەسەڵات بوون، کە دەچوون بۆ دامەزراندنی وڵاتێك لە ڕۆژئاوا لە سەر ڕێڕەوی ئەداریسەکان لە ئاخیری ڕۆژئاوا، هەروەها ئەغالیبەکان، کە پایتەختەکەیان تونس بوو.

لەوانەی، کە إبن الحوشب لە یەمەن هەڵیبژاردن: أبو عبداللە الشیعی حسن بن أحمد بن محمد زکریا الشیعی بوو، کە خەڵکی صەنعاء بوو، بۆیە إبن حوشب ئەو پیاوەی هەڵبژارد، چونکە سیفاتی سەرکردەی لێ بەدی دکردو زانستێکی زۆریشی هەبوو، زۆر زیرەك و لێهاتو بوو توانایەکی سەیری هەبوو لە هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ خەڵکی، أبو عبداللە الشیعي وا دادەنرێ، کە دامەزرێنەری فیعلیە بۆ دەوڵەتی عوبەیدی لە ڕۆژئاوا، إبن حوشب لە پاش مردنی حەلەوانی و ئەبو سوفیان ،أبو عبداللە الشیعي نارد بۆ مەغریب‌و پێی وت: حەلەوانی و ئەبو سوفیان زەوی کەتامەیان لە وڵاتی مەغریب ئامادە کردوە، ئێستاش ئەوان مردن‌و، کەسیش وەك تۆ بۆ ئەو شوێنە گونجاو نیە، بۆیە بە پەلە بڕۆ بۆ ئەوێ، چونکە شوێنێکە بۆت خۆش و ئامادە کراوە.[1]

لە نێوان ساڵی٢٨٨ تا ساڵی ٢٨٩ کۆچی أبو عبداللە الشیعی ئەو پیاوە بلیمەت و موراویغ

---

١ـ بڕوانە: کتێبی: موسوعة المغرب العربي ب٢ لا ٥٧ دکتۆر عبدالفتاح الغنیمي

و فێڵ بازە گەیشتە مەککە، گەڕا لە دوای وەفدی مەغاریبەکان، کە هاتبون بۆ حەجی ماڵی خوا توانی حاجیەکانی کەتامە بناسێو، خۆشی لێیان نزیک کردەوە بەوەی، خۆی بە پیاوێکی دیندارو زانا نیشاندانو، توانی جێی خۆی بکاتەوە لە ناو دڵی شێخەکانی کەتامەو لەگەڵیشیان گەڕاوە بە جۆرێک وای حاڵی کردن، کە مەبەستی میسرە بۆ ئەوەی منداڵەکانیان فێر قورئان خوێندن بکات ، لە ڕێگا پێیان وت:وەرە لەگەڵمان بۆ مەغریب ، بەلاّم ڕەزامەندی نیشان نەدا، پاشان بە سیاسەتە فێڵاویەکەی لەگەڵیان ڕۆیشت و داوایەکەی بەدی هێنان، هەتا لە قەیرەوان لایاندا بۆ ئەوەی لە خاڵی لازو بگەڕێ لە دەوڵەتی ئەغالیبەکانو زانیاری کۆبکاتەوە لەسەر بەهێزترین هۆزو زانینی ئەو هۆکارانەی بەسودن بۆ چونە ژورەوەی وڵاتی مەغریب، پاش ئەوەی دڵنیا بوو، کە بە هێزترین هۆز لە مەغریب کەتامیەکانن، بڕیاری دا بچێتە ئیکجان، کە شوێنێك بوو، کەوتبوە چیایەکی دژوارو سەخت، زانی کە ئەو شوێنە شوێنی هۆزی سەکتاتەیە، کە تیریەکن لە هۆزی کەتامیەکان[1]،ابو عبداللە خۆی بە مامۆستایەکی پەروەردەکەرو خواناس نیشان داو، ڕێگای زوهدی گرتەبەر هەتا دڵیانی داگیر کردو، بە پیاوێکی ماقوڵ ناوی دەرکرد، مۆزگەلێك لەبەربەریەکان ڕوویان تێکرد، ئەویش هەڵسا بە گۆش کردنیان بە مەزهەبی شیعی و تێی گەیاندن و فێری کردن، پاشان چووە ناو کاروباری سیاسەت و نیزامی حوکم و ڕۆڵی حوکم کردن بە شورا، حەقی بەعەلەویەکانیشدا، کە لە هەموو کەس لە پێشترن بۆ وەرگرتنی حوکم.

بەهۆی ئەو ستەمەی، کە دەوڵەتی ئەغالبەکان لە خەڵکیان دەکرد هەندێك هۆز وەلاّمی داعیەی شیعەیان دایەوە، کە وایان زانی زۆر دڵسۆزە، لێرە لەگەڵ ئەغالبەکان ڕوو بەڕوو بوونەوە ڕویدا، أبو عبداللە الشیعی چوو بۆ ناو قەلاّیەکی بەهێز لە چیای تۆڕاس لە شوێنی تازروت لەوێ لێدانی یەك لەدوای یەکی ئاڕاستە دەکرد بۆ دەوڵەتی ئەغالبەکانو هەروا بڵاوکردنەوەی زوڵم و ستەمەکانیان و ڕوونکردنەوەی ئەوەی، کە حوکمیان لە ئیسلامو شەریعەتی خوا دەرچووە ، هەروەها هەڵسا بە وروژاندنی چەند ڕقوقینەیەکی کۆن لە نێوان

---

١ــ موسوعة المغرب العربي ب٢ ٥٦.

دەوڵەتی ئەغالبەکان و هەندێك هۆز، بەڵێنیشی دا بە پیاوەکانو سەرکردەی هۆزی کەتامە، کە دوارۆژ و دەوڵەت وپێگیری بۆ ئەوانە، جا هۆزەکان هەموو سەریان بۆ دانواندو شوێنەکانیش یەك لە دوای یەك دەڕوخان و توانی غەنیمەتێکی زۆریش بگرێت، گروتین بۆ شوێن کەوتوەکانی زیادی کرد، ئەوەی یارمەتیشیدا لە هەڵوەشانەوەو لاوازی دەوڵەتی ئەغالیبەکان نوقم بونیان بوو لە ڕابواردنو خۆش گوزەرانی، لە لایەکی تریش بێزاری خەڵکی بوو لە ئەمیرە ستەمکارەکانیان، ابو عبدالله موکڕی و ئازایەتی و توانستی سیاسی و کەفائەی سەربازی نیشان داو وای کرد ئەوانەی دەوروبەری لەسەرکردەو سەربازگەکان متمانەی پێبکەن ، ئەمەش ئەوەی پێبەخشی ، کە کاتی ئەوە هاتووە بۆ کەشف کردنی بانگەوازەکەی بەوەی دوعای ڕەزامەندی بۆآل البیت النبي بکات، کە بەم زووانە بە دیار دەکەوێ و حوکم دەگرێتە دەست.

بەو پێیە ابو عبدالله الشیعي توانی دەست بگرێت بە سەر هەموو خاڵە جەنگیەکان لە نێوان قەڵاکەی لە چیای تۆڕاس هەتا پایتەخی ئەغالیبەکان.

لەسەرەتایی مانگی جمادالأولی لە ساڵی ٢٩٦ی کۆچی بەرامبەر ساڵی ٩٠٩ زاینی شوێنی الأدریس ڕووخاو وکەوتە ژێر دەسەڵاتی ابو عبدالله الشیعي ئەو شوێنەش کلیلی چونە ژوورەوەی قەیرەوان بوو، کە پایەتەختی سیاسی ولات بوو، هەر بە پەلە زیاد الله الأخیر لە مانگی جمادالأولی لە ساڵی ٢٩٦ چوو بۆ میسرو ابوعبدالله ی شیعیش چووە ناو قەیرەوان.[1]

ابوعبدالله لە میانی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی لەسەر دەوڵەتی ئەغالیبەکان بەدەستی هێنا ڕایگەیاند، کە ئیمامی حەقیقی موسوڵمانان عبیدالله المهدیە و هەر لەو زووانە دەگاتە وڵاتی مەغریب و دادگەری و یەکسانی دابین دەکات ، هەندێك لە هێزی ئەغالیبەکان چوونە ڕیز هێزەکەی و ژمارەی هێزەکەی گەیشتە هەزار شەرکەر بۆ ئەوەی بەرگری لە مەزهەبی شیعەی ئیسماعیلیەکان و دەوڵەتی نوێ بکەن، زانراویشە لە مێژوو، کە خەڵکی ڕەشو ڕووتو نەزان بەسەرکەوتنەکان هەڵدەخەڵەتێنو واگومان دەبەن، کەئەو کەسەی سەرکەوتووە ئەو حەقە ، لە گەڵ پرووپاگەندەیەکی بەهێزی شیعەکان وسەرکەوتنە

---

١ـ موسوعة المغرب العربي ب٢٥ ٦٠

بەرچاوەکانیان و باوەڕکردنی خەڵکی بە مەهدی چاوەڕوان کراو، خەڵکی بەسەر کردەو سەربازەوە وای لێهات هیچ ڕاو بیرو بۆچونو عەقڵی نەبێ، بەڵکو وەك ئامێرەکان بێت لە جێ بەجێکردندا، ابو عبدالله الشیعی هەوڵی دا پشت ببەستێ بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبەکەی بە پڕوپاگەندەو مێزگرد بۆ ئیقناع کردنی زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعەت وەك عثمان بن سعید الحداد، بەڵام کاتێك ئیقامەی حوجەیان لەسەر خۆی و شوێن کەوتەکانی کرد، هیچی لە دەست نەما، بۆیە برای عبدالله الشیعی ابوالعباس لە پایتەختی باکوری ئەفریقیا هێزی بەکارهێنا بۆ ڕیشەکێش کردنی مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەتو ، لەگەڵ زانایانی ئەهلی سوننە جۆرەها ئەشکەنجەی دان وەك لێدانی فەقیهەکان بە قامچی وبڕینی زمانی هەندێکیان و مل پەلدانیان و پارچە پارچەکردنی لەشی هەندێکیان و لە خاچ دانی فەقیهەکانو دەست بەسەرداگرتنی ماڵ و سامان و خەڵکیان لە سەر زگ و پشت ڕاکێشاو فەرمانیان بەدارو دەستەکانیان کرد، کە بە پێ بەسەریان بکەون، لێرە کێشەی مەزهەبی توندتر بوو، دەوڵەتی تازە لە دایك بوو شلەژاو ابو عبدالله الشیعی هاتە ناو کێشەکەو موناظرەی قەدەغەکرد بۆ ئەوەی کێشەکە بېڕێنێتەوەو برایەکەشی لە ویلایەتی قەیرەوان لادا.

بەڕاستی ابو عبدالله الشیعی سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە قایم کردنی کۆڵەگەکانی حوکم لە قەیرەوان بە هۆی سەرکردەکانی هۆزی کەتامە بەتایبەتیش گەورەکەیان غزویە بن یونس و برایەکەی و قەومەکەی، ابو عبدالله الشیعی بانگهێشتی عبیدالله المهدی و قاسمی کوڕی کرد بۆ ئەوەی بێنە قەیرەوان، عبیدالله لە شامەوە خۆی ئامادە کرد لە شوێنێ سەلمیە بۆ میسرو لەوێش بۆ بەرقەو لەوێش بۆ طرابلس، کە خۆی بە پۆشاکی بازرگانەکان شاردبۆوە، چەند بەسەرهاتی درۆشی گێڕاوەتەوە لەسەر رزگاربوونی لە کاربەدەستانی دوەڵەتی عەباسی، بەڵام لە ڕێگا لەلایەن بنی مدرار، کە ئەمیرەکانی سجلماسة بوون بەدیل گیرا.[1]

لەساڵی(٢٩٧)ی کۆچی بەرامبەر ساڵی(٩١٠)ی زاینی ابو عبدالله الشیعی توانی سوپایەك ئامادە بکات و دەوڵەتی بنی مدرار بڕوخێنێ وعبیدالله المهدی و کوڕەکەشی لە بەندیخانە

١ـ موسوعة المغرب العربي ب٢ ٦٥

ڕزگار بکات، له ڕێگای گەڕانەوەشی سوپا بەلای تاهرت تێپەڕێ و دەوڵەتی بنی روستمیان له سالی(٢٩٧)ی کۆچی بەرامبەر ساڵی(٩١٠) ی زاینی لەناو برد بەو پێیە مەغریبی ناوڕاست هەتا تەلمەسان بوو بە دەوڵەتی عوبەیدی.

جا عبیدالله المهدی ئیعلانی دروست بوونی دەوڵەتی فاطمي کردو، نیسبەتی وڵاتەکەشی دا پاڵ فاطیمەی زەهرا کچی پێغەمبەری خواﷺ بۆ هەڵخەڵتاندنی خەڵکی و گومڕا کردنیان.

بەرەبەرە دەوڵەتی فاطیمي هەوڵی دەدا بۆ نەهێشتن‌و ڕووخاندنی دەوڵەتی عەبباسی بە تایبەتی پاش ئەوەی کۆتاییان بە دەوڵەتی بنی میدرار هێنا له سەجلماسە و دەوڵەتی روستم له تاهرت و دەوڵەتی ئەغالبەکان له ئەفریقیا (تونس)

بەیعەتی عبیدالله المهدی له قەیرەوان له سالی(٢٩٧)ی کۆچی بەرامبەر ساڵی(٩١٠)ی زاینی بوو، ویلایەتی ابو عبدالله الشیعی پاش ئەوەی(١٠)ساڵ بەردەوام بوو کۆتایی پێهات، هەروەك هەندێك مێژوونوس باسیان لێوەکردوە.[1]

هەروەك سروشتی هەموو شۆڕەشەکان عبیدالله المهدی توانی ابو عبدالله الشیعی و برایەکەی ابوالعباس و غزویە بن یونس و هەموو ئەوانەی لەگەڵیان بوون له ناویان ببات بە چەند پیلانێکی یەك له دوای یەك.

ئەمەش بەهەمان شێوە تێبینی کراوە لە دیراسەکردنی مێژووی کۆن ونوێ، ئەویش کە ئەو دۆست و برادەرانەی تەقوایان نیەو لەخوا ناترسن، ئەوا تەنها چەند بەرژەوەندیەك و ڕێبیرەکی گەند کۆی کردونەتەوە بۆ ئەوەی له پشت یەکتری بن، ئەمەش کە ڕوویدا له شۆڕشی فەرنسی له ساڵی ١٨٧٩زاینی و شۆڕشی جەزائیری و، شۆڕشی سوری و میسری و لیبی و عیراقی.

بۆم دەرکەوت، کە ئەمە سوننەتێکە له سوننەتەکانی خوا لەسەر کۆمەڵگاکان ((من أعان ظالماً سلط الله عليه[2])) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضَۢا بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ الأنعام: ١٢٩

---

١ ـ موسوعة المغرب العربي لا ٧٠

٢ـ زۆر گەڕام ئەم فەرمودەیەم بەم بێژەیە نەدیتەوە.وەرگێڕ

مێژوو نووسەکان باسیان کردوە، کە خیلافێك دروست بوو لە نێوان عبیدالله المهدی و أبی عبدالله الشیعی لە سەر ئەو ماڵ و سامانەی عبیدالله المهدی چنگی کەوتبو، هەندێکیش وا دەڵێن، کە ابو عبدالله الشیعی گومانی هەبوو لە عبیدالله المهدی، کە مەهدی چاوەڕوانکراو بێت.

خاوەنی موسوعة المغرب العربي دکتۆر عبدالفتاح مقلد الغنیمي هەردوو هۆی باس کردوە،[1] بە بێ ئەوەی یەکێکیان پەسند بکات، پاشان بەرگری کردوە لە نەسەبی عوبەیدیەکان و لەسەر بیرو بۆچۆنی خۆی نەسەبیان دەگرێتەوە سەر فاطمة الزهراء و هێرێشکێکی توندیشی کردۆتە سەر ئەوانەی، کە تانەوتەشەر، لە نەسەبی عوبەیدیەکان دەدەن بەوەی، کە جولەکەنە، یان ئاگرپەرستن، ئەوانەی بەوە تۆمەت بارکردوە، کە دۆستی خیلافەتی عەبباسینە لە بەغدا، یان خیلافەتی ئەمەوی لە ئەندەلوس، هەردوو خیلافەتیش هێرێشێکی دژواریان کردۆتە سەر نەسەبی عوبەیدیەکان.

دەڵێم: بەڕاستی إبن کثیر رحمه‌الله، کە نەقلی وتەی زانایانی کردوە لە البدایة والنهایة لە بارەی تانەوشەر دان لە نەسەبی عوبەیدیەکان ئەوا بەڵگەی بە هێزترەو سەنەدەکەی پتەو ترەو، زاناترە بە حەقیقەتی دەوڵەتەکان و دامەزرێنەریان و زۆر بەڕاست گۆیی و ئەمانەتێکی بێ سنور زانیویەتی و قسەکانیشی زۆر ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام إبن الأثیر جەختی نەکردوە بەڵام نەسەبی بۆیان جێگیرکردوە، بەبێ ئەوەی ئاماژە بکات ئەمەش لە کتێبی الکامل في التأریخ[2] .إبن الأثیر ناسراوە بە خۆش ویستنی شیعە، إبن تیمیة لە کتێبی الفتاوی جەختی کردۆتەوەو بەڕاشکاوی وتویەتی: کە نیسبەتی ئەوان بۆ فاطیمە جێگیر نیە و ڕاست نیە، ئێستاش ئەوە شایەدی ئەو مێژوونوسە بەڕێزەیە إبن خەلەکان، کە دەڵێ:موحەقیقەکان ڕەتی دەعواکەی دەکەنەوە لە بارەی نەسەب و دەڵێن، کە ئەوانەی بەنەسەب خۆ دەدە پاڵ فاطیمە و بە فاطیمیەکان ناسراوان ئەوە تەنها پروپاگەندەیە، بەڵکو لەڕەچەڵەکێکی جولەکەن بەناوی سەلیمە ، کە لەشام هەنە، باوکیشی نازناوێکی هەبوو ناسرا بوو بە القداح، چونکە چاوڕێژ بوو کلی لەچاوان دەکرد، عبیدالله لە ساڵی

---

١ـ بڕوانە: موسوعة المغرب العربي لا ٧٠

٢ـ بڕوانە: الکامل في التأریخ ب٥ لا١١

(٣٢٢) كۆچی له ناچوو، لـه پاشـه خـۆی نەوەكـەی مـوعیز تـوانی دەسـت بەسـەر میسـر دا بگرێت.... موڵكی عوبەیدیەكان نزیكەی دوو سەدە بەردەوام بوو هەتا، كە پاڵەوانی ئیسـلام صلاح الدین الأیوبي تـوانی لـە سـاڵی (٥٦٤) كۆچـی لـە ناویـان ببـات و هـەموو شـوێنەواری عوبەیدیـەكان ڕامـاڵی و كۆتایشـی بـە شـەڕو نەگبەتیـەكانیان هێنـاو خـوای گـەورە بـەهۆی ئەوەوە بەندەكانی خۆی لە كۆڵی ئەوانە كردەوە.[1]

هەرچـۆنێك بێـت كـردەوەو بیروباوەڕەكانیـان بەڵگـەدەدا لـە سـەر ئـەوەی، كـە نـەوەی موسـوڵمانان لــە ڕەچــەڵەكی پێغەمبــەری پــیرۆزو زانایــە خوانــاسو پاكــەكانو فەقیهــە هەڵبژاردەكان دوورن لەو قسە سوك و ناشیرینانەو ئەو كاروكردەوە قێزەونانە، خودی خـۆم من ڕام وایە، كە ابو عبدالله الشیعی بۆی دەركەوت، كە عبیدالله المهدی بۆ موڵك و دەسـەڵات چڵێسە و هەروا زۆردارەو هەوڵ بۆ سەروەری خۆی دەدا، ابو عبیدالله ویستی لەو شوێنە لای بدات و هەوڵیشی دا لە ناوی ببات، كاتێك ویسـتی دەورووبەرەكـەی خـۆی باوەڕبهێنێـت، كـە ئەو كەسە ئەو مەهدیە چاوەڕوان كراوە نیە، كە پێشـتر باسـی بـۆ دەكـردن، بـەڵام عبیـدالله المهدی لەوی خێراتر بوو توانی كۆتایی بەدوژمنەكانی بهێنـێ، سـەبارەت بـە نەسەبەكەشـی ڕاستر وایە، كە تەنها پڕوپاگەندیەو، هیچ پەیوەندیەكی بەئەهلو بەیتەوە نیە، ئەوەش، كە لە باسكردنی ژیانی دەیسەلمێن إن شاء الله.

---

١ــ فرق معاصرة ب١ لا ٢٨٩.

## تەوەرەی چوارەم: خلیفەی شیعی رافیزی یەکەم عبیداللە المهدی

٢٩٧ـ ٣٢٢/٩١٠ـ ٩٣٤.

پێشەوا ذهبي باسی ژیانی عبیداللە المهدی لە سیرأعلام النبلائدا کردوەو وتویەتی: عبیداللە باوکی محمد یەکەم خەلیفەی خەواریجە عوبەیدیە باطنیەکانە، کە ئیسلامیان سەراوژێر کردو ئیعلانی رەفضیان کردو مەزهەبی ئیسماعیلیەکەی خۆیان بەدیار نەخستو بانگخوازەکانی خۆیان بلاوکردەوە بۆ سەر لێشواندن و گومراکردنی شاخ نیشنەکان.[1]

لەبارەی نەسەبیشی وتویەتی:موحەقیقەکان لە سەرئەوەن، کە نەسەبیان ناگەڕێتەوە بۆ فاطیمەو ئەوەی باسی دەکەن تەنها پروپاگەندەیە، چونکە کاتێك إبن طباطبا لە بارەی نەسەبی لە موعیزی پرسی وتی: بەیانی بۆت دێنمە دەرێ، بۆ بەیانی کۆمەڵە زێرێکی فرێداو، دواتر نیوەی شمشێرەکەی لە کالآنەکەی دەرهێنا، وتی: ئەوە نەسەبی منەو فەرمانیشی کرد، کە زێرەکە بەتالآن ببەن، پاشان وتی: ئەوەش ڕەچەڵەکی منە.[2]

موفتی لیبیا شێخ طاهر الذاوي رحمە اللە لە بارەی ژیانی عبیداللە المهدی وتویەتی: دامەزرێنەری دەوڵەتی عوبەیدیەو یەکەمین حاکمیش بووە تیادا، بەخۆی لە بنچینەدا عیراقیەو لە ساڵی(٢٦٠) کۆچی لە کوفە لە دایك بووە، خۆی لە شارۆچکەی سەلیمە شاردۆتەوە، کە لە باکوری شام بنکەی ئیسماعیلیە باطنیەکانە ، هەر لەوکاتەی لە دایك بوو هەتا، کە لە سەلیمە جێگیر بوو ئەوانە بەناوی سعید بن أحمد بن محمد بن عبداللە بن میمون القداح ناسرابوو.

لە شوێنی سەلمیە بنکەی ئیسماعلیەکان علی بن الحسین بن أحمد بن محمد بن إسماعیل بن جعفر الصادق کۆچی دوایی کرد، ئیسماعیلیەکان چەند مەزارێکی نهێنیان بۆ دورت کردو، بریاریشیان دا ئیمامەتی بگوازنەوە لە نەوەی إسماعیل بن جعفر الصادق بۆ کورەکەیان بە نیکاحی روحی[3]، پاشان وتی: ئەوە ڕەچەڵەکی عبیداللە المهدی و ڕەچەڵەکی

---

١ـ بروانە: سیرأعلام النبلاء ب١٥ لا١٤١

٢ـ هەمان سەرچاوەی پێشو ب١٥ لا ١٤٢.

٣ـ تأریخ الفتح العربي في لیبیا لا ٢٥٣

ئەو عوبەیدیانەیە،کە پاڵ دەدرێنە لای.

پاش ئەوەی عبیداللە المهدی دوژمنەکانی لە ناو برد ویستی لە قەیرەوان مەزهەبەکەی بڵاوبکاتەوە، پاشان بۆ باکوری ئەفریقیاش بیبات، بەڵام دێدەوانی زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعە رێیان لێ گرت و بەرپەرچیان داوەو، خەڵکیشیان قەناعەت پێکرد بەوەی، کە دەوڵەتی عوبەیدیەکان دەوڵەتێکی کافرەو دوورە لە شەریعەتی ئیسلامی، لە نێوان عوبەیدیەکان و ئەهلی سوننە چەند شەرێکی توندو دژوار رووی دا، عبیداللە المهدی رۆیشت بو مەهدیە پاش ئەوەی، کە ماڵ و سامانێکی زۆری سەرف کرد لە دامەزاردنی، عوبەیدیەکان لە باکوری ئەفریقیا هێمنیو ئارامی لەژیانیان نەما لە بەر توندو سەختی ئەو بەرگریەی زانایانی ئەهلی سوننە پێشەوایەتیان کرد لەدژیان، شارەکان بەزەبری هێز چۆکیان دا، عبیداللە بیری کردەوە بۆ میسر بچێتو، چەند شاڵاوێکیشی بۆ برد، بەڵام بەرامبەر لەشکری عەباسیەکان دۆڕاندی ، کە مؤنس الخادم پێشەوایەتی دەکرد.

لەهەموو هێرشەکان خەتەرناکتر بۆ سەر میسر هێرشی ساڵی(٣٢١) کۆچی بوو، کە عەباسیەکان توانیان ڕای بگرن بیوەستێنن و ئەوەش بەهۆی هەوڵ و ماندووبوونی محمد الأخشیدي.[1]

عبیداللە بەردەوام بوو لە حوکم کردن هەتا، کە لە ساڵی(٣٢٢) کۆچی لە ناوچوو تەمەنی شەست و دوو ساڵ بوو دەوڵەتەکەشی بیست و پێنج ساڵ و چەند مانێگ تەمەنی بوو.

لێرەوە تێبینی دەکەین، کە هۆزی مصامید و کەتامە پشتگیری دەوڵەتی عوبەیدیان کرد، چونکە گومانیان وابوو، کە مەهدی چاوەڕوانکراوە، ئەگەر بڕوانیە مێژوی ئیسلامی دەبینێ زۆربەی شۆڕەشەکان و ئەو دەوڵەتانەی دامەزراون ئەوا پشتیان بەو جۆرە بیروباوەڕە بەستووە،بۆیە بە گرنگو باشم زانی بۆ دامەزراندنی پەرژینێکی عەقیدەیەکی ڕاست لە سەر بنچینەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بیروباوەڕی ئەهلی سوننە لەو مەسەلەیە ڕوون بکەمەوە لە مەسەلەی مەهدی چاوەڕوانکراو ، بۆ ئەوەی خەڵکی درۆزن و دەجالەکان باش بناسن، بیروباوەڕی ئەهلی سوننە لە بارەی مەهدی چاوەڕوانکراو باسی لێوە دەکەم لە

---

١ـ موسوعة المغرب العربي ب٢لا ٧٦

پاش ژیانی عبیدالله.

هەروەکو دەبینین، کە عبیدالله المهدی پشتی بەو جۆرە پڕوپاگەندەیە بەست، هەتا، کە ابو عبدالله الشیعي توانی متمانەی بەرابیرەکان لە بارەی عبیدالله بشلەژێنێ، گەورەی هۆزی کەتامە چووە لای عبیدالله و پێی وت: ئێمە گومانمان لە تۆ هەیە، بەڵگەیەکمان نیشان بدە، عبیدالله وەڵامی هەندێکیانی دایەوە، ئەویش باوەڕی پێکرد، عبیدالله وتی: ئێستا خۆ یەقینتان هات یەقینیش هەر بەیەقین لادەچێ نەك بەگومان.

مەسەلە گوماناویەکان لە بارەی مەهدی، کە ابو عبدالله الشیعي بۆ گەورە پیاوانی هۆزی کەتامە باسی لێوە دەکرد ئەوەبوو، کە وتی: ئەوشتانەی پێش ئەوەی ڕوو بدەن ئەوا ئیمام دەیانزانێ، ئێستا ئەوە بەخۆ بە دوو کوڕوە هاتۆتە ئێرە بڕیاریشی داوە، کە لە پاشە خۆی حوکم بۆ کوڕە بچوکەکەی دەبێت، کوڕەکەشی پاش ئەو قسەیە بیست ڕۆژ ژیاو پاشان مرد، کە گەورە پیاوی هۆزی کەتامە پرسیاری لە عبیدالله المهدی کرد لە بارەی ئەو منداڵە عبیدالله المهدی وتی: ئەو منداڵە نەمردوەو، وا لە بەرامبەرتە، بەڵکو ئیمامەکان خۆیان دەگوازنەوە، ئەو ڕۆیشتوە بۆ چاکسازی شوێنەکی تر، گەورەی هۆزی کتامە وتی: باوەڕم کرد.

ابو عبدالله الشیعي وتی: ئیمام ئاوریشم و زێڕ لەبەر ناکات، بەڵام ئەو لەبەریان دەکات، هەروا ناشێ لەگەڵ کەسی تر جیماع بکات تەنها لەگەڵ ئافرەتەکەی نەبێ، بەڵام ئەو جیماعی لەگەڵ ئافرەتی زیادة الله التغلبي کردوە، گەورەی هۆزی کتامە پرسیاری لەعبیدالله المهدی کرد لە بارەی ئەمە، ئەویش وەڵامی دایەوەو وتی: من جێگری شەرعم ئەوەی بمەوێ بۆ خۆمی حەلال دەکەم زیادة اللەش کابرایەکی گوناهبارو سەر پێچی کەربوو.[1]

مەبەستیشم لەنەقڵ کردنی ئەوشتانە ئەوەیە، کە درۆزن و دەجاڵەکان عەقڵ سوك و نەفامەکانیان وەك هەلێك قۆستیتەوە بۆ هەڵخەڵەتاندیان و فێڵ لێکردنیان، هەروەها پشتیان بە چەند بیروباوەڕێك بەستوە لە بارەی ئیمامەکان لە گەورەکردنی آل البیت و باوەڕکردن بە مەهدی چاوەڕوانکراو جگە لەمانەش، بۆیە شوێنەکە گەنجاوە بۆ ڕوون

---

١ــ بڕوانە: سیرأعلام النبلاء ب١٥ لا١٤٦

کردنەوەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە لە بارەی مەهدی چاوەڕوانکراو.

**تەوەرەی پێنجەم : بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەبارەی مەهدی** [1]

چەند فەرمودەیەکی ڕاستی پێغەمبەرﷺ ڕوونی ئەوەیان کردۆتەوە، کە خوای گەورەو باڵادەست لە ئاخیری زەمان پیاوێك لەآل البيت دەنرێت و ئاینی خۆی پێ بە هێز دەکات، حەوت ساڵ دەمێنێتەوەو زەوی پڕ دادگەری و ئاشتی دەکات، هەروەکو پڕی زوڵم و ستەم بوو بوو، ئوممەت لە سەردەمی ئەو نازو نیعمەتێك دەچێژی، کە قەت نەی دیوە و تامی نەکردوە، زەویش بە چرووپڕی ڕووەکی خۆی دەردێنێ و ئاسمانیش بارانی خۆی دەبارێنێ و ماڵ و سامان بێ ژمار زۆر دەبێت دەبەخشرێت.

إبن كثير رەحمەتی خوای لێبێت وتویەتی: لە سەردەمی ئەو بەروبووم زۆر دەبێت و ڕووەك ماڵ و سامان بەرفراوان دەبێت، کاربەدەستیش ڕۆڵی خۆی دەبینێت، ئاینیش جێگیرەو، دوژمنیش مل کەچ و سەرشۆڕەو، خێرو بێریش لە ڕۆژگاری ئەو بەردەوامە [2].

**ناوو کونیەکەی:**

مەهدی چاوەڕوانکراو ناوەکەی وەك ناوی پێغەمبەرەﷺ ناوی باوکیشی وەك ناوی باوکی پێغەمبەرە ﷺ، ناوەکەی محمد یان أحمدی کوڕی عبدالله یەو، لە نەوەی فاطیمەی کچی پێغەمبەرەﷺ، پاشان لە حوسەیەنی کوڕی عەلی یە.

إبن كثير رەحەتی خوای لێبێت: لە بارەی مەهدی وتویەتی: ناوی محمد بن عبدالله العلوي الفاطيمي الحسيني یە ئاکارو سیفەتەکانیشی باس کراوە، کە موی نێوچەوانی کەمەو، ئێسقانەکانی لوتی بەرزە.

**شوێنی دەرچونی:**

دەرچونی مەهدی لە لای ڕۆژ هەڵاتەوەیە، ثوبان دەلێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((يُقْتَلُ عِنْدَ كَنزِكُم ثَلاثَةٌ كُلُهم إِبْنُ خَلِيفَة، ثُمَّ تَطلَعُ الرَّاياتُ السودِ مِنْ قِبَلِ الشَرْقِ فَيَقْتُلونَكُمْ

---

١ـ ئەم باسەی مەهدی چاوەڕوانکراو هەمووم پوختو کورت کردۆتەوە لە کتێبی(أشراط الساعة) کە نامەیەکی ماجستێرە، یونس وابل نوسیویەتی.

٢ـ النهاية الفتن والملاحم ب١ لا ٣١ تحقيق د طه زيني

قَـتْلاً لَمْ يَقْتُلْـهُ قَـوْم)) واتـه: لـه‌لای خه‌زێنه‌كـه‌تان سـێ كـه‌س ده‌كـوژرێن هـه‌موویان كـوڕی خه‌لیفه‌نه، پاشان له‌لای ڕۆژهه‌ڵاتـه‌وه ئـاڵای ڕه‌ش ده‌رده‌كـه‌وێ بـه‌جۆرێك ده‌تـانكوژن، كـه هیچ قه‌ومێك ئه‌و جۆره كوشتاره‌ی نه‌كردوه.

پاشان ثوبان وتی: پێغه‌مبه‌ر ﷺ شـتێكی تـری بـاس كـرد مـن لـه بـیرم نـه‌ماوه، پاشـان فه‌رمووی: ئه‌گه‌ر بینیتان به‌یعه‌تی بده‌نێ با له سـه‌ر بـه‌فریش گاگۆڵـه‌تان كردبێـت، چـونكه ئه‌ومه‌هدییه‌و خه‌لیفه‌ی خوایه.[1]

إبـن كـثیر ره‌حمـه‌تی خـوای لێبێـت: وتویـه‌تی: مه‌به‌سـت لـه‌و خه‌زێنه‌یـه‌ی هـاتووه، ئـه‌وا خه‌زێنه‌ی كه‌عبه‌یه، سێ له كوڕانی خه‌لیفه شه‌ڕی له لا ده‌كه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی ده‌ستیان بكه‌وێ، هـه‌تا ئـاخیری زه‌مـان دێـت، ئینجـا مه‌هـدی بـه دیارده‌كـه‌وێ ده‌ركه‌وتنه‌كه‌شـی لـه لای ڕۆژ هه‌ڵاته‌وه ده‌بێت نه‌ك له سیردابی سامه‌ڕا، هه‌روه‌كو، كه رافیضة گه‌وجه‌كان گومان ده‌بـه‌ن، كه هه‌تاوه‌كو وا ئێستا له‌وێیه‌و هه‌تا ئاخیری زه‌مان چاوه‌ڕێی ده‌كه‌ن ، ئه‌مه‌ش جۆرێكـه لـه هورێنه‌و، به‌شێكی گه‌وره‌شه له سه‌رشۆڕی له لایه‌ن شه‌یتانه‌وه، ئه‌مـه‌ی، كـه ده‌یڵـێن نه‌لـه قورئان و نه‌له سـوننه‌ت نه‌لـه هـۆش و بیرێكـی تـه‌واو ڕاسـتدا نیـه‌و هـیچ به‌ڵگه‌شی له‌سـه‌ر نیـه.دوایـی إبـن كـثیر وتویـه‌تی: پاشـان مه‌هـدی پشـت گـیری لێده‌كرێ لـه لایـه‌ن خـه‌ڵكی ڕۆژهه‌ڵات، كه سه‌ری ده‌خه‌ن و ده‌یكه‌نه حـاكم وكۆڵه‌گـه‌كانی داده‌مـه‌زرێنن، ئاڵایه‌كه‌شیان ڕه‌شه‌و هه‌یبه‌ت و گه‌وره‌یی پێوه دیاره، چونكه ئاڵای پێغه‌مبه‌ری خـوا ﷺ ڕه‌ش بـوو پێـی ده‌وترا عیقاب.

هه‌ر إبن كثیر له درێژه‌ی باسه‌كه‌ی وتویه‌تی: مه‌به‌ست له‌و مه‌هدیه‌ی، كه سوپاس كـراوه‌و به‌ڵێنی پێداوه، بێت له ئاخیری زه‌ماندا ئه‌وا سه‌ره‌تای به‌دیار كـه‌وتنی لـه لای ڕۆژهه‌ڵاتـه‌وه ده‌بێت‌و، له لای كه‌عبه به‌یعه‌تی پێ ده‌درێت، هه‌روه‌ك، كه هه‌ندێك فه‌رموده به‌ڵگـه‌ده‌دا لـه سه‌ر ئه‌مه.[2]

١ـ ئیمامی بوخاری له‌صحیحه‌كه‌ی خۆیدا باسی كـردووه، كـه ابـو هـوریرة رضي الله عنه فه‌رمویـه‌تی:

---

١ـ أخرجه إبن ماجة كتاب الفتن، باب الخروج المهدي، ومستدرك الحاكم، وقال هذا حديث صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي.

٢ـ النهاية للفتن والملاحم ب١ ل٣١٧.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((كيف أنتم إذا نزل إبن مريم فيكم وإمامكم منكم)) ئێوە دەبێ چی بکەن کاتێك کوڕی مریم دادەبەزێت ئێوەش ئیمامتان هەر لە خۆتانە.[1]

٢ـ جابر رضي الله عنه وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ فەرمووی: ((لا تزال طائفة من أمتي يقاتلون على الحق ظاهرين إلى يوم القيامة)) بەر دەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتی من لە سەر حەقەو شەر دەکەن هەتا ڕۆژی دوایی.[2]

ئەو فەرمودانەی لە هەردوو صحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە بەڵگە لە سەر دووشت دەدا.

یەکەمیان: لە کاتی هاتنەخوارەوەی عیسای کوڕی مەریەم لە ئاسمان ئەوەی کار بەدەستی موسوڵمانانە پیاوێکە لە خۆیان.

دووەمیان: ئامادەبوونی ئەمیرو پێش نوێژی کردنی بۆ موسوڵمانان و داوا کردنی لە عیسا، کە بێت پێش نوێژی بکات بەڵگەیە لەسەر باشی وچاکی ئەو ئەمیرە.

چەند فەرمودەیەکی تریش لە کتێبی سونەن و مەسانیدەکان و جگە لەوانەش هاتووە، کە ڕاڤەی ئەو فەرمودانە دەکان، کە لە هەردوو صەحیحدا هاتوە بەڵگە دەدەن لەسەر ئەوەی کە، ،کە ئەو پیاوە چاکە ناوی محمد بن عبداللهو پێی دەوترێ مەهدی سوننەتیش هەندێکیان ڕوون کەرەوەنە بۆ هەندێك.

١ـ ابو سعیدالخدری وتویەتی: پێغەمبەری ﷺ فەرموی: ((مِنَّا الذي يصلي إبن مريم خَلْفَهُ)) لە ئێمەیە ئەو کەسەی عیسای کوڕی مەریم لە دوای نوێژ دەکات.[3]

٢ـ جابر وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ينزل عيسى ابن مريم فيقول أميرهم المهدي، تعال صَلِ بنا، فيقول لا، إنَّ بَعضَهم أمير بعض، تكرمة الله لهذ الأمة) عیسای کوڕی مەریم دادەبەزێت، جا ئەمیری موسڵمانان لەوکات مەهدیە دەڵێت: وەرە پێش نوێژیمان بۆ بکە، ئەویش دەڵێ: نەخێر ئێوە هەندێکتان ئەمیری هەندێکتانن، ئەوەش ڕێزو پلەو پایەی خوایە بۆ ئەو ئوممەتە.

٣ـ ابو سعید الخدری وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((المهدي مني أجلى الجبهة أقنى

---

١ـ صحيح البخاري كتاب أحاديث الأنبياء باب نزول عيسى إبن مريم ب٦ لا ٤٩١ مع الفتح.

٢ـ صحيح مسلم كتاب الأيمان، باب نزول عيسى إبن مريم ب٢ لا ١٩٣ مع شرح النووي.

٣ـ رواه أبو نعيم في(أخبار المهدي) صصحه الشيخ الألباني رحمه الله صحيح الجامع الصغير ب٥ لا ٧١٧.

الأنف، يملأ الأرض قسطاً وعدلاً، كما ملت جورا ويملك سبع سنين[1]))

مەهدی لەمنە هەندێك مووی نێوچەوانی کەمەو ئێسقانی لوتی بەرزەو زەوی پڕدەکات لە دادگەری هەروەك پێشتر پڕ ببوو لە ستەم، حەوت ساڵان دەمێنێتەوە.

**یەکەم:** فەرمودەکانی باسی مەهدی دەکەن بە ڕێگای تەواتور[2] هاتوون.

١ـ ئیمام شەوکانی وتویەتی: ئەوفەرمودانەی لەبارەی مەهدی هاتوون پەنجا فەرمودەن لە نێوان صەحیح و حەسەن و زەعیف و مونجەبیر[3] لە هەموو بوارەکان هەر موتەواتیرن هەروەك، کە لە زاراوەی ئوصولیەکان داهاتووە، سەبارەت بە وتەی هاوەڵانیش لە بارەی مەهدی ئەوا گەلێك زۆرەو، هیچ بواری ئیجتیهادی تێدانیە.[4]

٢ـ صدیق حسن خان وتویەتی: ئەو فەرمودانەی لە بارەی مەهدی هاتون بە پێی جیاوازی ڕیوایەتەکانی گەلێك زۆرن، دەگاتە پلەی تەواتوری مەعنەوی، کە لە سونەن و دەواوینی ئیسلام و مەعاجیم و مەسانیدکاندا هەیە.[5]

٣ـ شێخ محمد بن جعفر الکتانی وتویەتی: بە هەر حال ئەو فەرمودانەی لە بارەی مەهدیو دَّجَال وعیسای کوڕی مەریم هاتوون هەمووی موتەواتیرن[6].

ئەو کتێبانەی تایبەتن بە فەرمودەی پێغەمبەرﷺ وەك السنن الأربعة و مەسانیدەکان وەك موسنەدی ئەحمەد و موسنەدی بەزار و موسنەدی أبي يعلى و موسنەدی الحارث بن أبي أسامة ومستدرك الحاكم و مصنف أبي شيبة و صەحیحی إبن خزيمة و جگە لەوانەش، کە باسی مەهدیان کردوە، زانای تریش بە جیا کتێبیان داناوەو کۆمەڵێکی زۆر لەو فەرمودانەیان کۆکردۆتەوە، کە باسی مەهدی دەکەن.

**دووەم: بەرپەرچ دانەوەی ئەوانەی نکۆڵی دەکەن لەو فەرمودانەی باسی مەهدی دەکەن:**

---

١ـ سنن أبي داود، كتاب المهدي ب١١ لا ٣٧٥ الحديث رقم ٤٢٦٥

٢ـ تەواتور واتە: ئەو ڕێگایەی ئەو فەرمودانەی پێهاتووە، ئەستەمە ئەو کەسانەی گێڕاویانەتەوە کۆببنەوە لەسەر درۆو هەڵەی تێدا بکەن.

٣ـ فەرمودەی(منجبر) واتە: ئەو فەرمودەیەی بەفەرمودەیەکی تر پینە دەکرێت و پشت ڕاست دەکرێتەوە.

٤ـ التوضيع في تواتر ماجاء في المهدي المنتظر والدجال المسيح.

٥ـ الأذاعة لما كان، وما يكون بين يدي الساعة لا١١٢.

٦ـ نظم المتناثر من الحديث المتواتر لا ١٤٧.

جێگایی داخە، کە کۆمەڵێك لە نوسەران وەك شێخ محمد رشیدرضا لە تەفسیرەکەی بە ناوی مەنار وەسفی ئەو فەرمودانەی کردوە لە بارەی مەهدی بە دژیەك و بەپوچی داناون و وتویەتی، کە مەهدی تەنها ئەفسانەیەکە شیعە دایان هێناوەو پاشان چویتە کتێبەکانی ئەهلی سوننە.[1]

یەکێکی تریش، کە فەرمودەکانی مەهدی ڕەت کردۆتەوە خاوەنی دائرة معارف القرن العشرين[2] محمد فريد وجديەو ڕۆیشتوە لە سەر هەمان ڕێرەوی أحمد أمين لە کتێبەکەی بەناوی ضحى الإسلام.

وا دیاریشە، کە ئەو نوسەرانە کاریگەر بوونە بەوەی إبن خلدونی مێژوو نووس باسی کردوە لە لاواز کردنی فەرمودەکانی مەهدی، زانراویشە إبن خلدون لە سوارچاکی ئەو گۆڕەپانیە بۆ ئەوەی قسەی وەربگیرێ لە بارەی (تضعيف)و(تصحيح)کردن، لەگەڵ ئەوەش تویەتی: پاش ئەوەی چەند فەرمودەیەکی لە بارەی مەهدی هێناوەو تانەوتەشەری زۆری لە سەنەدەکان داوە، ئەوە چەمکێکە لەو فەرمودانەی باس لە مەهدی دەکەن و ئیمامەکان(تخريج) یان کردوە، کە لە ئاخیری زەمان دێت، ئەوەش وەك بینیت زۆرینەی قوتاری نابێت لەڕەخنەو تانەو تەشەردان.[3]

یوسف الوابل لە کتێبی أشراط الساعة دا وەك تەعلیقێك لە سەر قسەی إبن خلدوندا وتویەتی: ئەگەر یەك فەرموودە لەبارەی مەهدی ڕاست بێت، ئەوابەسە بۆ بەڵگە هێناوە ،چ جای ئەوەی، کە ئەو فەرمودانەی لە بارەی هاتوون ڕاستنو بەڕێگایی تەواتوروە هاتوون.[4]

شێخ أحمد شاکریش بەرپەچی إبن خلدون دەداتەوەو دەڵێت: بەڕاستی إبن خلدون باش لەوتەی فەرمودەناسەکان نەگەیشتوە، کە وتویانە الجرح مقدم على التعديل ئەگەر بگەڕابایەوە سەر وتەکانیانو تێ بگەیشتبایە، ئەوەی وتویەتی نەی دەوت ،بۆی هەیە خوێندبێتیەوەو زانیبێشی، بەڵام لە بەر ڕای سیاسی ئەو سەردەم ویستویەتی فەرمودەکانی

---

١ـ تفسيرالمنار ب٩ لا٤٩٩ـ ٥٠٤.

٢ـ دائرة معارف القرن العشرين ب١ لا ٤٨٠

٣ـ مقدمة إبن خلدون ب١ لا ٥٧٤

٤ـ أشراط الساعة للوابل لا ٢٦٧

مەهدی لاواز بکات[1]، پاشان روونی کردۆتەوە، کە ئەوەی إبن خلدون لە بارەی مەهدی نوسیویەتی پرپەتی لە هەڵەکاری لە ناوی پیاوەکانی فەرمودەو گواستنەوەی (علل)کان، من لە باتی ئەو عوزری بۆ دێنمەوە بەوەی، کە بۆی هەیە خەتایەکە هی لە بەرگرەوەکان بێت و راست کەرەوەکانیش(المصحیحن) کەم تەرخەمیان تێدا کردبێت.

ئەوەی محمد رشید رضا و إبن خلدون و محمد فرید خوا لێیان رازی بێت بۆی چوونە راست نیە، بەڵکو بەڵگەیە ئەوەیە کە لەقورئان و سوننەتدا بێت، ئەو ریوایەتانەی لەهاتنی مەهدی دا هاتوە راستن وتەواتوری مەعنەوین، ئەمەش کافیە، سەبارەت بەوەش، کە هەندێك ئیسرائیلیات تێکەڵ بە هەندێك فەرمودە بووەو، هەندێکیش شیعە توندڕەوەکان دروستیان کردوە ئەوە راستە، بەڵام پێشەوایانی فەرموودە ئەوەی راستە، جیایان کردۆتەوە لەلاوازو هەڵبەستراو کتێبی تایبەتیشیان داناوە لە بارەی فەرموودە هەڵبەستراوەکانو روون کردنەوەی ریوایەتە لاوازەکان و چەند بنەمایەکی وردیشیان داناوە بۆ حوکم کردن لە سەر ئەو پیاوانەی گێراویانەتەوە، هەتا کەس نەماوە لە خاوەنی بیدعەو درۆزن ئیللا بەدیاریان خستوە، خوای گەورە سوننەتی پاراستوە لەگاڵتەچی و بیدعەچی و لادەرەکان و بودەڵەکان، ئەوەش یەکێکە لە پارستنی خوا بۆ ئەم ئایینە.

ئەگەر ریوایەتی هەڵبەستراو هەبێت لە بارەی مەهدی وەك دەمارگیرەیەك ئەوە وامان لێناکات ئەو ریوایەتە راستانەی لەبارەی هاتوون وازی لێبێنن، چونکە ریوایەتە راستەکان باسی سیفەت و ناوی خۆی و باوکی کردوە، ئەگەر بێت و پیاوێك کەسێکی دەست نیشان کردو گومانی برد، کە مەهدیە بێ ئەوەی فەرمودەیەکی راست پشتی بگرێت، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ ئینکاری مەهدی بکەین، کە بە فەرمودەی راست جێگیر بووە، پاشان مەهدی راستەقینە پێویست ناکات کەس پروپاگەندەی بۆ بکات، بەڵکو خوای گەورە کەی ویستی لەسەربێت بۆ خەڵکی بە دیاری دێخێ و خەڵکیش بەو نیشانانە دەیناسنەوە، کە لە فەرموودەی راست و رەواندا هاتووە.

سەبارەت بەو ریوایەتانەی دژیەکن و یەك ناگرنەوە ئەوا لەو فەرمودانەدایە، کە راست

---

[1] ـ تعلیق أحمد شاکر علی مسندأحمد ب٥ لا ١٩٧ـ ١٩٨.

نینه، بەڵام فەرمودە ڕاستەکان سوپاس بۆ خوا هیچ دژیەکێکی تێدانیە.

هەروەها ئەو خیلافەی شیعە، کە لەگەڵ ئەهلی سوننە هەیانە هیچ حیسابی بۆ ناکرێ، بەڵکو حوکمی دادگەر هی قورئانو سوننەتی ڕاستی پێغەمبەرە ﷺ، سەبارەت بە شتە پڕوپوچەکانی شیعەو ئەفسانەکانیان ئەوا ناکرێ ببێتە کۆڵەگەیەك بۆ ڕەت کردنەوەی ئەو فەرمودە ڕاستانەی لە پێغەمبەرەوە دەرچوە.[1]

زنای پایە بەرز إبن القیم لە میانی باس کردنی مەهدی وتویەتی: سەبارەت بە(رافضة) ئیمامیەکان، ئەوە قسەیەکی تریان هەیەو دەڵێن: مەهدی ناوی محمدی کوڕی حسن العسکرییەو، یەکێکە لە کوڕانی حسین بن علی نەوەك کوڕی حەسەن، کە باوڕیان وایە لە هەموو شوێنێك بوونی هەیەو لە بەر چاوان بزرەو، حوکم دەگرێتە دەست، نزیکەی پێنج سەد ساڵە بە منداڵی چۆتە ناو سیردابی سامەڕا ، لە پاش ئەوە هیچ چاوێك نەیبینیوەو، نەزانراوەش هیچ هەواڵ و دەنگ و باسی هەبێت، کە تا ئێستا و هەموو ڕۆژ چاوەڕوانینە،کە ڕادەوەستن بە سواری ولاغ لە بەردەرگای سیرداب و هاواردەکەن، بێتەدەر بۆیان و دەڵێن: گەورەمان وەرە دەرێ! پاشان بە نائومێدیەوە دەگەڕێنەوە، ئەوە پیشەوکاری هەردووکیانە، بەڕاستی ئەوکەسە ڕاستی وتوە،کە دەڵێ:

| ما آن للسرداب أن يلد الذي | كلمتموه بجهلكم ماآنا؟ |
| --- | --- |
| فعلى عقولكم العفاء فإنكم | ثلثتم العنقاء، والغيلانا |

بەڕاستی ئەوانە بووینە جێگای عەیب وشەرمەزاری بۆ نەوەکانی ئادەمو هەروا بووینە جێگای گاڵتەوگەپو هەموو خاوەن هۆش و بیرێك گەمەیان پێدەکات.[2]

تا ئێرە با بەس بێت لە بارەی ڕوون کردنەوەو باس کردنی مەهدی لە لای ئەهلی سوننە و جەماعە، بەمە بۆ خوێنەری بەڕێز ئەو تەرازوە ڕاستە ڕوون دەبێتەوە بۆ هەرکەسێك ،کە بانگەشەی مەهدی بکات.

یەکێك لە هۆکارەکانی ئەو نەگبەتە گەورەیەی، کە ڕوویدا لە هۆزەکانی باکوری ئەفریقی ئەوەبوو، کە نەفام بوون بەڕاستی ئەو شتانەی وەرگیرابوون لە قورئان و سوننەت، هەر

1ـ بڕوانە: أشراط الساعة، لا٢٦٧.

2ـ بڕوانە: المنار المنيف لا ١٥٢ـ ١٥٣

بۆیە بۆ ابو عبداللە الشیعی ئاسان بوو هۆزی کەتامە گۆش بکات بە بیروباوەڕی گەندەڵی رافیزە باطنیەکان.

## تەوەرەی یەکەم: شۆڕشی هۆزی هەوارە لە تەرابلس:

پاش ئەوەی عبیداللە المهدی تەرابلسی داگیر کرد دەست نیشانی(ماکنون بن ضبارة اللحیاني الكتامي) کرد بۆ ئەوەی ببێتە والی ئەوێ، جا هۆزی هەوارە لەبەر نەبوونی بارودۆخێکی گونجاو شۆڕشیان دژی والی تەرابلس کردو هەوڵیشیاندا ئەو هەڵە بقۆزنەوە، چونکە کاروباری وڵات لە باکوری ئەفریقا هێشتا نەکەوتبوە سەر پێی خۆی.

چەند هۆزێکی تریش وەك زناتەو لەمایەو جگە لەوانەش لە هۆزە بەربەریەکان هاتنە تەك ریزی هۆزی هەوارە ، ئەو شۆڕەش لەتەرابلس، کە هەڵگیرسا ئەوا بە سەرۆکەیاتی ابو هارون الهواري بوو،کە توانیان تەرابلس ئابلۆقە بدەن و ماکنونیش لە قەڵایەکانی شارکەی خۆی حەشاردا.

عبیداللە المهدی بەلەشکرێك کە سەرکردەکەی تمام بن معارك بوو برازای ماکنۆن بوو بەهانای هات.

عبیداللە المهدی ئاماژەی بۆ ماکنون بن ضبارة کرد بۆ لە ناو بردنی تمام بن معارك بە گومانی ئەوەی پیلان لەدژی دەگێرێ، ماکنون لە مانگی(ذي الحجة) لە ساڵی ۲۹۸ کۆچی تەمامی برازای کوشت بەم جۆرە ماکنون هەستی بە ئارامی و هۆگری کردو تەمەنی درێژ بوو لە حوکم و رێگاشی بە پیاوانی گەلەکەی خۆی دا بۆ دەست درێژی کردنە سەر ماڵ و ناموسی خەڵك و خۆ هەڵقوتاندن لە کاروباریان، ئەهلی تەرابلس لە دژی وەستان و لە ساڵی (۳۰۰)ی کۆچی شاربەدەریان کرد، ئەویش چووە لای مەهدی لە شوێنێك بە ناوی رقادة ئەهلی تەرابلس ئەوانەی دارو دەستەی ماکنون الكتامي بوون هەموویان کوشتن و لە ناویان بردن، دەرگای قەڵای شارەکەشیان داخست، عبیداللە المهدی سوپایەکی لە دەریاوە بۆ ناردن ، بەڵام سوپای دەریایی تەرابلسیەکان توانی هی ئەوان بسوتێنێ، ئەم جارە عبیداللە المهدی سوپایەکی پیادەی سەرسەختی ئامادەکرد بە سەرۆکایەتی قاسمی کوری لەرێگا هۆزی هەوارە لێی هاتنە دەستان، بەڵام توانی بیان بەزێنێ و بگاتە قەڵای شارەکەو ئابلۆقەشی هاوێشتنە سەرێ هەتا ئەوەی لە رزق و زەخیرە هەبوو، کۆتای پێهاتو، وایان لێهات لە برسێتیان گۆشتی مرداریان دەخوارد، چیتر إبن إسحاق نەی توانی بەرگری بکات،

گەورە پیاوانی تەرابلس هەستان دانوستانیان لە گەڵ ابو قاسم الشیعي كردو داوای سەلامەتیان لێكرد، ئەویش رازی بوو بە مەرجی ئەوەی محمدبن إسحاق ومحمد بن نصرو پیاوێكی تریش بە ناوی حەوحەحەی تەسلیم بكەن، ئەوانیش ئەوسێ پیاوەیان تەسلیم كرد، ابو قاسم الشیعي چووە ناو تەرابلس و خەڵككەی تووشی باجێك كرد،كە ئەندازەكەی سێ سەد هەزار دینار بوو، توانیشی كۆتایی بە ئەغالیبەكان بێنێ بەگومانی ئەوەی ئەوان ئەو فیتنەیان هەڵگیرساند.

ئەوەی سەرپەرشتی خەزێنەی باجەكەشی دەكرد پیاوێك بوو بەناوی خلیل بن إسحاق، كە لە كورانی سەربازی تەرابلس بوو، هەر ئەو پیاوە لە سەردەمی عوبەیدیەكان بینای مزگەوتی تەرابلسی گەورەی تەواو كردو بینای منارەكەشی كرد، پاشان لە سەر دەستی إبن كیداد الیفرني كوژرا كاتێك دەستی گرت بەسەر قەیرەوان لە ساڵی (٣٢٢) كۆچی.

پاشان، كە هێمنی و ئارامیو بەر قەرار بوو لە تەرابلس ابوقاسم چووە رەقادەو ئەو سێ پیاوەی تەسلیمی كرابوون وەك سوكایەتیەك گێڕانی بەناو شەقامەكانی قەیرەوان ، پاشانیش لە ناوی بردن.[1]

لەو شۆڕشە سەرەتایەی دژی عوبەیدیەكان وا ڕۆن دەبێتەوە، كە خەڵكی تەرابلس حەزیان بە حوكمی عوبەیدیەكان نەكرد، بەڵام بە زەبری هێز بەسەریاندا سەپاندن.

كتێبەكانی مێژووش جەخت لە سەر ڕۆڵی زاناو شەرع زانەكان دەكەنەوە لە مەڕ تێكۆشانیان بۆ ڕوو بەڕوو بونەوەی فیكری شیعی و شەپۆلی رفضو بیروباوەڕی باطیني، كە دەوڵەتی بني عوبەید گرتیە ئەستۆی خۆی بۆ ئەوەی لە باكوری ئەفریقا بڵاویان بكاتەوە.

### تەوەرەی دووەم :خشانی عوبەیدیەكان بۆ بەرقە

كاتێك بارودۆخی تەرابلس هێمنی و ئاسایشی بە خۆیەوە بینی عبیداللە المهدی سەربازەكانی خۆی بەرەو بەرقە برد بە سەركردایەتی حسبة بن یوسف الكتامي ئەو پیاوە زۆر توند بوو سۆزو بەزەیی لە دڵیدا نەبوو، لە ساڵی (٣٠١) كۆچی بەرەو شوێنی سەرت ڕۆیی، چونكە هێشتا لە ژێر حوكمی ئەغالیبەكان بوو، بەبێ شەڕ چووە ناویەوەو هەرچی لە

---

١ـ بڕوانە: تأريخ الفتح العربي في ليبيا لا ٢٤٦ـ ٢٤٧

عەبباسیەکان و ئەغالیبەکان هەبوو دەریکردن، خەڵکی شارەکە داوای ئەمانیان لێکرد، ئەویش ئەمانی دانێ و بەبێ شەڕ چووە ناوییەوە، دواتر شاری بەرقەشی داگیر کردو سەربازی عوبەیدیەکانیش بەرەبەرەو بەبێ پچران بەرەولای حەباسە دەهاتن.

ئەو حەباسەیە هیچ بەڵێنێکی خۆی بە جێ نەدەگەیاند، هەرکاتێك شوێنێکی داگیر بکردایە خەڵکەکەی دەکوشت و ماڵەکەی دەبردن و ئافرەتەکانیانی بۆ خۆی حەڵاڵ دەکرد، یەکێك لە کردەوە بەدەکانی، کە کتێبەکانی مێژوو باسیان لێوە کردوە ئەوەیە، کە رۆژێکیان کۆمەڵێك خەڵك لە بەرقە یاریان بە کۆتر دەکرد ئەویش فەرمانی کرد بیان هێنن و پاشان دانیشاندن لە دەوری ئاگر، ئەنجا فەرمانی کرد پارچە پارچە گۆشتیان لێبکەنەوە و بە ئاگرەکەش بیبرژێنن، دواتر فەرمانی کرد فڕێیان بدەنە ناو ئاگرەکە، بەڕاستی ئەو کردەوە وەحشیگەریانە بەڵگەیە لەسەر دژایەتی عوبەیدیەکان بۆ هەر کەسێك بۆنی سوننی لێوە بێ، بەڵکو بە بیرکردنەوە سەقەت و پوچەکەیان خۆیان بەوکردەوانە لە خوا نزیك دەکەنەوە.

یەکێکی تر لە کردەوە قێزەونەکانی ئەوە بوو، کە لە بەرقە ڕای گەیاند ، ئەوەی دەیەوێ بەخشیش لە ئێمەوە وەربگرێ بابێت، بۆیەیانی هەزار پیاو هاتن، ئەویش فەرمانی کرد هەموویان بکوژن، پاشان تەرمەکانیان هەموو لەسەر یەك دانا، پاشان فەرمانی کرد کورسیەك بێنن و کورسیەکەی لە سەر تەرمەکان داناو لە سەری دانیشت، پاشان فەرمانی کرد پیاو ماقوڵانی شارەکە بێنە لای، کە هاتن بەندی کردن و ئیهانەی کردن، هەندێکیان هەر لەبەر تەماشا کردنی ئەو دیمەنە ترسناکانە مردن، پاشان پێی وتن: ئەگەر بەیانی سەد هەزار میسقاڵ زێڕم بۆ نەهێنن هەمووتان دەکوژم، ئەوانیش بۆیان هێنا.

یەکێکی تریش لە کردەوە بەدەکانی ئەوبوو، کە تۆڵەی سەندەوە لەحارث و نزار، کە کوڕی جمال المزاتي بوون بە یارمەتی چەند کەسێك لەبەرقە ، کە هەر ئامۆزای خۆیان بوون هەروەها ئافرەتەکانی فرۆشتن و ماڵ و سامانیانیشی بەتاڵان بردن، خەڵکی بەرقە بەو کردەوە قێزەونانە زۆر غەمبار بوون بۆیە عبیدالله المهدی یان لەو مەسەلەیە ئاگادار کردەوە، بەڵام ئەو نەفرەتیە سوێندی بە درۆ خوارد، کە هیچ کارێکی لەوانەی درایتە پاڵی

نەیكردوە، پاشان نامەیەكی بۆ نووسی بۆئەوەی بەرقە جێ بهێڵێتو بەرەو میسر بڕوات، لە میسریش كاری زۆر درێوتری كرد.[1]

لە ساڵی(٣٠٢)ی كۆچی لەشكرتاریەتی ابو القاسم هێرشی برد بۆ ئەسكەندەریە، بەلام ئەوەی ویستی بۆی نەهاتەدیو بەمل شۆڕی و سەر شۆڕی گەڕایەوە، ابوالقاسم پارچە هۆنراوەیەكی نارد بۆ بەغدا لە نێویدا شانازی كردبوو بەو موڵكەی، دەسەلاتیان گەیشتبوێ صولی شاعیریش بەهەمان وەزن و قافیەی هۆنراوەكەی بە بەرپەرچی دایەوە:

فَلوْ كانَتِ الدُّنيا مِثالاً لطائرٍ          لَكَانَ لَكُم مِنْهَا بما حذتم الذَنَبَ

واتە: ئەگەر دونیا بە باڵندەیەك بچوێنین ئەوا ئێوە تەنها كلكەكەتان بەدەست كەوتووە.

ابو القاسم لەو دێرە هۆنراوەیە زۆر تورەبوو وتی: وەلاهی ئەوەندەی پێم بكرێ دەبێ سینگی باڵندەكە بەدەست بێنم، یان لە پێناویدا سەرم دادەنێنم.[2]

## شۆڕشی خەڵكی بەرقە لە دژی عوبەیدیەكان:

هەر لە ساڵی(٣٠٢)كۆچی خەڵكی بەرقە تۆڵەیان لە عوبەیدیەكان سەندەوەو كارگێڕەكەیان و زۆربەی پیاوانی هۆزی كەتامەیان كوشت، عبیدالله المهدیش لە ساڵی (٣٠٣) كۆچی سەربازی خۆی نارد بۆ ئاقڵ كردنیان و تۆڵەسەندەوە لێیان، رابەرایەتی كردنی ئەو سوپایەش پیاوێك بوو ناوی ابومدینی إبن فروخ اللهیفي بوو، كە ماوەی هەژدە مانگ ئابلۆقەی بەرقەی دا، پاشان لە ساڵی(٣٠٤) كۆچی بەبێ شەڕ چووە ناویو زۆربەی خەڵكی ناوچەكەشی كوشت و خانووەكانیانی سوتاندن و ناموس و شەرەفی ئافرەتەكانی هەتك كردو دیلەكانیشی ڕەوانەی لای عبیدالله المهدی كرد بۆ ئەوەی لە ناویان ببات، ابو مدینی هەر لە بەرقە مایەوە هەتا، كە لە ساڵی (٣٠٦) كۆچی تێیدا مرد.[3]

لەساڵی (٣٠٤) كۆچی عوبەیدیەكان بەشەڕ هاتن لەگەڵ خەڵكی صقلیة هەروەها لە ساڵی(٣٠٦) كۆچی لە مانگی (ذي القعدة) میسریان داگیردو دەستیشیان بەسەر أسكندرية و زۆربەی صەعیدا گرت ، بەلام تێیدا جێگیر نەبوون و گەڕانەوە.

---

١ـ بڕوانە: تأريخ الفتح العربي في ليبيا لا ٢٤٧

٢ـ بڕوانە: تأريخ الفتح العربي في ليبيا لا ٢٤٧

٣ـ بڕوانە: هەمان سەرچاوە لا ٢٤٨.

لەساڵی(٣٠٨) کۆچی بینای مەهدیە تەواو بوو عبیداللە المهدی چووە ناوی، لە ساڵی (٣١٠)ی کۆچی نەفوسە شۆرشیان بەرپاکرد دژی عبیداللە جا لە لەشکرەکە پیاوێکیان ناردە پێشەوە بەناوی أبابطة ، کە بەم بەم کەڵە پیاوە بەهێزە پشت قایم تربوون مەزهەبەکەشیان أباضي بوو، عبیداللە المهدیش سوپایەکی نارد بەسەرکردایەتی علي بن سلیمان الداعي بەڵام سوپای عوبەیدیەکان تێك شکاو عەلیش بەرەو تەرابلس ڕای کرد ، پاشان جارێکی تریش هەڵی کوتایەوە سەر نەفوسەو ئابلۆقەی دا.

لە تەرابلس محمد بن عمر النفطي بە قازی دەست نیشان کرا، دەوڵەتی عوبەیدیەکان لەژێر حوکمی عبیداللە المهدی توانی هەر خۆی بەتەنێ و بەزەبری چەك بەسەر ئەفریقاو تەرابلس و بەرقە و دورگەی صقلیة زاڵ ببێ.

## تەوەرەی سێ یەم :دەرچوونی أبي یزید الخارجي لەدژی عوبەیدیەکان

ابو یزید ناوی مخلد بن کیداد الیفرني بن سعد اللە بن مغیث بن کرمان بن مخلد بن عثمان بن یفرن، (یفرن)یش برای، (مغراو)ە، کە هۆزی (مغراوة)ی دەدرێتە پالی، دایکیشی ناوی سیکەیە، کە شوینێکە لە وڵاتی سودان، کە باوکی هاموشۆی ئەو شوێنەی دەکردو، دواتر کردیە کەنیزەیەك بۆ خۆی.[1]

ابوزید زۆر بە هەژاری گوزەرانی بەسەر برد، مەزهەبی خەواریجەکانی لەناو مەزهەبەکان هەڵبژاردو لە سەر دەستی نەکارایەکان[2] فێرە زانست بوو، یەکەم جا ابو یزید بوو بە مامۆستای لە بەرکردنی قورئانی پیرۆزو زۆربەی کاتەکانی لە زانست و زانیاری بەسەر دەبرد ، سەرەتا ابو یزید خۆی بەپیاوێکی دونیا نەویست نیشان دا، کە بە سواری گوێ درێژێك دەگەڕا لە نێوان هۆزە شاخاویەکانو نازناوی بەخاوەنی گوێدرێژ (صاحب الحمار) دەرکرد، هەندێك لە کتێبەکانی مێژوو باس لەوە دەکەن ، کە کاتێك سەرکردایەتی شۆرشی دژی عوبەیدیەکان کرد، تەمەنی لە نەوەدەکان بوو، ابو یزید هەڵی دوژمنایەتی نێوان زەناتە و عوبەیدیەکانی قۆستەوەو هەروەها ئەوستەمەشیان قۆستەوە،کە دەوڵەتی رەوافیضەکان ئەنجامیان دەدا لە وەرگرتنی باج هەتا ئەغالییەکان لەو ستەمە بەئاگاهاتنەوە، دژایەتی

---

١ـ بروانە: تأریخ الفتح العربي في لیبیا لا ٢٤٨

٢ـ سەرچاوەی پێشوو لا ٢٤٩.

بەرابیرەکانیش زیادی کرد، پاش ئەوەی رەوافیضەکان لە سەر مینبەرو یانەو بازنەکانی وانە وتنەوەو وتاری هەینی دژایەتی خۆیان ڕاگەیاند بەرامبەر بە ئەبوبەکر و عومەر، لێرە ابو یزید دەستی کرد بە ئامادەکردنی کەرستە لە ناوچەی جەریدو باکوری ئەفریقیاشی بە چەند جەنگێکی خوێناوی سەرقاڵکرد، سەرەتای شۆڕشەکەشی لە تەرابلس بوو، کە بەرابیرەکان لە بەر ستەمی محمد بن عبیدالله المهدي بۆ ئەهلی سوننەو سزاو ئەشکەنجەدانیان زۆریان شوێنی کەوتن ، زانایانی ئەهلی سوننە لە دژی عوبەیدەیەکان وایان بە باش زانی بچنە پاڵ ابویزیدو وتیان: هەر هیچ نەبێت ابو یزیدو هاوەڵانی ئەهلی قیلبەن، بەڵام ئەوان ئەهلی قیبلە نین و دارو دەستەی دوژمانی خودان[1]، ابو یزید ناوی لە خۆی نا شێخی باوەڕداران و لەناو دڵیدا زۆر رقن بوو بەرامبەر ئەهلی سوننە، بەڵام دەیشاردەوەو ئاشکرای نە دەکرد، چونکە یەکێك بوو لە نەکاریەکان [2] کە ماڵ و سامان و ئافرەتی ئەهلی سوننەی بەحەڵاڵ دەزانی، ابو یزید ڕق و قینی ئەهلی سوننەی قۆستەوە، کە بەرامبەر عبیدالله المهدی هەیان بوو، بیروباوەڕی خۆشی لێ شاردنەوە و دۆستایەتی خۆی بۆ نیشاندان، کاتێك دەستی خۆی دیت و بەهێز بوو، کەوتە گیان ئەهلی سوننە و ڕێی دا بە عبیدالله المهدي بۆ ئەوەی بیان کوژێ و ئافرەتەکانیان حەڵاڵ بکات و ماڵەکانیشیان بەتاڵان ببات، ابو یزید ئەگەر لە بەر ترسی ئەوە نەبوایە، کە گوایە خەلیفەو دارودەستەکەی خۆی دەکوژێ و نەوەك خەڵکی لێی دوربکەونەوە ئەوا ستەمی سەیر سەیری بەرامبەر ئەهلی سوننە دەکرد.

بەڵام لەگەڵ ئەوەش ڕیسوا بوو، خەڵکی لە چوارچێوەی نەمان، ئەو ابو یزیدە کابرایەکی زۆر دڵ ڕەق و عینادو دزێو بوو، شیخ الطاهر الزاوي وتویەتی: کردەوەکانی نیشانەن لە سەر ڕەت کردنەوەی بۆ دینەکان و هەروەها ڕێزنەگرتنی بۆ ماف مرۆڤ، کە چووە ناو قەیرەوان، پاش تێك دان و خاپورکردنی هەڵسا بە کوشتنی پیاوەکان و حەڵاڵ کردنی ئافرەتەکانیان وهەتك کردنی عەورەتیان، هەروەها زگی دووگیانەکانی هەڵدڕیو، خەڵکیش بەپێی خواسیو ڕوتو ڕەجالی بەرەو قەیرەوان ڕایان کرد، کە زۆریان لەبەر برسیەتی و

١ــ سیر أعلام النبلاء ب١٥ لا١٥٥

٢ــ نکاری گروپێکە لە گروپەکانی خەواریج

تینوەتی مردن، هەندێك كەس گلەیی و گازەندەیان لە لاكرد لەوەی بەسەر وڵاتدا هاتووە لە وێران بوون و گەندەڵی،ئەویش بەگاڵتەو گەپەوە وتی: ئەی چ دەڵێن، ئەگەر مەككەو بیت المقدسم وێران كرد.[1]

بەم شێوەیە، ئەگەر بیروباوەڕی ڕاست ون بوو تێگەیشتنی ڕاست نەماو ڕێبازی خوا كاری پێنەكرا ئەوا مرۆڤ دەبێتە ئاژەڵێكی درەندە، چونكە ڕێبازێك نیە لە سەری براو عەقڵێك نیە، بیگەڕێنێتەوەو شەرعێك نیە ئاڕاستەی بكات.

بەڕاستی بیروباوەڕە گەندەكەی ابو یزید الخارجي وای لێكرد ببێتە زۆردارێكی كەلەڕق و تێكدەر، كە هیچ پەیمان و بەلێنێكی بۆكەس لە لانەبوو، ئەمەش بەڵگەیە لە سەر كوژانەوەی فیطرە و، نوقم بوونی لە قوڕو لیتەی زۆرلكاوە بۆگەنەكانو دوور لە ڕووناكی هەر دوو وەحی، كە كتابی خواو سوننەتی پێغەمبەرن ﷺ.

عوبەیدیەكان لە سەردەمی محمد المهدي كە نازناوی مەنصور بوو،توانیان كۆتایی بە شۆڕشەكەی ابوزید بهێنن ، مەنصور توانی زەرەرێكی ئێجگار كوشندە لە ماڵ و سامان و پیاوەكانی بدات، هەر بەوەش ڕانەوەستا، بەڵكو پاش ماندوبوونێكی زۆر توانی لێی بدات و بریندار بكات، جا هەر بەهۆی برینەكەی گیانی لە دەست داو، مەنصوریش پێستەكەی كەوڵ كردو پڕی كرد لە كاو پاشان لە خاچیدا.[2]

عوبەیدەیەكان لەو مەوقیفە چەند دێرە هۆنراوەكیان ڕێكخست، ڕێكخەرەكەش علي بن محمد الأيادي بوو، كە دەڵێ:

فأرتقى الملعون من خيقته — في ذرى أعيط عال مصعد

في ذرى حلقاء ملساء على — ذالك المعقل ليست ليصد

معتقل من فوقه الله ومن — تحته المنصور في جيش معد

فأرتقى المنصور بالسيف له — يوم طعن كشآبيب البرد

فاذامخلدفي كف الرَّدى — موثق الجيد بحبل من مسد

فأبى الله سوى إعاجاله — وعذاب الله للجسم أهد

---

١ـ بروانە: تأريخ الفتح العربي في ليبيا لا ٢٥١

٢ـ سير أعلام النبلاء ب١٥ لا ١٥٧.

| | |
|---|---|
| فنفى عنه أيرٍ ما دنسا | كان قد أسرف فيه ومرد |
| كأديم التيس لما لم يطب | ريحه جرد منه فانجرد |
| وحشاه سالخوه سعفاً | ماليا ما بين كعب وكند |
| ثم أقاه على مستحصد | باسق أجرد مافيه أود |

ئینجا ابو یزید هەر بەخاچ کراوی مایەوە هەتا لە شی پارچە پارچە بوو با بردی، ئەمەش لە مانگی(محرم)ی ساڵی(٣٣٦) کۆچی بوو، لە دوای خۆی کورەکەی درێژەی بە شۆڕشەکەدا بۆ تۆڵە سەندنەوەی باوکی، بەڵام مەنصور یەکێك لە سەرکردەکانی خۆی بۆ نارد، کە زیری بن مناد بوو، کە توانی لە ناوی ببات،[1] بەم جۆرە کاروباری ابو یزید وکورەکەی کۆتایی پێهات.

بەڕاستی شۆڕشەکەی ابو یزید خاوەنی پلانێکی روون و ئاشکرانە بوو، هیچ ئامانجێکیشی نەبوو بۆ دروست کردنی دەوڵەت، بەڵکو ئەو توانی زەرەرێکی زۆر و زەبرێکی کوشندە لە عوبەیدیەکان بداتو، توانی لە مەهدیە ئابلۆقەیان بدات مولکیان لێ بسەنتەوەو ، زۆر بەخراپی دەرهەق هۆزەکان مامەلەی کرد بۆیە متمانەی لە دەست داو کەس لەدەوروبەری نەما، ئەوەی دەدەردەکەوێ لە شۆڕەشەکەی ئەوا تۆڵەسەندنەوەو ڕشتنی خوێنە بەرامبەر نەیارەکانی، کە بە ڕێگایەکی وەحشی گەریانەو دڵ ڕەقانە بەردەبووە گیانی نەیارەکانی، ئەمەش نیشانەی دڵ ڕەقی ئەو کابرایە دەنوێنێ، ئەو شۆڕشە ئاگرینە چواردە ساڵی خایاند، کە دەوڵەتی عوبەیدیەکان پێیەوە سەرقاڵ بوون.

ئەوەش بۆی هەیە سوننەتێکی خوا بێت لە زاڵ بوونی هەندێك ستەم کار بەسەر هەندێکی تر، کە لە شوێن کەوتوانی هەردوولا هەزارەها کەس بوونە قوربانی، کە بەم هۆیەوە هێمنی و بەرقەراری و ئاسایش لە باکوری ئەفریقی نەما.

---

١ـ بڕوانە: تأريخ الفتح العربي في ليبيا لا ٢٥١

## تەوەرەی چوارەم : خەلیفەی دووەمی رافیضی القائم بأمرالله ابوالقاسم نزار بن عبیدالله ٣٢٢ـ ٣٣٤ـھ ـ ٩٣٤ـ ٩٤٥ز

ناوی ابو القاسمی محمد بن عبیدالله المهدیـه، لـه سـالّی ٢٧٨ کۆچـی لـه سـلیمة لـه دایـك بووە، لە سالّی ٣٢٢کۆچی وەك خەلیفەیەکی رافیضي بەیعەتیان پێدا.

ابو القاسم پیـاوێکی ئـازاو بـەترس بـوو، زۆر ڕشـتو بـەخیل بـوو ، خـاوەن بیروبـاوڕێکی گەندەیش بوو، لـە سـالّی ٣٠٢ کۆچـی ابـو یزیـد مخلـد بـن کیـداد البربـري دژی وەسـتا، لـە نێوانیاندا شـەڕێکی زۆر هەلگیرسـا، کـە مخلـد تـوانی لـە مەهدیـە ئابلوقـەی بـدات و تـەنگی پێهەلّچـنێ و ولّاتەکـەی داگیربکـات، پاشـان ابـو القاسـم خـەرفاو عـەقلّی لەدەسـتدا، کـە شـەیتانێکو زەنـدیقێکی زۆر بـەدبوو بـوو بـە ئاشـکرا جنێـوی بـە پێغەمبـەران دەدا، بـە شوێنکەوەکانی دەوت: إلعنوا الغار وما حوى واتە: لەعنەت بکەن لە ئەشکەوت و ئـەوەی لـە نێوی دایە، کە مەبەستیان لە پێغەمبەرو ئەبوبەکری ڕاست گۆیە.

پاشان زۆر لە زانایانی لە ناو بردو، لەگەلّ قەرامیتەکانی بەحرێنیش ڕێککەوت و فـەرمانی پێکردن بە سوتاندنی قورئان و مزگەوتەکان.

ابویزیـد الخـارجي کوفرەکـانی ابـو القـاسمی وەك هـەلێك قۆسـتەوەو هەلّسـا بەهانـدنی أباضیةکانی مەغریب و لەگەلّ هەندێك لە هۆزەکانو زانایان و خواناسـەکانی قەیرەوان،هـەتا نزیك بوو مەغریب هەموو بکەوێتە ژێر چنگی، ابو یزید ئالّای لیوایەکانیشی لـە لای مزگـەوتی قەیرەوەان جێگیر کردبوو ببوو لە سەری نوسرابوو لا إله إلا الله لاحکم إلا لله دوو ئـالّای تـری زەردیش لە سەری نوسرابوو نصر من الله وفتح قریب، ئالّایەکی تایبەت بە خۆشی هەبوو لە سەری نوسرابوو: اللهم أنصر ولیك على مَنْ سَبَّ نَبِیّكَ.[1]

ابوالقاسم العبیدی بە ئاشکرا جنێوی بە هاوەلّـە بـەڕێزەکان دەداو تانـەو تەشـەریشی لـە پێغەمبـەر دەدا، هـەتا فـەرمانی کـرد لەسـەر حـانوت و خواردنگـەکان کەللـەی بەرانـەکان هەلّبواسنو، لە سەریشی نوسـرابوو ئەمـە کەللـەی هاوەلّانـە، بـەهۆی کـوفرو زێـدە ڕۆییـان شاعیرێك لە بارەی بنی عوبید وتویەتی:

---

١ـ سیر أعلام النبلاء ب١٥ لا ١٥٢ـ ١٥٦.

الماكر الغادر الغاوي لشيعته    شَرُّ الذنادقة من صحب وتباع

العابدين إذا عجلا يخاطبهم    بسحر هاورت من كفر وإبداع

لو قيل للروم أنتم مثلهم لبكوا    أو لليهود لسدوا صمخ أسماع[1]

## تەوەرەی پێنجەم: خەلیفەی سێیەمی رافیضي لە باكوری ئەفریقیا المنصور بن نصرالله ابو طاهر إسماعیل

### ٣٣٤ ك ـ ٣٤١ك ـ ٩٤٥ز ـ ٩٤٦ز

ناوی ابو الطاهر إسماعیل بن القائم المهدي العبیدي الباطني صاحب المغرب، ابوالطاهر لە پاش باوكی بوو بە خەلیفەی رەوافیزەكان، لە سەردەمی خۆی توانی كۆتایی بە شۆڕشەكەی ابو یزید الخارجي النكاري بهێنێت.

پێشەوا ذهبي لە بارەیەوە وتویەتی: پیاوێكی زۆر ئازاو بە جەرگ بووەو قسەزان و ڕەوان بێژبووە، بەگشتی ئیسلامەتی پێوە دیاربووە جیاواز لەباوكە زەندیقەكەی.

هەروەها ذهبي باسی لە هەندێك سەخاوەتو دەست كراوەیی كردوەو دەڵێت: جارێك منداڵی سەربازو گەلەكەی كۆكردەوە، كە ژمارەیان دەگەیشتە دەهەزار منداڵ، هەریەكەیان جل و بەرگێكی جوان وگران بەهای لەبەركردنو، خوانێكی خواردنیشی بۆ ئامادەكردن، كە نمونەی كەم بوو، هەموانیشی سوننەت كردن، پاشان هەریەكە سەدوپەنجا دیناری وەك بەخشیش فرێدایە پێشیان.

یەكێكی تریش لە كارە باشەكانی ئەبوو، كە محمد أبي المنظور الأنصاري كردە قازی قەیرەوان، كە پیاوێك بوو لەگەورە زانایانی زانستی فەرمودەو چاویشی كەوتبو بەإسماعیل القاضي و حارث بن أبي أسامة پێیانی وتبو: من بە مەرجێك ئەم كارە دەكەم، كە هیچ شت لە كەس وەرنەگرم، ئەوانیش كردیانە قازیو، كە لەگەڵ خەڵكی زۆر نەرم ونیان بوو ، جارێك جولەكەیەكیان هێنایە لای جنێوی دابوو ئەویش لەسەردەم دایناو لێی دا هەتا لە ژێر لێدانەكە مرد، چونكە دەیزانی، ئەگەر كاروبارەكەی بچوو بایە لای مەنصور نەیدەكوشت، قازی وای نیشانی خەڵكدا، كە لێدانەكەی بۆ تەمێ كردنە هەتا، كە كوشتی.[2]

---

١ـ هەمان سەرچاوەی پێشو ب١٥ لا١٥٦.

٢ـ سیر أعلام النبلاء ب١٥ لا١٥٨

ابو الطاهر له ساڵی (٣٤١) كۆچی بەهۆی باو سەرماو سۆڵەیەكی سارد وەفاتی كرد، كە خۆی و دارو دەستەكەی بۆ سەیرانگایەك دەرچوبوون.

ابو الطاهر زۆر بە بەزەییانە لەگەڵ گەلەكەی مامەڵەی دەكردو تەنها شیعەگەریەتی ئاشكرا دەكردو زەرەری لەكەس نەدەدا، لە دوای خۆشی موعیزی كوڕی هاتە جێی.[1]

## تەوەرەی شەشەم: الموعيز لدين الله ابو نعيم سعد٣٤١ـ ٣٦٢هـ

ناوی مەعدی كوری ئیسماعیلی مەنصورە نازناویشی ئەبوتەمیمە، لە ساڵی (٣١٩) كۆچی لە (١١)ی مانگی رەمەزان لە مەهدیە لە دایك بووە، باوكی لەپاشە خۆی دەست نیشانی كرد بۆ خەلیفایەتی، لە ساڵی(٣٤١) كۆچی لە سەر تەختی حوكم دانیشت، كە خەلیفەی عوبەیدی چوارەمە حوكمی باكوری ئەفریقی كردبێت.

ئەو خەلیفەیە توانی لە باكورو باشوری وڵات دەسەڵاتی خۆی درێژبكاتەوەو بچەسپێنێت، لە ساڵی(٣٤٢) كۆچی باسیل الصقلي لەسەرت كردە والی ، إبن كافي التكامیشی كردە والی لەسەر ئەجدابیە، لە صقلیة لە ساڵی(٣٥٤) كۆچی ماڵ و سامان و زەویو زارێكی زۆری چنگ كەوت، پاشان هاتە ئەفریقیاو سنوری میرنشینی گەیشتە سنوری میسر، پاشان هەر لە نزیكەوە ئاگای لە كاربەدەست و ئەمیرەكان هەبوو لەمیسر بە دواداچونی بۆ دەكردن، پاشان هەر بەخۆی رێی بە خۆی دا بۆ ئەوەی دەست بەسەر میسردا بگرێت، بە مردنی كافور الأحشیدی لە ساڵی(٣٥٥) كۆچی وڵاتی میسر شلەژاو تێك چوو، موعیز ئەم هەڵەی قۆستەوەو لێنەگەرا هەر ئەوها بەفیرۆ بروات، بۆیە عەزمی جەزم كردو پلانی دانا بۆ هەڵكەندنی ڕوبارو دروست كردنی كۆشك و تەلار لە قەیرەوانەوە هەتا سنوری میسرو پاشان سوپایەكی بەهێزی ئامادە كردو پارەیەكی ئێجگار زۆریشی كۆكردەوەو، جوهر الصقلیشی هەڵبژارد بۆ سەرپەرشتی كردنی ئەو سوپایەی، كە ژمارەی لە سەدهەزار زیاتربوو، موعیز فەرمانی بە هەموو ئەمیرەكانی كرد، كەوا گوێرایەڵی جوهر الصقلي بكەن، سوپای عوبەیدەیەكان بەرێكەوت بۆ گواستنەوەی مەزهەبی باطیني بۆ میسر بۆ ئەوەی

---

[1] ـ هەمان سەرچاوەی پێشو لا ١٥٩.

ڕزگاری بێت لەو تەنگ و چەڵەمەو شۆڕشو کێشە توندانەی، کە زانایانی ئەهلی سوننە ماوەی سەد ساڵی بەردەوام دژی عوبەیدیەکان لە باکوری ئەفریقی بەرپایان کردو پێشەنگی بوون، عوبەیدیەکان ڕەتی مەزهەبی ئەخشیدییان دەرکردەوە، کە پاشکۆی دەوڵەتی عەبباسی بوو لەمیسر، توانی تیرە ژەهراوەیەکانی بهاوێتە ناو میسرو، پاڵی نا بە سوپا هارەکەیو داوای لە دارو دەستەو شەیتانەکان کرد، کە خیلافەتی عەباسی خۆڕاگر لە ناوببەن، کە ئاڕاستەیەکی سوننی هەبوو.

هەروەها موعیز هەوڵی دا ئەندەلوسی سوننیش داگیر بکات و بیخاتە ژێر چەپۆکی دەوڵەتی خۆی، بەڵام پیاوە ئازاو چاونەترس و نەبەردەکانی ڕێگربوون لەوەی ئامانجەکەی بێتە دی، لە ساڵی(٣٥٨) کۆچی لە مانگی جمادی الآخرة سوپاکەی موعیز بەهۆی سەرکردەخزمەتکارەکەیان جوهر الصقلي توانی بچێتە ناو میسرەوە ، کە ئەم پیاوە بێ ماندووبون توانی میسر بخاتە ژێر چەپۆکی عوبەیدیەکان و ببێتە موڵکیان، هەر ئەو پیاوە لە سەردەمی خۆی لە ساڵی (٣٦١) کۆچی ئەزهەری دروست کرد بۆ ئەوەی ببێتە مینبەرێك لە مینبەرەکانی عوبەیدیەکان بۆئەوەی لە ڕێگایەوە بیروباوەڕ پوچەکەو مەزهەبە باطینیە گەندەکەیان بڵاوبکەنەوە، پاشان بە فەزڵی خواو دواتر بە هەوڵ و کۆششی صلاح الدين الأيوبي توانی کۆتایی بە عوبەیدیەکان بینێت و ئەزهەریش بوو بە قەڵایەك لە قەڵاکانی ئەهلی سوننە، لە ساڵی(٣٥٨) بە سەرپەرشتی کردنی جعفر بن خلاف سوپایی عوبەیدیەکان توانی بچێتە ناو دیمەشق.[١]

## گەشتەکەی موعیز بۆ میسر:

پاش ئەوەی ڕێگا بۆ موعیز لە میسر خۆش بوو بە خۆو بەماڵ و منداڵ و کەس وکارو دەست و پێوەندو سوپایەکەی باکوری ئەفریقایان بەجێهێشت و بەرەو میسر بە ڕێکەوتن بۆ ئەوەی کاروبار بگرێتە دەست. سەرکردایەتی باکوری ئەفریقاشی بۆ ئەمیر بلكين إبن زيری الصنهاجي بەجێهێشت، موعیز توانی طرابلس و سەرت و بەرقە بداتە پاڵ میسر، لە گەڵیدا

---

١ـ بڕوانە: الفتح العربي في ليبيا لا ٣٦٢.

شاعیره بێ باوەڕەکەی محمد هانئ الأندلسي لەگەڵدا بوو، کە زیادەڕۆی لە مەدحی موعیزی دەکرد، لەیەکێك لە شیعرەکانی وتویەتی:

| | |
|---|---|
| فكأنما أنت النبي محمد | وكأنما أنصارك الأنصار |
| ما شئت أنت لا ما شائت الأقدار | فاحكم فأنت الواحد القهار |
| هذا الذي تجدي شفاعته غداً | حقاً وتخمد أن تراه النار |

لە شیعرێکی تریش لە بارەی موعیز وتویەتی:

| | |
|---|---|
| النور أنت وكل نور ظلمة | والفوق أنت وكل فوق دون |
| فارزق عبادك فضل شافعة | وأقرب بهم زلفى فانت مكينُ |

هەروەها وتویەتی:

| | |
|---|---|
| تدعوه منتقماً عزيزاً قادراً | عفاراً موبقة الذنوب صفوحاً |
| أقسمت لولا أن دعيت خليفة | لدعيت من بعد المسيح مسيحاً |
| شهدت بمفخرك السموات العُلا | وتنزل القرآن فيك مديحاً |

هەروەها وتویەتی:

| | |
|---|---|
| عَلِمْتَ من مكنون سرالله ما | لم يؤت في الملكوت ميكائيلاً |
| لوكان آتى الخلق ما أوتيته | لم يخلق التشبيه والتأويلاً |

موعیز بەخۆی و باب و باپیرانی گوێیان لەو کوفرو شیرکانە دەگرت و قەدەغەیان نەدەکردو ڕەتیان نەکردەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە خاوەنەکەیان هاندەدا لەسەری.

گەشتەکەی موعیز بەرەو میسر لە ساڵی(٣٦٢) کۆچی بوو، هەر لەم ساڵە محمد هانئ الأندلسي بێ باوەڕ لە بەرقە کوژرا، کە لەتەمەنی چل و دوو ساڵی دابوو، کە بینرا بوو تەرمەکەی وەکو سەگ لە کەنارەکانی ڕووباری بەرقە فرێدرابوو.

موعیز بەکوشتنی زۆر دڵ تەنگ بوو وتی: بەم پیاوە لەسەر هەموو شاعیرەکانی ڕۆژهەڵات شانازیمان بە خۆمان دەکرد ، بەڵام بۆمان نەچوە سەر[1]، موعیز لە گەشتەکەی

---

١ـ بروانە: الفتح العربي في ليبيا لا ٣٦٢.

بەردەوام بوو هەتا گەیشتە سنوری میسرو لەساڵی (٣٦٢) کۆچی ڕۆژی (٢٣)ی شەعبان گەیشتە ئەسکەندەریە، کە لە میسر نوێنەرێکی زۆر لە سەرکردەو کاربەدەستەکان پێشوازیان لێکرد.

مولکی موعیز لە سەبتەی ڕۆژئاواوە هەتا مەککەی ڕۆژهەڵات درێژبوویەوەو فراوان بوو ، هەتا دانیشتوانی کەنارەکانی زەریای أطلنطیش هەر بە فەرمانی ئەو دەجوڵانەوە.

موعیز دوو ساڵ و نیو لەمیسر مایەوە، لە ساڵی(٣٦٥)کۆچی لە (٧)ی مانگی ربیع الأول لە قاهیرە وەفاتی کرد، کە ویلایەتەکەی لەئەفریقیەو میسر (٢٣)ی ساڵی خایاند.[1]

شێخ طاهر الزاوي رحمه الله وتویەتی: دەوڵەتی فاطمیەکان ماوەی (٢٦٠) ساڵ بەردەوام بوو(٥٢) ساڵ لە (مغرب) و (٢٠٨) ساڵیش لە میسر، ژمارەی خەلیفەکانیشی چواردە خەلیفە بوو، یەکەمیان عبیدالله المهدی بوو کۆتایشیان عاضید بوو، کە لەمیسر لە ساڵی (٥٦٧) لە ڕۆژی عاشورا وەفاتی کرد، بە مردنی عاضید دەوڵەتی فاطمیەکان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کۆتایی پێهات و لەناوچوو، مولکیش تەنها بۆ خوای پەروەردگارەو بەویستی خۆی دەیداتە هەندێك و، بە ویستی خۆشی لە هەندێکی دەسێنتەوە.[2]

ذهبي رحمەالله وتویەتی: لەو کاتەوە ڕَفض سەری هەڵدا، کە لەمیسرو شام و حیجاز و مەغریب شانازی بەخۆی کردو بە دەوڵەتی عوبەیدی بەناو بانگ بوو لە عێراق و جەزیرە و عەجەم بە ناوی بني بویة خۆی ناساند، خەلیفە مطیع لە لایەن بني بویة پلەیەکی نزمی هەبوو، پاشان نەخۆشکەوت و لایان دا، کوڕەکەی طائع لله یان لە شوێنی دانا، کە ئەویش کاروبارێکی کەمیان دایەدەست بۆیە مەملەکەتی موعیز زۆر گەورەترو جێگیرتر بوو.[3]

موعیز شاعیر بوو ئەمە یەکێکە لە شیعرەکانی:

| | |
|---|---|
| لله ماصنعت بنا | تلك المحاجر في المعاجر[4] |
| أمضى وأقضى في النفوس | الخناجر في الحناجر |

---

١ـ هەمان سەرچاوەی پێشو لا ٢٦٢.

٢ـ هەمان سەرچاوەی پێشو لا ٢٦٢.

٣ـ سیرأعلام النبلاء ب١٥ لا ١٦٤

٤ـ معاجر: پۆشاکێکە ئافرەت لە سەری دەکات.

ولقد تعبت بينكم تعب المهاجر في الهواجر[1]

ذهبي رحمه‌الله له باره‌ی موعیز وتویه‌تی: چل و شه‌ش ساڵ ژیاوه‌و له‌مه‌هدیه له دایك بوه‌و له‌ساڵی(٦٦٥) كۆچی له‌موعیزیه‌ی سه‌ربه قاهیره نێژراوه.[2]

**ئه‌وه‌ره‌ی حه‌وته‌م: تاوانی عوبه‌یدیه‌كان له باكوری ئه‌فریقیا**

به‌ڕاستی شیعه ڕافزیه باطنیه‌كان ده‌رحه‌ق خه‌ڵكی باكوری ئه‌فریقی تاوانێكی یه‌كجار قێزه‌ون و به‌دیان ئه‌نجام دا، كه منداڵ له تاوان سه‌ری سپی ده‌بێ و هیچ عه‌قڵێكیش باوه‌ڕ ناكات، به تایبه‌تیش جامی غه‌زه‌ب و توڕه‌ییان ڕشت به‌سه‌ر زانایان:

١ـ كاتێك عبیدالله داوای پێغه‌مبه‌رایه‌تی بۆخۆی كرد، دوو شه‌رع ناسی له قه‌یره‌وان بانگ كردو خۆشی له سه‌ر كورسیه‌ك دانیشتبوو ئاماژه‌ی بۆ یه‌كێك له‌خزمه‌تكاره‌كانی كرد، ئه‌ویش به‌و هه‌ردوو شه‌رع زانه‌كه‌ی وت: ئایه گه‌واهی ده‌ده‌ن، كه‌عبیدالله پێغه‌مبه‌ری خوایه؟ ئه‌وانیش به یه‌ك ده‌نگ وتیان: سوێند به خوا، ئه‌گه‌ر ڕۆژ بێته ده‌ستی ڕاستی و مانگیش بێته ده‌ستی چه‌پی و بڵێن: ئه‌وه پێغه‌مبه‌ری خوایه، ئه‌وا وانالێین و باوه‌ڕ ناكه‌ین،عبیدالله فه‌رمانی كرد هه‌ردووكیان سه‌ربڕن[3]، ئه‌و دووشه‌رع ناسه‌ش یه‌كێكیان إبن هذیل و ئه‌وی تریان إبن البردون بوو.

پێشه‌وا ذهبي له باره‌ی إبن بردون وتویه‌تی: پێشه‌واو شه‌هیدو موفتی ابو إسحاق بن البردون الضبي، كه مالیكی مه‌زهه‌ب بوو قوتابی ابو عمثان الحداد بوو[4]

كاتێك ویستیان إبن بردون بكوژن داوایان لێكرد: ئایه له مه‌زهه‌به‌كه‌ی خۆت په‌شیمان ده‌بیته‌وه؟ ئه‌ویش وتی: ئایه له ئیسلام په‌شیمان ببمه‌وه؟

به‌ڕاستی عبیدالله المهدی هه‌ر به‌داواكردنی پێغه‌مبه‌رایه‌تی ڕانه‌وه‌ستا، به‌ڵكو ڕێیدا به شوێن كه‌وتوه‌كانی بۆ ئه‌وه‌ی له‌كوفره‌كه‌یان نوقم ببن هه‌تا به جۆرێك كردیانه خوا، چونكه یه‌كێك له سوێنده گه‌وره‌كانیان ئه‌وه بوو، كه ده‌یان وت: وحق عالم الغیب والشاهدة مولانا

---

١ـ سیرأعلام النبلاء ب١٥ لا ١٦٣ـ ١٦٤

٢ـ هه‌مان سه‌رچاوه‌ی پێشو ب١٥ ١٦٦.

٣ـ سیرأعلام النبلاء ب١٥ لا ٢١٧

٤ـ سه‌رچاوه‌ی پێشو ب١٤ لا ٢١٥.

الذي برقادة یەكێك لە هەرە شتە ترسناكەكان ئەوە بوو، كە دەیوت: من پەنهان وغەیب ودەزانم، غەیب و پەنهانیش تەنها هەر خوای پەروەردگار دەیزانێ و یەكێكە لە تایبەتمەندی خوایەتیو، هەر یەكێك بۆ غەیری خوا بیداتە پاڵ كەسێك ئەوا دەكەوێتە ناو شیرك و كوفرێكی گەورە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾الأنعام: ٥٩.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ﴾النمل: ٦٥

خۆسوێندیش نابێ بخورێ بە هیچ دروست كراوێك بەڵكو دەبێ بخورێ بە خوای بەدیهێنەریان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((من كان حالفاً فليحف بالله، أو ليصمت)) هەروەها فەرمودەی تریش هاتوون، كە قەدەغەدەی سوێند خواردن دەكات بەباو باپیران.

بەراستی شاعیرەكانی دەوڵەتی عوبەیدی مەدحی خەلیفەكانی خۆیان دەكرد، هەتا گەیشتە سنوری كوفری ئاشكرا، دواتر لە نێوان خەڵكی بڵاویان دەكردەوە، ئەمەش، كە دەردەكەوێ لە شیعری إبن هانئ الأندلسي، كە یەكێك بوو لە شاعیرەكانیان و لە یەكێك لە شیعرەكانی لە بارەی مەدح كردنی مەهدی دا وتویەتی:

حل برقادة المسيح     حل بها آدم ونوح

حل بها الله ذوالمعالي     فكل شيئ سواه رايح[1]

هەروەها شاعیرەكانیان مەهدیە بە مەككەی پیرۆزو دەچوێنن كەعبەش لەمەهدیە كورت هەڵدێنن:

هي المهدية الحرم الموتى     كما بتهامة البلد الحرام

وأن لثم الحجيج الركن أضحى     لنا بعراص قصركم التثام[2]

---

١ـ مدرسة الحديث في القيروان ب١ لا ٧٢

٢ـ البيان المغريب ب١ لا ١٨٤.

٣ـ جەنگی دەورنیان لەگەڵ ئەهلی سوننەدا دەکرد بە هۆی هەڵواسینی سەری بەران و گوێ درێژ لەسەر دەرگای خواردنگەکانو، ناوی هاوەڵە بەرێزەکانیان لەسەر دەنوسی و بە ئاشکرا جنێوو تانەو تەشەریان لە هاوەڵان دەداو خەڵکیشیان وا تێدەگەیاند، کە هاوەڵان پاش پێغەمبەر لە ئاین هەڵگەڕاینەوەو بۆ ئەم نیازە گلاوەشیان چەند بانگخوازێکیان تایبەت کردبو بۆ ئەوەی لە بازار و شوێنە گشتیەکان هاوار بکەن.

هەر یەکێك ناوی هاوەڵانی بە باشە ببردایە، یان لەسەر عەلی بە گەورەتری بگراتەیە دەکوژرا، یان بەند دەکرا.[1]

٤ ـ عوبەیدەیەکان کاریان کرد بۆ نەهێشتنی شوێنەواری هەندێك لە خەلیفە سوننیەکانی پێشە خۆیان، بۆیە عبیداللە فەرمانێکی دەرکرد بە لابردنی ئەو کاربەدەستانەی، کە مزگەوت و قەڵاکانیان دروست کردبوو وای کرد، کە ناوی خۆی لە جێگای ئەوان دابنێو هەروەها ئەو ڕافزیە نگریسە دەستی گرت بەسەر ماڵ و چەکی قەڵایەکانو، ئەو خواپەرست و پاسەوانانەشی دەرکرد[2]، کە لە کۆشکی زیاد الأغلبي بوونو هەڵسا کردی بە عەمباری چەك.

٥ـ عوبەیدیەکان بە هیچ شێوەیەك نەیان دەهێشت خەڵك کۆببێتەوە لە ترسی شۆڕش کردن و دەرچوون لە فەرمانیان، بۆیە لە سەرەتای دەست پێکردنی شەو زووڕنایەکیان لێدەدا، ئەوەی لە دوای ئەوە ببینرایە لە ملیان دەدا، هەروەها ئەوان خەڵکیان پەرتەوازە دەکرد، کاتێك کۆدەبوونەوە بۆ مردنی یەکێك لە زاناکان.[3]

ئەو کارە تا ئێستاش نەپچڕاوەو بەردەوامە لەناو سیستەمە داپڵۆسێنەرانەی، کە ئەوەی حاکم وتاغوت و فیرعەونەکانیان دەیبینن ئەوا هەر ئەوە ڕاستە و حەقە ﴿مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾ غافر: ٢٩

---

١ـ مدرسة الحديث في القيروان ب١ لا ٧٢

٢ـ پاسەوان: واتە: مرابط

٣ـ بڕوانە: رياض النفوس ب٢ لا ٥٦

٦ـــ كتێبــەكانی ئــەهلی ســوننەیان لــەناوبردو، قەدەغــەی خەڵكیشــیان كــرد لــەوەی بیخوێننەوە، هەروەك، كە كتێبەكانی زانای پایە بەرز محمد بن أبي هـاشمی تجبییـان بـرد، كە ئەندازەكەی حەوت ئۆقیە بـوو، هەمووشـی لەنووسـینی خـۆی بـوو، پاشـان بردیانـە لای كاربەدەستەكەی بني عبيد ئەویش بردی و لێنەگەرا خەڵكی بیخوێننەوەو سودی لێوەربگرن ئەمەش وەك ڕق وقینێك بەرامبەر ئیسلام و ئەهلی سوننە.[1]

٧ـ ڕێیان لەشەرع زانەكان گرت فەتوا بەمەزهەبی پێشەوا مالیـك بـدەن، ئـەو كارەشـیان وەك تاوان لە قەڵـەم داو ئـەوەی وای بكردایـە لێـی دەدرا، یـان بەنـد دەكـرا جـاریش وابـوو دەكوژرا، لە پاش ئەوە خەڵكیان دەتۆقاند لەلایەنی دەروونی بەوەی لاشەی كوژراوەكـەیان دەگێڕا لە بازاڕەكانی قـەیرەوان و بـانگ دەكـرا، ئـەوە سـزای ئـەو كەسـەیە، كـە فـەتوا بـە مەزهـەبی مالیـك دەداو لـێش نەدەگـەڕان فـەتوا بـدرێ تـەنیا بەمەزهـەبی خۆیـان نەبوایـە، هەروەك، كە وایان كرد لەگەڵ شەرع زانی پایەبەرز ابوعبدالله محمد بـن العبـاس بـن الولیـد، كە لە ساڵی (٣٢٩) كۆچی وەفاتی كرد.[2]

٨ـ زانایانی ئەهلی سوننەیان قەدەغەكرد لەمزگەوتەكان وانە بڵێنەوەو كۆببنـەوە لەگـەڵ قوتابییەكان، هەتا وای لێهات لە ترسی عوبەیدیەكان كتێبی ئەهلی سـوننە تـەنها لـە مـاڵان دەخوێنرایەوە، هەردوو قوتابی ابو بكر بن اللباد و ابو محمد بن التبان و جگە لـەم دوانـەش دەهاتنە لای ابو محمد بن التبان، كە گەورە زانایانی ئەهلی سوننە بـوون لـە قـەیرەوان، بـە نهێنی دەهاتنە لایـانو كتێبەكانیشـیان لـە نێـوان خۆیـان دەشـاردەوە هـەتا ئارەقـە تـەڕی دەكرد ئەمەش لە ترسی عوبەیدیەكان.[3]

ئەو شێوازە تاكو ئێستاش هەندێك دەوڵەتی داپڵۆسـێنەر لـە جیهـانی ئیسـلامی لـە سـەر گەلەكەی مومارەسـەی دەكـان، هەنـدێكیان بەگشـتی قەدەغـەی كـردوە، هەنـدێكیش ڕێگـا بەهەندێكی دەدات، كە دژی بەرژەوەندی وڵات نیە.

---

١ـ بروانە: رياض النفوس ب٢ لا٤٢٣.

٢ـ هەمان سەرچاوە ب٢ لا ٥٦.

٣ـ مدرسة الحديث في القيروان ب١ لا ٧٦

٩ــ زۆریان لەخەڵکی دەکرد بۆ ئەوەی بەپیل بانگەوازەکەیان بێنو، ئەوەی وەڵامی دابانەوە وازیـان لێـدە هێنـا، بـەڵکو جـاری وا هـەبوو هەنـدێك مەناصـیبیان دەدا دەسـتو، ئـەوەی ڕەتیشی بکردبایەوە لە ناویان دەبرد، وەك ئەوەی وایان کرد لە کاتی سازدانی یەکەم وتار، کە عبیداللە لە ڕۆژی جومعە لە قەیرەوان خوێندیەوەو، ئینجـا لـە پاشـان لـەنێوان دەوڵـەتی عوبەیدیو خەڵکی قەیرەوان شەڕێکی خوێناوی ڕوویدا، عبیـداللە الشـیعی فـەرمانی کـرد واز لەخەڵکی ڕەشو ڕووت بهێنن و کۆڕێکی موناقەشەی هەر بەناوە سازدا، کە لەمـەدا زانایـانی ئـەهلی سـوننە تووشـی تـاقی کردنەوەیـەی دژوارو دەردو بەڵایـەکی سـەخت هـاتنو، بـە هـەزارانیان لـێ کـوژرا، چـونکە دەسـتیان گرتبـوو بەئیسـلام و تـامردن بـەرگریان لەئـەهلی سوننەو جەماعە دەکرد ، قابیسی وتویەتی:لەسەردەمی عبیداللە هەتاوەکو ئەو کەسانەی لە دار البحر مردن ، کە بەندیخانەی عوبەیدیەکان بوو، ژمارەیـان چـوار هـەزار کـەس بـوو، کـە هەموویان لە ژێر ئەشکەنجەو ئازار گیانیان لە دەستدا، کە لـە نێویانـدا زانـاو خواپەرسـت و پیاوی چاك هەبوون،[1] بێجگە لـەو کەسـانەی لـە دەرێی بەندیخانـە دەکـوژران و پاشـان بـە شێوەیەکی ناشیرین لە بازاڕەکانی قەیرەوان تەرمەکانیان دەسوڕاندنەوە، ئەم دەردو بەڵایە زۆر کاری کردە سەر ژیانی عیلمی، بۆیە هەندێك زانا خۆیان لەم فیتنەیە بە دوور گرت، وەك ابو محمد الورداني، بـەڵام لەگـەڵ ئـەوەش ئـەو میحنـەت و چـەرمە سـەریە زیـاتر ئـارامی و خۆڕاگری و عەزیمەتی بە ئەهلی باکوری ئەفریقیا بەخشی و زیاتر دەستیان بـە بنچـینەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتەوە گرت.[2]

١٠ــ شـەریعەتیان لـەکار خسـتو، فەرزەکانیشـیان نەهێشـتو، ئـەوەی شـوێن کەوتـەی بانگەوازەکەی ئەوان بوایە لە شوێنێکیان دەکردن، کـە نـاوی دامـوس بـوو، ئینجـا عبیـداللە دەچووە لایـان و فەروەیـەکی بەرەواژیشـی لـە بـەردەکردو، بـە چـوار پێیـانیش بـۆ لایـان دەڕۆیی ، پاشان دەیوت: بەح پاشان دەیهێنانە دەرێو ڕاڤەی ئەو کردەوانەی بۆ دەکردن و دەیوت: سەبارەت بەهاتنم بە چوار پێیان بۆ لاتـان بـۆ ئـەوەبوو، کـە پێتـان ڕابگـەینم، کـە ئێوە وەك ئـاژەڵ وانـە نەدەسـت نوێـژ و نوێـژ و زەکـات و هـیچ فـەرزێکتان لـە سـەر نیـە و

---

١ــ ریاض المفوس ب١ ٥٧٤.

٢ــ ریاض المفوس ب١ ٥٠٤.

هەمووتان لەسەر لادراوە، سەبارەت بە لەبەرکردنی فەروەکە بە بەرەواژی بۆ ئەوەم بوو بزانن، کە ئێوە ئاینتان گۆڕیوە، سەبارەت بە وتنم بۆ وشەی بەح بۆ ئەوەم بوو، کە بزانن هەموو شتێك لە زیناو ئارەق خواردنەوەو.. هتد.. بۆ ئێوە حەڵاڵە.[1]

لێرە زۆرم پێخۆشە هۆنراوەی شاعیری ئەهلی سوننەو جەماعە لەباکوری ئەفریقا (قاسم الفزاري) بێنمەوە، کە زەمی بنی عبید دەکات و دەڵێت:

| | |
|---|---|
| عبدوا ملوكهم وظنوا أنهم | نالوا لهم سبب النجاة عموماً |
| وتمكن الشيطان من خطواتهم | فأراهم عوج الضلال قويماً |
| رغبو عن الصديق والفاروق | في أحكامهم لا يسلموا تسليماً |
| وإستبدلوا بهماإبن أسود نابحاً | وأباً قدرة واللعين تميماً |
| تبعوا كلاب جنهم وتأخروا | عمن أصارهم الإله نجوماً |
| ياليت شعري من هم إن جهلوا | ديناً، ومنهم إن عدتت صميماً |
| أمن اليهود؟أم من النصارى أم هم؟ | دهرية جعلوا الحديث قديماً |
| أم هم من الصابين أم من | عبدوا النجوم وأكثروا التنجيماً |
| أم هم زنادقة معطلة رأوا | أن لا عذاب غداً و لاتنعيما؟ |
| أم عصبة ثنوية قد عظموا | النورين عن ظلماتهم تعظيماً؟ |
| من كل مذهب فرقة معلومة | أخذوا بفرع واعواه أروما |

شاعیری بەناوبانگ قاسم العزاوی لە هۆنراوە رائیەکەی، کە دواتر دەیهێنینەوە زەمی بني عبيد دەکات و هەروەها باس لەوە دەکات، کە چۆن خودای گەورە قوتاری کرد لە دەستیان.

١١ ـ لە بانگدا حی علی خیر العمل یان زیاد کردو لە بانگی نوێژی بەیانیش الصلاة خیر من النوم یان لاداو، خەڵکیشیان قەدەغەکرد لە نوێژی تەراویحی ڕەمەزان، چونکە بني عبيد بەقەد هیچ شتێك ڕقیان نابێتەوە ئەوەندەی ڕقیان لەم نوێژە دەبێتەوەو پێی قەڵسن، هەروەها قەدەغەی خەڵکیان کرد لەوەی نوێژی چێشتەنگاو بکەن ، لە بەر فیتنەی

---

١ـ هەمان سەرچاوە ب٢ ٤٥٤ـ ٤٩٥

خەڵکیش نوێژی نیوەڕۆیان پێش خست، لە وتاری هەینیش بە ئاشکرا جنێویان بە هاوەڵان دەداو کوفری ئاشکراشیان دەگوت بۆیە خەڵکی وازیان لەم جۆرە وتارانە هێناو بۆ نوێژی هەینی نەچوونە مزگەوت ، لەسەردەمی ئەوان مزگەوتەکان کەس نوێژی تیادا نەدەکرد، هەندێك لە پێش نوێژەکانیان ڕوویان لە ڕەقادە دەکرد، کاتێکیش عبیداللە چوو بۆمەهدیە ڕوویان لەوێ کرد،[1] زۆرجار زۆریان لە خەڵکی دەکرد پێش ئەوەی مانگی یەك شەوەی شەوال[2] ببینن بیکەنە چەژن ، بەڵکو زانای پایە بەرز محمد بن الحبلي کە قازی و فەقیهی بەرقە بوو کوشتیان، کە فەتوای دا چەژن نایەت هەتا مانگی یەك شەوەی شوال نەبینرێ.

پێشەوا ذهبي لە بارەی ژیانی ئەو زانایە وتویەتی: ئیمامی شەهیدو قازی بەرقە جارێکیان ئەمیری بەرقە هاتە لای و پێی وت: بەیانی چەژنە، ئەویش وتی: نەخێر هەتا مانگ نەبینرێ چەژن نیە و خەڵك دەبێ هەر بەڕۆژوو بن، چونکە من گوناهی کەس ناخەمە ئەستۆی خۆم، وتی: ئاخەر نوسراوی مەنصور لەم بارەیەوە هاتووە، چونکە بە بیرورای عوبەیدیەکان دیتنی مانگ مەرج نەبوو بۆ هاتنی چەژن، بەڵکو بەحیسابی فەلەکی ئیشیان دەکردو، هەر بەوحیسابەش دەیان کردە جەژن، ئەو ئەمیرە هەڵسا بەدۆڵ لێدان وەك خۆ ئامادە کردنێك بۆ جەژن، بەڵام قازی وتی: نەدەچمە دەرەوەو نە نوێژیش بۆ کەس دەکەم، ئەمیریش فەرمانی بە یەکێك کرد وتار بخوێنێتەوەو ئەونوسراوەشی خوێندەوە، کە لە مەنصورەوە هاتبوو لە دوای قازیشی نارد بێت ،کە هات فەرمانی کرد لە بەر هەتاودا هەڵیبواسن هەتا وەکو دەمرێ، قازی لە تینوەتیان هاواری دەکرد ئاوم بۆ بێنن، بەڵام بۆیان نەهێناو، پاشان لە سەردارێك لە خاچیاندا. نەفرەت لەستەم کاران بێت.[3]

١٢ــ لە تاوانەکانی عبیداللە ئەوەبوو، کەجارێك ئەسپەکەی هاتە ناو مزگەوت جا بەخاوەنەکەیان وت: چۆن ئەسپ دێننە ناو مزگەوت؟ وتیان: ئەوە ئەسپی عبیداللە المهدي یە، میزو تەرسی خاوێنە، خاوەنی مزگەوت ئینکاری ئەو کارەی کرد، ئەوانیش بردیانە لای عبیداللە و دەم و دەست فەرمانی کرد بیکوژن.

---

١ــ بڕوانە: مدرسة القیروان ب١ لا ٧٣

٢ــ هەمان سەرچاوە.

٣ــ سیرأعلام النبلاء ب١٥ ٣٧٤

إبن عذاري وتويەتی: خودای گەورەعبیداللە ی  لە دوا تەمەنی تاقی کردەوە بەنەخۆشیەکی زۆر قێزەون، کرمێك لە کۆمی دەهاتە دەرێ و هەناوی دەخوارد بەم جۆرە هەتا لە ناوچوو.[1]

بەڕاستی نەوەی موسڵمانان ئەوانەی مێژووی عوبەیدیەکان دەخوێننەوە تەنها مێژووی سیاسی ئەو دەوڵەتە دەزانن ،کە فلان ڕۆییو فلان جێی گرتەوە،هەروەها بەوەی دەوڵەتێکە عیلمو زانستی خۆش ویستوە هەر ئەوانەی باسی سیرەی زانایانیان کردوە باسی زەبرو زەنگی ئەو ستەم کارانەیان کردوە،کە دەرهەق بە زانایانی ئەهلی سوننەیان کردوە بەڵکو ئەو قوتابیانەی مێژووی ئیسلامی دەخوێنن باس لە معد بن إسماعیل دەکەن ، کە ناسراوە بە موعیز ، کە پاڵەوانێك بووە لە پاڵەوانەکانی مێژوو.[2]

ئەمەش هەمووی لە ئەنجامی نەبوونی تەفسیری بیرو باوەڕی ئیسلامیە بۆ مێژووەکەمان، بەڵکو ئەو مێژوونوسانەی مێژوویان بۆ ئێمە نوسیوەتەوە بە قوتابخانەکانی ڕۆژهەڵات ناسی(مدارس الإستشراق)یان هزری شیعە کاریگەر بوونەو، یان ڕەشوەیان وەرگرتووە بۆ داپۆشینی ئەو ڕاستیانەی، کە هەردەبێ بۆ نەوەکانی داهاتوو ڕوون بکرێتەوە بۆ ئەوەی بزانێ دوژمنو دۆستی کێیە، هەروا بۆ ئەوەی بزانێ، کە هزرەکان نامرن، بەڵکو شێوەو ڕوخساریان دەگۆڕێت، هەروا ئەو نەفرەتیانەی، کە دوژمنی ئیسلامن بەردەوام بە نهێنی و بەئاشکراو بەشەو بەڕۆژ کاردەکەن بۆ لە ناوبردنی عەقیدەی پاك و خاوێنو درەوشاوەی ئەهلی سوننە، کە عەقیدەی خۆشەویستمان محمدﷺ و هاوەڵە بەڕێزو پاك و نەبەردەکانی پێغەمبەرە(ڕەزای خوایان لێبێت)، خودای گەورە لەهەموویان ڕازی بێت.

## تەوەرەی هەشتەم: هەڵوێستی زانایانی ئەهلی سوننە و شێوازەکانی بەرگری کردن

بەڕاستی زانایانی ئەهلی سوننە دژی شەپۆلی عوبەیدیە ڕافزیەکان بەهەموو شێوازێك ڕاوەستان و بەرگریان کرد بگرە بەعیلم و بانگەواز و هەڵگرتنی چەك دژی ئەو مل هوڕە ستەم کارانە، شێوازی بەرگری کردنیشیان لە چەند تەوەرەیەك پێك هاتبوو لەوانە:

١ـ خۆڕاگری زانایان و شەرع زانەکان دژی کرداری عوبەیدیەکان و بەرگری کردنیان

١ـ أيعيد التأريخ نفسة؟ محمد العبدة  لا٣٩

٢ـ أيعيد التأريخ نفسة؟ محمد العبدة  لا٤٠

لەسەر ئەشکەنجەو ئازارو بەندیخانەو کوشتن ، کە ئەمە یارمەتی دەربوو بۆ خۆڕاگری و نەشلەژانی خەڵکە موسڵمانەکە لە سەر عەقیدەی ئەهلی سوننە، عوبەیدیەکان شێوازی جۆراو جۆریان بەکارهێنا بۆ چۆڵ کردنی گۆڕەپان لە زانایان، ئەمەش بۆ ئەوەی ورەو غیرەتی خەڵك دابەزێنن.

٢ــ زانایان پەیوەندی خۆیان لەگەڵ دام و دەزگاکانی دەوڵەتی عوبەیدی بچڕاندو کاروباریان نەدەبردە لای قازیەکان و نوێژیان لە دوای ئیمامەکانیان نەدەکردو نە لەخۆشی و نە لەناخۆشی سەرەخۆشیان لێنەدەکردن‌و ژن‌و ژن خوازیشیان لەگەڵ نەدەکردن.[١]

لەو کارە پیرۆزەدا یەکەم جار زاناو فەقیهی پایەبەرز ابو یوسف بن محمود جلبة بن عبدالرحمن دەست پێشخەر بوو، کە لە یەکەم وتاری عوبەیدیەکان لە مزگەوتی قەیرەوان پەیوەندی لەگەڵیان پچڕاند ، کە ئەوەی نەدەبوو گوێی لێبێ گوێی لێبو، بۆیە هەڵسا عەمامەکەی لە سەرکردەوە هەتا خەڵك هەمویان بینیان‌و بۆ بەر دەرگایی مزگەوت ڕۆی و خەڵکیش سەیریان دەکرد هەتا لە دەرگا هاتە دەرێ و ئینجا وتی: پچاڕاندیان خوا بیان پچرێنێ، هەر لەو کاتەوە زانایان بەشداریان نەکرد لە وتارەکانیان و یەکەمین کەسیش بوو، کە خەڵکی لەوبارەیەوە ئاگادارکردەوە.[٢]

٣- زانایانی ئەهلی سوننە خەڵکی باکوری ئەفریقیان جۆش کرد بە چەند فەتوایەك، کە کوفری دەوڵەتی عوبەیدی ڕوون و ئاشکرا دەکردو وتیان، کە ئەوانە ئەهلی قیبەلە نین‌و، ئەوکەسانەشیان بەکافر لە قەڵەمدا، کە بەڕەزامەندی خۆیان چونە ناو مەزهەبەکەیان، ئەو فەتوایانەش بە جۆرێك بڵاو بوونەوە، کە خاص وعام زانی و لە هەمان کاتدا بوو بە بەربەستێکی بە هێزو بتەو لە نێوان خەڵکی سادەو نێوان وەرگرتنی بانگەوازی رافیزەکان.[٣]

لەو سەردەمە دژوارەی ئەو کات یەکێك لە دیارترین ئەو زانایانەی، کە ئوممەتیان پاراست بەمەنهەجی ئەهلی سوننەو جەماعە لە باکوری ئەفریقا شێخ ابو إسحاق السبائی بوو ، کە ڕای وابوو خەواریجەکان ئەهلی قیبەلەن بۆیە لە گەلیان وەستا دژی عوبەیدیە بەکافرەکان.

---

١ــ مدرسة أهل الحديث في القيروان ب١ لا٧٨.

٢ــ رياض النفوس للمالكي ب٢ لا ٤٧

٣ــ هەمان سەرچاوە ب٢ لا٣٤٠

فەقیهی بەناوبانگ شێخ ابو بکر عبدالرحمن الخولاني وتویەتی: ابو إسحاق السبائي و شێخەکانی تری ئەفریقیە دەرچوون بۆ شەڕ لەگەڵ دارو دەستەی دوژمنی خوا، کە گەورەی سوپاکە ناوی ابو یزید بوو، ابو إسحاق بەدەست ئامـاژەی بۆ سوپاکەی ابو یزید دەکردو دەیوت: ئەوانە ئەهلی قیبلەن و ئەوانی تریش ئەهلی قیبلە نین ــ کە مەبەستی سوپای عوبەیدیەکان بوو- پێویستە لەگەڵ سوپاکەی شەڕ بکەین دژی ئەوانەی ئەهلی قیبلە نین، ئەگەر بەسەریان دا زاڵ بوین، ئەوا ناچینە ژێر دەسەڵاتی ابو یزید، چونکە خەواریجە. خوای گەورە هەر لە نێوانەخۆمان ئیمامێکی دادگەر هەڵدەبژێرێ و بەسەری دا زاڵ دەکاو لە کۆڵ ئێمەی دەکاتەوە.

لەو فەقیهو زانا خواناسانەی لەگەڵی دەرچوون: ابو العرب بن تميم وابو عبدالملك و مروان بن نصروان و ابو إسحاق السبائي و ابوالفضل المسمی و ابو سليمان ربيع القطان بوون [1] لەوانە ربيع القطان یەکەمین کەسیان بوو بانگەشەی بۆ جیهاد کرد دژی عوبەیدیەکان و هەڵسا بە هاندانی خەڵك لەسەر جیهاد کردن.

کە کاتی نوێژی هەینی داهات أحمد بن محمد بن ابو الوليد چووە سەر مینبەرو وتارێکی زۆر بەهێزو کاریگەری خوێندەوەو خەڵکی هاندا لە سەر جیهادو باسی پاداشتەکەی بۆ کردن و ئەو ئایەتەشی خوێندەوە: ﴿لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ﴾ النساء ٩٥ پاشان فەرمووی: خەڵکینە جیهاد دژی ئەوە بکەن، کە کوفری بە خوا کردو خۆی بە خوا داناو هەڵسا بە گۆڕینی ئەحکامی خواو، جنێوی بە پێغەمبەرو هاوسەرەکانی و هاوەڵە بەڕێزەکانی دا.

خەڵکی بەگریانێکی زۆر بە کول گریان، پاشان لە درێژەی وتارەکەی وتی: خودایە ئەو کافرەی ناسراوە بە عبیدالله ئەوا بانگەشەی خوایەتی دەکاو، نێعمەتەکانت ڕەت دەکاتەوەو، تۆ بەخوا نازانێت و، تانەو تەشەر لە پێغەمبەرەکانت دەداو، محمدی پەیامبەرو چاکترین دروست کراوت بە درۆدەخاتەوەو خوێنی ئوممەتەکەت دەڕێژێ و حورمەتی میللەتی پێغەمبەرەکەت لەکەدار دەکا، کە لەمەدا درۆ لەبارەتەوە دەکات و بە نەرم و

---

١ــ رياض النفوس للمالكي ب٢ لا ٣٤٣

نیانیت هەڵخەڵەتاوە، خودایە بەر نەفرەتی خۆتی بێخەو تاماوە سەرشۆڕ و زەلیلی بکەو لەبەیانی تا ئێوارە بیخەرە بەر غەزەبی خۆتو، بیخەرە ناو دۆزەخو واش بکەی لە دونیاش ببێتە پەندو خەڵکی سەرگوزشتەکەی بگێڕنەوە، خودایە دارو دەستەکەی لەناو ببەی و کۆمەڵەکەی پەرتەوازە بکەی و سوپاکەی بشکێنی و، وا بکەی باوەڕداران کەیف خۆش بن، ئینجا لە سەر میبەرەکەی هاتە خوارو دوو رکعات نوێژی هەینی کردو پاشان سەلامی دایەوەو ئینجا وتی: بەیانی، کە دەکا ڕۆژی شەمە إن شاءالله دەردەچین.[1]

بۆبەیانی ربیع القطان سواری ئەسپەکەی بوو، کە هەموو ئامێری جەنگی لەسەر پشت بوو، لە گەردەنیشی قورئانێك هەڵواسرابوو، لە دەوروبەریشی کۆمەڵێك لە خەڵکی قەیرەوان، کە لەئامادە باشی دابوون بۆ جیهاد کردن دژی دوژمنی خوداو هەموشیان ئامێری جەنگیان هێنابوو، قطان زۆر کەیف خۆش بوو سەیرێکی کردنو وتی: سوپاس بۆ خوا، کە ژیاندمی هەتا گەیشتم بە کۆمەڵێکی باوەڕدار، کە کۆبوینەوە بۆ جیهادکردن لەگەڵ دوژمنانتو هەڵسانە بۆ بەهێزکردنی ئاینەکەت، خودایە ئەوە بەچ هۆکارێك گەیشتە ئەمڕۆ؟ پاشان دەستی کرد بەگریان هەتا فرمێسك بەسەر ڕیشی هاتە خوارێ، پاشان پێی وتن: ئەگەر پێغەمبەری خوا ئێوەی بینیبا زۆر دڵ خۆش دەبوو، لە شوێنێکی تریش، کە پاش ئەوەی خەڵك بێدەنگ بوو وتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ التوبة: ١٢٣، پاشان وتی: ﴿أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍۚ أَتَخۡشَوۡنَهُمۡۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣ قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ ١٤ وَيُذۡهِبۡ غَيۡظَ قُلُوبِهِمۡۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ١٥﴾ التوبة: ١٣ـ ١٥

پاشان بەدەست ئاماژەیەکی کردو وتی: ﴿أذکروا الله یذکرکم﴾ ئینجا خەڵکەکە هەموو بە یەك دەنگ وتیان: الله أکبر جا ڕۆیی هەتا گەیشتە مزگەوت و لەوێ چووە ناو جەنگ لەگەڵ

---

١ـ رياض النفوس للمالكي ب٢ لا ٣٤٣ ـ ٣٤٤.

دوژمنانی خوا هەتا لە ساڵی (٣٣٤) کۆچی بەخۆی و چەند بەڕێزێکی تر لە پیاو چاکان شەهید بوو.

٤ـ زانایان پەیوەندی خۆیان پچڕاند لەگەڵ ئەو فەقیهانەی لە عوبەیدیەکان دەچوونە پێش، ئەگەر چی با نەچووبانە ناو بانگەوازەکەشیان، بۆیە زنایان فەتوایاندا کەس کتێبەکانی ابوالقاسم البراذعي[1] نەخوێنێتەوە وفرێشی بدەن.

٥ ــ زایان و فەقیهەکان دەرگای ماڵەکانی خۆیان والا کرد بۆ خەڵکی بۆ پووچەڵ کردنەوەی بیروباوەڕی عوبەیدیە باطینیەکان ، لەوانە ابو إسحاق السَّبَائی دەرگایی ماڵی خۆی والا کردبوو زەمی عوبەیدیەکانی دەکردو خەڵکی ئاگادار دەکردەوە لە شەڕیان و زۆریش باسی گەورەیی هاوەڵە بەڕێزەکانی دەکردو مەدحی دەکردن، ماڵەکەشی لەبەر زۆری قوتابیان وەك مزگەوتی لێهاتبوو ، هەروەها کاتێك عوبەیدیەکان مزگەوتیان قەدەغەکرد لە هەردوو زانا أحمد بن نصر الهواری و أحمد بن یزید الدباغ ئەوا ماڵەکانی خۆیان کردە مزگەوت و، بە نهێنی بیروباوەڕو بنچینەی ئەهلی سوننەیان دەچاند لە دڵی خەڵکی باکوری ئەفریقیا.[2]

هەرچەندە تاغوت وستەمکارو مل هورەکان ڕێگەیان گرتو تەسکیان کردەوە، ئەوا هەر دەبێ بانگخوازو فەقیهو زانایە خواناسەکان ڕێگەیەك بدۆزنەوە بۆ فێرکردنی خەڵك و ڕێ نیشاندانیان.

٦ـ زانایانی ئەهلی سوننە زۆر خۆیان ماندوو کرد لەچاندنی مەنهەجی ئەهلی سوننە لە نەوەی کەتامیەکان و صەنهاجیەکان و ئەو بەربەریانەی کە یارمەتی دەری عوبەیدیەکان بوون، ئەمەش، کە زانایی پایە بەرز ابو إسحاق السَّبَائی و هی تریش پێی هەڵسان و دەستیان کرد بە فێرکردنی مناڵە بچوکەکان و باسی هەڵمەتی بانگەوازی عوبەیدیەکانیان بۆ دەکردن و ناشیرنیان دەکردن لە لایان، بێ ئەوەی پاداشت لە یەکێکیان وەربگرن ئەمەش بۆ ئەوەی ببێتە هاندەرێك بۆ ئەوەی بێنەوە لایان.[3]

---

١ـ مدرسة أهل الحدیث في القیروان ب١ لا٧٨.

٢ـ هەمان سەرچاوە ب٢ لا ٧٩.

٣ـ مدرسة أهل الحدیث في القیروان ب١ لا٨٠.

لەمەوە دەردەکەوێ، کە گرنگی دان بە نەوەی سیاسەتمەدارو بیرمەندە عەلمانیەکان و وەزیرو بەرپرسەکانی دەوڵەت لە هەموو شوێنێك پێویستیەکی شەرعی و حەرەکیە بۆ دامەزراندنی شەرعی خواو جێگیرکردنی، بەڵام دوژمنایەتیو ڕێگرتن بە هەر جۆرێك بۆ گەیشتنە ناو هێلانەی عەلمانیەکان و گەڕاندنەوەی مناڵەکانیان لە ژێر هێزی شەیتانەکان ئەوە کارێکە ناوەشێتەوە لەو کەسانەی،کەئەهلی سوننەنەو بانگەشەی بۆی دەکەن.[1]

٧ـ لەو هۆکارانەی، کە زانایانی ئەهلی سوننە بەرگریان لە عەقیدەی سەلەف دەکرد هۆکاری وتووێژو گفتوگۆ دەم کوتکردنی بەرامبەر بوو لە بەردەم خەڵکی، لەو گفتوگۆیانەی، کە کتێبەکانی مێژوو بۆ ئێمەیان تۆمارکردوە گفتوگۆی زاناو فەقیهی بەناوبانگ ابوبکر القموديیە، کە لە گفتوگۆیەك لەگەڵ ابو العباسدا لێی بردەوەو دەم کوتی کرد.

هەروەها إبراهيم بن محمد الضبي پیاوێکی چاك و فەقیهێکی بلیمەت بوو، کە عوبەیدیەکان ستەمیان لێکردو بە ناهەق کوشتیان.

زانایەکی تریش لەم بوارە بە دیارکەوت، کە ناوی (ابو محمد بن عبدالله بن التبان)بوو، بەڵام زانای پایە بەرز ابو عثمان سعيد بن محمد الحداد لە هەموویان لەم بوارە بە تواناتر بوو، ئەو بەرگری و سەرخستنانەی ئەنجامی دەدا بۆ ئیسلامو ئەهلی سوننە ئەوا زۆر جێگای ڕێزو سوپاسە.

### بەناوبانگترین گفت و گۆیەکانی پێشەوا ابو عثمان سعيد بن الحداد

عبيدالله ڕۆژێك لە دوای ابو عثمان سعيد بن الحدادی ناردو باسی فەرموودەی غەدیر خەمی کرد، کە فەرمودەیەکی صەحیحەو دەفەرموێ: (من كنت مولاه فعلي مولاه) واتە:

---

١ـ گشتاندنی ئەو بنەمایە بە شێوەیەکی ڕەها لەگەڵیدا نیمە، چونکە زۆرێك لە زانایان و پیاوچاکان لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت شۆڕشیان کردوە لەسەر کار بەدەستە زاڵم و گومڕایەکان، چ جای کار بەدەستە عەلمانیو ئیشتراکیەکانی ئەمڕۆ، کە لە ئیسلام دەرچوینەو، هەموو ئاینە ئاسمانیەکان ڕەت دەکەنەوە، بەڵێ یەکەم جار دەبێ دەست پێ کرێ بەرێگای نەرم و نیان و لە سەرخۆ بۆ سەندنەوەی هەمو ئەو کەل و پەل و ماڵ و سامان و... هتد کەلە لایەن ئەوانەوە زەوت کراوەو هی موسوڵمانانە، شتێکی جەغت کراویشە، کە ئەو هۆکارانە سەردەگرێ و بەرووبومی دەبێ و هەر ئەوەشە دەبێتە ڕێخۆش کردنێك وسەرەتایەك بۆ جیهاد کردن بە چەك دژی ئەو زاڵم و بێ دینانە. وەرگێر.

ئەگەر من گەورەی ئێوەم عەلیش گەورەی ئێوەیە، عبیداللە خۆیدا پاڵ ئەوان‌و بە ابو عثمانی وت: بۆ چی خەڵك نەبنە بەندەی ئێمە؟ ابو عثمان پێی وت: گەورەمان محمدﷺ مەبەستی لە وشەی ولایة بەندە کردنی کەس نیە بۆ کەس، بەڵکو مەبەستی پێی ویلایەتی دینە ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَـٰكِن كُونُوا۟ رَبَّـٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَـٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِٱلْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ (آل عمران)

ئەگەر ئەم کارە خوای گەورە نەی دابێتە هیچ **پێغەمبەرێك** ئەوا بۆ غەیری **پێغەمبەران** بەپلەی یەکەم ڕەوانیە، عەلیش خۆ پێغەمبەر نەبوو، بەڵکو وەزیری **پێغەمبەر** بوو، عبیداللە پێی وت: بڕۆ کەس لەتۆ ناباتەوە،هەروەها باس کراوە،کە ابو عبیداللە الشیعي جارێکیان پێی وت لە قورئاندا هاتووە، کە **پێغەمبەر**ﷺ کۆتایی **پێغەمبەران** نیە، وتی: لە کامە ئایەت وتی:لەو ئایەتە﴿وَلَـٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ ﴾ الأحزاب ٤٠
کەواتە بەبەڵگەی ئەو ئایەتە **پێغەمبەر**ﷺ کۆتایی **پێغەمبەران** نیە.
سعید پێی وت: پیتی (و) لەو ئایەتە بۆ (إبتداء)نیە، بەڵکو واوی عەتفە وەکو وتەی خوای گەورە، کە دەفەرموێ ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْـَٔاخِرُ وَٱلظَّـٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ الحدید: ٣
کەس هەیە لە غەیری خوا بەو سیفەتانە وەسف بکرێ ؟

ڕۆژێکیش لەلای بوو قسەیەکی کرد جا یەکێك لە هۆزی کەتامە، کە ناوی ابوموسی بوو زۆر لەو قسەیە پەست بوو بۆیە بەرمەکەی بۆی هەڵسایەوە، بەڵام ابو عبیداللە نەی هێشت، پاشان ڕووی کردەابو عثمان و پێی وت: یا شێخ تورە مەبە، ئایە دەزانی ئەگەر ئەو پیاوە تورەبوو چەند کەس لە بەر تورەبوونی تورە دەبێ؟ دوانزە هەزار کەس.

ابو عثمان‌یش وتی: بەڵام من خودا لە بەر تورەبوونم تورەدەبێ، کە گەلی عادو سەمودو أصحاب الرس و زۆری تریشی لە ناو بردوە.

شێخ سعید خوای گەورە زۆر نیعمەتی دەرهەق کردبوو، کە دەنگێکی گەورەی هەبوو

خاوەن مەنتیق ورەوان بێژیەکی روون بوو زۆریش لە قەواعیدی عەرەبی شارازا بوو، ئەگەر هەڵەیەکیشی بکردایە هەر زوو دەیوت: أستغفرالله ئەگەر شیعریشی بوتبایە زۆر جوانی دادەرشت.

رۆژێك لە ماڵ دەرچوو بۆ گفت وگۆکردن لەگەڵ ابو عبیدالله الشیعي کە خێزان و منداڵەکانی لەگەڵ بوون و بۆی دەگریان، پێیانی وت: وامەکەن هەرخێر دەبێ ئەوە بەسە،کە من بۆ خوا دەرچوومە و بەرگری لە ئاینەکەی دەکەم، جا کە لەکۆشکی إبراهیم بن أحمد چووە لای ابو عبیدالله کە لە دەوروپشتی حاشیەی خۆی و کۆمەڵێکی تر ، کە بەناو زانا بوون دانیشتبوون جا سەلامی لێیان کردو، پاشان دانیشت، ابو عبیدالله وتیە: إبراهیم بن یونس کە پێشتر هەواڵیان دابوێ، کە ئەو شێخە قازی ئەو شوێنە بووە، پێی وت: بەچ شتێك قەزاوەتت دەکرد؟

إبراهیم پێی وت: بە کیتاب و سوننەت.

ابو عبیدالله وتی: سنة چیە؟

إبراهیم وتی: سوننە یانی سوننە.

ابو عثمان وتی: کە گوێم لێبوو وتی: السنة.... السنة بە ابوعبیدالله م وت: ئەوکۆرە تایبەتە یان گشتیە؟

گوتی: گشتیە.

ابو عثمان وتی: بنچینەی وشەی سنة لە لای عەرەب بە واتای نموونە هێنانەوە دێت، شاعیریش دەڵێت:

تریك سنة وجه غیر مقرفة ماساء لیس بها خال و لا ندب

سنة لێرە بەمانای نموونە هاتووە واتە نمونەی دەمو چاوێکت نیشان دەدەم ،کە هیچ کەمو کوری نیە.

سوننەتیش لە سێ شت کورت هەڵێنراوە:

یەکەم: هەڵسان بە جێبەجێکردنی ئەو فەرمانانەی خوا، کە بە پێغەمبەری راگەیاندەوە.

دووەم: وازهێنان لەو شتانەی قەدەغەی کردوە.

سێ یەم: شوێن پێ هەلگرتن لەو شتانەی کردویەتی.

ابو عبيدالله وتی: ئەگەر دوو فەرموودەی پێغەمبەر جیاوازی هەبوو لە لات چۆن ئیشیان پێدەکەی؟

پێم وت: سەیریان دەکەم کامەیان ڕاستربوو ئەوە وەردەگرم، پاشان دەگەڕێم لە دوای بەڵگەی هەق لەهەر دوو فەرموودە وەکو ئەوەی دوو شاهێدی ڕاست گۆ لەشاهێدیدانەکدا یەك ڕانەبن، بۆیە هەر دەبێ لە هەردوو شاهێدیدانەکە لەبەڵگی هەق بگەڕێین.

ابو عبيدالله وتی: ئەگەر دوو فەرموودەکە لە ڕاستی وەك یەك بوون.

پێم وت: ئەوا ئەوکاتە یەکێکیان ناسیخە و ئەوی تریان مەنسوخە.

وتی: ئێوە ئەو قسەتان لە کوێ هێناوەو چۆن قیاس دەکەن .

پێم وت:لەکیتابی خوا.

وتی: لە کامە ئایەت؟

وتم: خوای گەورە لە کیتابەکەی دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ ﴾ المائدة ٩٥

خودی وشەی صەید لەو ئایەتەدا زانراوە، بەڵام ئەو سزایەی دروست دەبێت لە سەر ئەو صەیدە ئەوە دەقی لە سەر نەهاتووە، لەوەوە زانیمان، کە خوای گەورە فەرمانمان پێدەکات، کە بەقیاس و ئیجتهاد ئەو شتە بدۆزنەوە، کەدەقی لەسەر نەهاتووە بۆیە خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ ﴾ المائدة ٩٥

بۆیەش خوای گەورە ئەو کارەی نەگەڕاندۆتەوە بۆ حاکمێك، بەڵکو بۆ دوو کەسی گێڕاوەتەوە بۆ ئەوەی قیاس و ئیجتهاد بکەن.

ابو عبيدالله وتی: ﴿ذَوَا عَدۡلٖ﴾بەکێ دەوترێ؟ پاشان سەرێکی باداو وتی: بە دەقی ئەو ئایەتە﴿ذَوَا عَدۡلٖ﴾ چەند کەسێکی تایبەتن.

منیش وتم: ﴿ذَوَا عَدۡلٖ﴾ ئەو کەسانەن، کە خوای گەورە لە ئایەتی: (مراجعة) باسی لێوە کردوون، کە دەفەرموێ: ﴿وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ﴾الطلاق:٢ بۆ جێگیرکردنی (قیاس)یش فەرمویەتی: ﴿وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ

﴿يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ﴾ النساء ٨٣ (إستنباط)يش دياره، كه دەقی لەسەر نەهاتووە.

پاشان ابو عبيدالله ڕووی لەموسی القطان کردو پێی ووت: له کتابی خوا حەددی ئارەقتان له کوێ هێناوه؟

موسی پێی وت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (من شربها فاضربوه بالأردية[1]، ثُمَّ إن عاد فاضربوه بالأيدي، ثُمَّ إن عاد فاضربوه بالجريد)[2]

ابو عبيدالله به تورەیی وتی: ئەمەچ پەیوەندیەکی بەم مەسەلەیە هەیە؟ من دەڵێم سزای ئارەق کوانێ له کتابی خوا، تۆش دەڵێی: (اضربوه بالأردية و بالأيدي، ثُمَّ بالجريد)؟

ابو عثمان وتی: پێم وت: سزاکەی قیاس کراوه له سەر سزای بوختان چی، چونکه ئەگەر ئارەقی خوارد بێهۆش دەبێ، ئەگەریش بێهۆش بوو ئاگای له خۆ نامێنێ، ئەگەریش ئاگای له خۆ نەما بوختان دەکا، بەو پێیه سزای بوختان کەری لێدەردەکرێ.[3]

ابو عبيدالله به موسی القطانی وت: ئەی پێغەمبەر ﷺ نەی فەرموه( أقضاكم علي)؟

ابو موساش تەواوی فەرمودەکەی بۆ باس کرد ،کە پێغەمبەری خوا فەرمویەتی(أعلمكم بحلال الله وحرامه معاذ، وأرفأكم ابو بكر، وأشدكم في دين الله عمر) خوای گەورە له هەمویان ڕازی بێت.

ابو عبيدالله پێی وت: چۆن دەبێ عومەر له هەموویان توندو تۆڵ تربێ بۆ دینی خوا له کاتێك له ڕۆژی حونەین ڕای کرد؟

ابو موسی پێی وت: ئەوەمان نەزانیوەو نەشمان بیستوه.

ابو عثمان وتی: عومەر خۆی دا پاڵ کۆمەڵێك هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ﴾ الأنفال ١٦.

ئەوەی لەشەڕ ڕای کرد بۆ ئەوەی خۆی بداته پاڵ کۆمەڵێك ئەوا به هەڵاتو له قەڵەم نادرێ.

ابو عبيدالله ڕووی له حاشیەکەی خۆی کرد وتی: گوێتان لێ بوو شێخ چی وت: وتی: بە

---

١ـ أردية واتة: شورك

٢ـ جريد: پەلکی خورما.

٣ـ بروانه: رياض النفوس ب٢ لا ٧٩

فەرمانی خوا کاری کردو خۆی دا پاڵ کۆمەڵێك، پاشان وەڵامی ابو عثمانی دایەوە، کە بە دەستیش ئاماژەی کردو وتی: چ کۆمەڵێك لە کۆمەڵی **پێغەمبەری** خوا گەورەتر نەبووەو لەگەڵ ئەوەی خۆی نەدا پاڵ هیچ کۆمەڵێك، ئەم وەڵامەشی زۆر بە کزی دایەوە، کە ئەوانەی لە نزیکی بوون گوێیان لێبوو.

ابو عثمان پێی وت: **پێغەمبەر**ﷺ فەرمویەتی:(عمر فئة فمن تَحَيَّز إلى عمر فقد تَحَيَز إلى فئة).

لێرە ابو عبیداللە بێدەنگ بوو[1].

ئەم جارەابو عبیداللە پرسیارێکی لە ابو عثمان کردو وتی: ئایە خوای گەورە بڕیاری نەداوە، هەروەکو دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ﴾ آل عمران ١٤٤.

بەوەی هاوەڵانی محمدﷺ هەڵگەرایەوە.

ابو عثمان پێی وت: نەخێر، بەڵکو مانای ئایەتەکە ئەوهایە ئەگەر(محمد) مرد، یان کوژرا بەتەمای هەڵگەڕانەوەن لەسەر پاژنەی پێتان، چونکە مانای﴿أَفَإِيْن مَّاتَ﴾ بۆ ئیستفهامە مانای ﴿ٱنقَلَبْتُمْ﴾یش یانی ئایە هەڵدەگەڕێنەوە، ئەرگەر دوو ئیستفهامیش پێکەوە لەیەك مەسەلەدا هاتن ئەوا یەکێکیان لە باتی ئەویتریان کافیەو جێی دەگرێتەوە، ئەو ئیستیفهامەی لەو ئایەتەدا هاتووە ماناکەی بۆ تەقریرە بەوەی ئەگەر محمد مرد لەسەر پاژنەتان هەڵمەگەڕێنەوە.

ابو عبیداللە وتی: ئەوەی وتت هاوشێوەی هەیە لە کیتابی خوا ، بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەو پشتی بگرێت؟

وتی: بەڵێ، خواگەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَـٰلِدُونَ ﴾ الأنبياء: ٣٤

واتە: ئەگەر تۆ مردی ئەوانیش دەمرن و نامێننەوە، ئەگەر دوو ئیستیفهام پێك گەیشت ئەوا یەکێکیان بەسە لە باتی ئەویتر باس بکرێ ، مەبەستیش لەو ئیستیفهامە بۆ تەقریرە، واتە:

---

[1]ـ بڕوانە: رياض النفوس ب٢ لا٨٠

ئەگەر تۆمردی نەمایەوە ئەوە ئەوانیش دەمرن و نامێنەوە.[1]

ئا بەم شێوەیە ابو عثمان سعد الحداد بەو گفت و گۆیانە بەرگری دەکرد لە عەقیدەی ئەهلی سوننەو جەماعە.

کە وەفاتی کرد شاعیرەکان شیعریان بەسەردا هۆنیەوەو سەرەخۆشیان لێکرد لەوانە سهل بن إبراهيم الوراق، کە دەڵێ:

وقالوا قضى نحبه ذاق منية — فيالك من خطب يحل عدى

وكم مارق عادى سعيداً وسبه — وضاق به ذرعاً وبداه بالهجر

يود بقلب ذاب هما ذا غصة — لو أن أبا عثمان في ظلم القبر

وأن أمر منكم تمنى وفاته — وليس له عذر ففي واسع الغدر

فليت الذي أمسى شجى في حلوقهم — يمد له حبل الحياة إلى الحشر

أليس لسان المسلمين وسيفهم — إذا كادهم أهل الضلال والكفر

أليس هلال الأرض بل شمس دجنها — وبدر دجاها حين أمسيت بلا بدر

يجيب وما ضاعت دقائق فكره — جواباً في أدق من السحر[2]

ئەوە هەندێك بوو لەو هۆكارو شێوازو گفتوگۆیانەی، کە زانایانی ئەهلی سوننە پێی هەڵسان بۆ بەرگری کردن لە بیروباوەڕی موسڵمانان لە خواوە ڕەحمەت بڕژێ بە سەریانو لێیان ڕازی بێت لەو جیهادو بانگەوازو فیداکارەیەی ئەنجامیان دا.

٨ــ شاعیرانی ئەهلی سوننە بە هۆنراوەکانیان هەڵسان بەهێرشێکی زۆر دژوار دژی عوبەیدیەکان، کە لە شمشێری بڕەڕو تیژ سەخت تر بوو لە لایان، سەرچاوەی سەرەکیش لەم بارەیەوە شاعیری پایەبەرز ابوالقاسم بوو، لە بەناوبانگترین شیعرەکانی هۆنراوە رائیەکەیەتی، کە لە هەموو کون و کەلەبەرێك و شوێنێك بڵاوبوویەوە، کە دەڵێت:

عجبت لفتنة أعمَت، وعَمَّتْ — يقوم بهاد أو كفور

تزلزت المدائن، والبوادي — لها وتلونت منها الدهور

وضاقت كل أرضض عرض — ولم تغن المعاقل والقصور

---

١ــ بڕوانە: رياض النفوس ب٢ لا٨٣

٢ــ رياض النفوس ب٢لا ١١٥

فنجى القيروان وساكنيها	إله دافع عنها قديد
أحاط بأهلها علما وخبرا	وميزاناً ما أكنته الصدور
وجللهم بعافية وأمن	وأسبل فوقها سترستير
وأثبت جلة العلماء فيها	بحار لاتعدلابحور
ومنها سادة العلماء قدما	إذا عدوا وليس لهم نضير
وفيها قوم عباد خيار	فقد طاب الأوائل والأخير
هم سلكوا سبايا الأرض	وفادوا ما استبد به المغير
كفيناهم عظائمها جميعاً	فزالت منهم ذلك الشرور
وسلكنا قلوباً خافقات	أمات عروقها ضرٌ ضرير
وآوينا وآسينا وكنا	لهم أهلاً وأكثرهم شطير
فبات طعامنا لهم طعاماً	هناكَ ودورنا للقوم دور
وكان لنا ثواب الله ذخراً	وقام يشكونا منهم شكور
ولولا القيروان وساكنوها	لغاب طعامهم والمخ ريُ[1]

پاشان هەرلە درێژەی هۆنراوەکەی دا دەڵێت:

وليس لنا كما لهم حصون	ولا جبل أعاليه وعور
ولاسور أحاط بنا ولكن	لنا من حفظ رب العرش سور
ولا نأوى إلى بحر وإنا	إذا قضى القضا تنحى البحور
ولكنا إلى القرآن نأوي	وفي أيماننا البيض الثغور
وسم في أعاليهنّ شهب	بها ظمأ مواردها النحور

هەروەها دەڵێت:

وإنا بعد من خوف وأمن	نحب إذا تشعشت الأمور
رسول الله والصديق حباً	به ترجى السعادة والحبور
بعدهما نحب القوم طراً	وما اختلفوا فربهم غفور

---

١ـ رياض النفوس ب٢ لا ٤٩٣.

ألا بأبي وخالصي وأمي | محمد البشر لنا النذير
سأهدي ماحييت له ثناء | مع الركبان ينجد أو يغور[1]

١ـ رياض النفوس ب٢ لا ٤٩٤

## دەوڵەتی صەنهاجی

### ڕێ خۆشکردن:

خەلیفەکانی دەوڵەتی عوبیەدی لە باتی هۆزە کەتامیەکان هۆزە بەربەریە صەنهاجیەکانیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشاو زۆر کاروباری گرنگیشیان لە دەوڵەت دانە دەستیو، پلەو پایەی صەنهاجیەکان لەسەر دەستی خێزانی ابو الفتوح الخارجي بەرز بوویەوە.. بۆیە عوبەیدیەکان بە دیاری حوکمی ئەفریقیاو مەغریبیان دایە دەستیان، دامەزرێنەری دەوڵەتی صەنهاجیش ابو الفتوح یوسف بن زیری بن مندادی صەنهاجییە، کە ماوەی حوکمڕانی کردنی دەست پێکرد بە لە ناوبردنی شۆڕشگێڕەکان و وڵاتی لێ پاکردنەوە.

### ئەوەڕەی یەکەم :ابو الفتوح یوسف بن زیری بن منداد بن منقوش الصنهاجي

(٣٦٢ــ ٣٧٣ك ٩٧٢ــ ٩٨٣)

یوسف بەلکینی کوری زەبری بوو بە والی هەموو ناوچەکانی ئەفریقیەو، بوو بە یەکەمین حاکمیش پاش فەتح کردنی ئیسلامی بۆ ولاتانی مەغریب، کە لەڕەچەڵەکێکی بەربەریە ، یوسف خۆی بەخت کرد بوو بۆ خزمەتکردنی عوبەیدیەکان و فراوان کردنی موڵکیان، کێشەیەکی سەخت پەیدا بوو لە نێوان هۆزە صەنهاجیەکان و هۆزی زەناتەکان، دەوڵەتی ئەمەوی لە ئەندەلوس توانی ئەو هەڵە بقۆزێتەوەو سوود لەم کێشەیە وەربگرێو توانی زەبرێکی کوشندە بوەشێنێ لە عوبەیدیەکانو بە هەموو توانایەوە یارمەتی هۆزە زەناتەکانی دا هەتا توانی لە ڕووی صەنهاجیەکان بوەستێ، سیاسەتی صەنهاجیەکان لەگەڵ زەناتەکان لەسەر توندوتیژی بنیاتنرابوو هەوڵیان نەدا نەرم نیان بن لەگەڵیان و بۆخۆیانیان ڕابکێشن، بۆیە دەوڵەتی ئەمەوی ئەوکێشەیەی قۆستەوە هەتا توانی مەغریبی سەرو لە دەسەڵاتی بنی زیری دابڕێ .

ئەمیر بەلکین چالاکیەکی بەرفراوانو کارێکی بێ وچانی کردو، زۆریش پاشکۆیەتی خۆی بۆ عبەیدیەکانو، خۆشەویستی بۆ مەزهەبی باطيني دووپات دەکردەوە، بەڵام بەخۆیو ئەو ئەمیرانەی لە دوای هاتن زۆر توند نەبوون لە سەر بەشیعەکردنی خەڵك، بۆیە بوارێکی باش ڕەخسا بۆ زانایانی ئەهلی سوننە بۆ ئەوەی سوننە بڵاوبکەنەوەو، ژیانی عیلمیش گەڕاوە

ناو مزگەوتەکان، بەڵام ئەو دیاردە فەرمیانەی ئەنجام دەدرا بۆ کار بەدەستە میسریەکان لە دوعا کردن بۆیان لەسەر مینبەرەکان ئەوا زانایانی تووشی نا ئارامی کردو، لە لایەکی تریش یارمەتی دەریبوو بۆ دروست بوونی کەلێنێکی قوڵ لە نێوان خۆیان و کاربەدەستەکانی بنی زیری، بۆیە بەردەوام بوون لە دژایەتی کردنی ئەو کاربەدەستانەی، کە گەرم وگوڕ نەبوون بۆ مەزهەبی ئیسماعیلی، ئەهلی باکوری ئەفریقیش لە دەوری زانایەکانی خۆیان خڕ بوونەوەو، بەردەوام بوون لە پچرانی پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەت، بەڵام ئەو کاربەدەستانە نەیان توانی هاو هەڵوێستی خۆیان ڕابگەیەنن لەگەڵ زانایانی ئەهلی سوننە ،چونکە دەترسان دەسەڵاتیان لەکیس بچێ، خەڵکی قەیرەوانیش هەستیان بەمە کرد، بۆیە زانایەکانیان کۆششێکی زۆریان کرد بۆ بڵاوکردنەوەی سوننەو ڕاو بۆچوونەکانی سەلەفی صالح، جا بازنەی وانەکانی زانایان لە قەیرەوان سەر لەنوێ جمەی هات لە قوتابیانو زۆر کیتاب نوسران لە ڕوونکردنەوەی ئیسلامی ڕاست ودروست، لەسەردەمی ئەمیری سوننی و شمشێری بەرەو چیای مەتین ئەمیر موعیز بن بادیس بەیەکجاری ئەهلی سوننە لەباکوری ئەفریقا سەرکەوتن بەسەر ڕەوافیزەکان.

## تەوەرەی دووەم: موعیزبن بادیس الصنهاجي٤٠٦ ـ ٤٤٩هـ

پێشەوا ذهبي لەو بارەیەوە وتویەتی خاوەنی ئەفریقیە موعیز بن بادیس بن منصو بن بلكين بن زيرى بن مناد الحميرى، الصنهاجي المغربي شرف الدولة بن أمير المغرب.[1]

لەڕۆژی سێ شەممە ٣ی مانگی ذي الحجة لە ساڵی (٤٠٩) کۆچی لە پاش باوکی بەسێ ڕۆژ بوو بە ئەمیر.[2]

هەندێك لە فەقیهەکانی سەر بەمەزهەبی مالیکی توانیان بچنە ناو دیوانی حوکم لە دەوڵەتی صەنهاجی و توانیان هەندێك وەزیرو ئەمیر بگۆڕن، کە پاش فەزڵی خوا ڕۆڵیان هەبوو لە سوك کردنی پاڵەپەستۆی دەوڵەت لەسەر زانایانی ئەهلی سوننە، بە تایبەت زانای پایەبەرز ابو الحسن الزجَّال کە توانی ئەمیر موعیز بن بادیس لەسەر ڕێڕەوی ئەهلی سوننەو جەماعە پەروەردە بکا ، ئەو پەروەردەیەش بەرو بوومی خۆی بوو کاتێك موعیز کاروباری

---

١ـ سير أعلام النبلاء ب ١٨ی ١٤٠

٢ـ تأريخ الفتح العربي في ليبيا لا ٢٨٦.

ئەفریقیەی گرتەدەست، ابوالحسن ئەو کارانەی دەیکرد هەمووی بەنهێنی بوو لێنەدەگەڕا کەس لەو شیعانە پێی بزانێ، کە دەوڵەت دەوڵەتی خۆیانیش بوو، ئەو زانایە زانایەکی زۆر ڕەسەن بوو خاوەن ڕەوشت و ئاینو بیروباوەڕێکی ڕاست بوو، زۆر ڕقیشی لە مەزهەبی ئیسماعیلی شیعی بوو، ئەو زانایە توانی زانست و زانیاری ڕاست دروست بچنێ لە دەروونو هۆش و هزری موعیز بن بادیس، کە لە سەر دەستی ئەو لە باکوری ئەفریقیە کۆتایی هات بە مەزهەبی ئیسماعیلی شیعی.

ئەمەش وانەیەکە بۆ ئێمەی بانگخواز لە گرنگی دان بە پیاوانی دەوڵەت و کۆڕەکانیان ئەوانەی خاوەن ڕێبیری عەلمانینو دوورن لە هیدایەتی خوای گەورە، بادروشمی بانگخوانیش لەم بوارەدا ئەم ئایەتەی خوای گەورە بێت: ﴿وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا ﴿٢٠﴾﴾ الكهف.

مێژوونوسەکان موعیز بن بادیسیان بە جوانترین و قەشەنگترین شێوە وەسف کردووە، ذهبي لە بارەیەوە وتویەتی: پادشایەکی بە هەیبەت بوو، شاعیران زۆریان بەسەردا گوتوە، لە سەردەمی ئەو خەڵکی زۆرکاری بە مەزهەبی ابو حنیفة دەکرد، بەڵام ئەو وای کرد خەڵکی ناوچەکە بڕۆنە سەر مەزهەبی مالیك ئەمەش بۆ ئەوەی خیلاف و دووبەرەکی نەمێنێ و لەهەموو کارەکانیشی بە پێی ئیسلامەکەی خوا هەنگاوی دەناو زۆر بوێرانەش گوێڕایەڵی عوبەیدیەکانی نەدەکردو، وتارێکیشی لەسەر قائم بأمرالله العباسی خوێندەوەو موستەنصیریش هەڕشەی لێکرد، بەڵام ئەو گوێی نەدایەو نەترسا.[1]

مستنصر لەو نامەیەی، کە هەڕەشەی لەموعیز کردبوو وتبووی: بۆ ڕەوشتی باو وباپیرانت لە وەلائو گوێڕایەڵی هەڵناگری، موعیزیش لە وەڵامدا پێی وت: پێش ئێوە باو وباپیرانی من پادشای مغرب بوونو، هەر لە خزمەتیان گەلەکەی خۆیاندا بوونەوەو بەشمشێرەکانیان ئامادەبوونە بۆ سەرخستنیان.[2]

---

١ـ سير أعلام النبلاء ب ١٨ی ١٤٠

٢ـ تأريخ الفتح العربي في ليبيا لا ٢٨٩.

کتێبەکانی مێژوو بۆ ئێمەیان ڕوون کردۆتەوە، کەموعیز هەنگاو بە هەنگاو دوژمنایەتی ئیسماعیلیەکان و فەرمان ڕەوایانی میسری دەکرد، ئەمەش زیاتر لە ساڵی(٤٣٥) کۆچی بە دیارکەوت، کاتێك دیوانی دەوڵەتەکەی و سوپاکەی پاکردنەوە لەبیروباوەڕە کوفریەکان و ئەوانەی چێژ وەردەگرت لەجنێودان بە هاوەڵان ، موعیز بە سەربازەکانی راگەیاند، کە ئەوەی جنێوی دا بە ابوبکر وعمر بیکوژن، خەڵکی باکوری ئەفریقیش بە پەلە هەڵسان بە لە ناوبردنی پاشماوەی عوبەیدیەکان بۆ ئەوەی باکوری ئەفریقی پاك ببێتەوە لەو بیروباوەڕە گەندو بێگانانەی هاتبوە نایەوە.

زاناو فەقیهەکان هەڵسان بە مەدح کردن و باسکردنی ئەوکارە پیرۆزەی، کە موعیز بن بادیس پێی هەڵسا، شاعیرانیش هەڵسان بە هۆنراوە کانیان مەدحی موعیزیان کردو ئەو سەرەتایەشیان تدوین کرد، قاسم بن مروان لەم ڕوداوانە وتویەتی:

وسوف يقتلون في كل أرض      كما قتلوا بأرض قيروان

یەکێکی تریش دەڵێت:

يا موعيزالدين عش في رفعه      وسرور واغتباط و جدل

أنت أرضيت النبي المصطفى      وعتيقاً في الملاعن السفل

وجعلت القتل فيهم سنة      بأقصى الأرض في كل الدول[١]

موعیز بن بادیس بەردەوام بوو لە نزیك بوونەوە لە زاناو فەقیهەکانی ئەهلی سوننەو، پیلانیشی بەردەوام بۆ ئەوە دادەنا، کە بەیەك جاری جودا بێتەوە لەعوبەیدیەکانی میسرو، واشی کرد مەزهەبی مالیکی ببێتە مەزهەبی فەرمی دەوڵەتو ڕاشی گەیاند، کە ئەو سەر بەدەوڵەتی عەباسیەکانە و ئاڵاو دروشمەکانی دەوڵەتی عوبەیدیشی سوتاندو، فەرمانیشی کرد، کە ئەو درهەم ودینارانەی ماوەی(١٤٥) ساڵان وێنەی عوبەیدیەکانی لە سەربوو بیسڕنەوەو سکەیەکی تریان دروستکرد،کە لەسەر لایەکی نوسرابوو لاإله إلا الله لە سەر لایەکەی تریشی نوسرابوو﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ آل عمران: ٨٥.

---

١ـ تأريخ الفتح العربي في ليبيا لا ٢٨٩.

هەروەها موعیز بن بادیس هەڵسا بە لە ناوبردنی مەزهەبی صفرية و نكارية و معتزلة و أباضية ئەوانەی دژی مەزهەبی سوننی بوون.

لەساڵی (٤٣٣) كۆچی بەرقە هەمووی هاتە ژێر ڕكێفی موعیز بن بادیس پاش ئەوەی، كە ئەمیرەكەی جبارة بن مختارة گوێڕایەڵی خۆی بۆ ڕاگەیاند.

یەكەمین كەس لەتەڕابلس ، كە قیادەی شاڵاوی پاكسازی كرد لەسەر ئیسماعیلیەكان و دژایەتی نەریتە پوچەكەیان و بانگەشە گومڕایەكەیانی كرد زانای پایە بەرز علی بن محمد المنتصر بوو،كە ابو الحسن بانگ دەكراو لە ساڵی (٤٣٢) وەفاتی كردوە.

ڕق و كین لەدەروونی باطنیەكان وەك گڕكان تەقیەوە بۆیە بڕیاریان دا تۆڵە بسەننەوە لە سەركردەی ئەهلی سوننەو ئەو خەڵكەی دڵ خۆش بوون بەگەڕانەوەی وڵاتیان بۆ باوەشی ئەهلی سوننە، بۆیە لە قاهیرە دانیشتنێكی رافضي سازدرا بە قیادەی خەلیفەی عوبەیدی، كە لەسەر ڕایەكی شەیتانی ڕێكەوتبوون ناوەڕۆكەكەی ئەوەبوو، كە هۆزەكانی بنی سلیمو بنی هلال بەگژ صەنهاجیە سوننیەكان بنێن، ئەگەر دەوڵەتی صەنهاجی سەركەوت ئەوا دەوڵەتی عوبەیدی ئیدی قوتاری دەبێت لە جەنگ ئەو هۆزە سەرسەختانە، ئەگەر بنو سلیم و بنوهلالیش سەركەوتن ئەوا تۆڵەیان سەندەوە لە دوژمنە سەرسەختەكەیان موعیز بن بادیس ، ئەوەی دامەزێنەری ئەو بیرۆكەیە بوو وەزیرێكی عوبەیدی كە ناوی ابو محمد بن علی الیازوری بوو، كە دەستی كرد بەدەم چەوركردنی ئەو هۆزانەی نیشتەجێبوون لەسەر كەنارەكانی نیل و هەڵسا بەپێدانی چەكو بێداویستیەكانی جەنگو ،بەرقەو قەیروانو ئەوەی كەوتە چنگیان وەك: دیاریەك پێشكەشیان بێت ، عوبەیدیەكان هەڵسان بەپەیوەندی كردن بە هەموو ئەوانەی دژی موعیز بوونو بەماڵ و چەكو ئەوەی لە توانیاندا بوو یارمەتیان دان، جا بازنەی كێشەكە لە نێوان موعیز بن بادیس و هۆزە عەرەبیەكان دەستی پێكرد ، كە لەلایەن عوبەیدیەكانەوە یارمەتی دەدران.

## تەوەرەی سێ یەم :خشانی هۆزەکانی بنی سلیم و بنی هلال و هی تریش بۆ باکوری ئەفریقی.

ڕێ خۆشکردن: هۆزەکانی بنی سلیم وبنی هلال لە دوورگەی عەرەبی نیشتەجێبوون‌و، خیوەت و ڕەشماڵەکانیان لە دەرەوەی مەدینەو مەککەو طائیف و نەجد هەڵدابوو، قەرامیتەکان توانیان لەجەنگەکانیان بەکاریان بهێنن دژی خیلافەتی عەبباسی و دەوڵەتی عوبەیدی، سەرکردەی هەندێك لەو هۆزانە کاریگەربوون بە هەندێك لە هزرو بیروباوەڕی قەرامیتەکان، بەڵام کاریگەریەکی زۆر قووڵ نەبوو، بەڵکو چەند هۆکارێکی ئابووری و گوێڕایەڵی نەبوون بۆ دەوڵەتی عەبباسی بوو، لەجەنگی قەرامیطەکان دژی عوبەیدیەکان ئەو هۆزانە لەشام کە خاون هێزێکی زۆرو چەکو کەرستەیەکی زۆربوون ڕۆڵێکی بەرچاویان بینی.

لەمیسر ئەمیری عوبەیدیەکان توانای ئەو هۆزانە بەماڵ و سامان‌و دیاری ڕابکێشێت‌و لە خۆی نزیك بکاتەوە، ئەوانیش زۆر بەکارەکەی خەلیفەی عوبەیدی ڕازی بوون ، کە زۆر موکڕ بوو لەسەر هەبوونی توخمێکی عەرەبی لە دەوڵەتەکەی، دەوڵەتی عوبەیدی لەسەر کەنارەکانی نیل زەویەکی بەپیتی پێدان‌و ئەو هۆزانەش خۆشەویستی‌و دۆستایەتیان بۆ دەوڵەتی عوبەیدی دەربڕی و لە بەر نەفامیش بە حەقیقەتی دینەکەیان دروشمەکانی ئەوانیان هەڵگرت و دڵسۆزی خۆیان بۆ خەلیفەی عوبەیدی نواند، ئەو خەلیفەیە بڕیاریدا بە هۆی ئەو هۆزانە کە خاوەن هێزو تواناو شارەزایەکی جەنگی باش بوون تۆڵە لە موعیز بن بادیس بسەنتەوە، بەتایبەتی ،کە دەولەتی عوبەیدی لەبەر سەرقاڵ بوونی بە قەرامیطەکان‌و پرۆژەکانیان بەگشتی لەشام‌و ڕۆژهەلات نەی توانی لەشکری خۆی بنێرێ،هەروا لەبەر ئەوەی هەندێك کۆمەڵ لە لەشکرەکەی لە مەغاریبەکان بوون، بەلکو لەسەرکردەکانیان تێیدا هەبوو لەهۆزی موعیز بن بادیس بوون، کە دەولەت هەر لەسەردەمی خەلیفەی عوبەیدی عزیز ئەو سەرکردەو سەربازانەی فەرامۆش کردبوو.

هەندێك لە هۆزە عەرەبیەکان لە صەعیدی میسر دەگەڕێنەوە بۆ فەتحی ئیسلامی ،کەژمارەیان زیادی کرد پاش ئەوەی دوورگەی عەرەبیان بەجێ هێشت‌و لەسەردەمی العزیز العبیدی هاتنە میسر.

هۆزە عەرەبیەکان هەندێکیان، کە لە سەردەمی العزیز العبیدی هاتبوونە صەعیدی میسر کە بەکاری شێواندنو تێکدانی باری ئاسایش بەناوبانگ بوون، بۆیە ئەم جارە هەلێکی زێڕینە بۆ لەناو بردنیان و تۆڵەسەنەوە لە دوژمنی سەرسەختی دەوڵەت.

وتەیەك هەیە، کە درایتە پاڵ مستنصر دەڵێت: وەللاهی دەبێ سوپایەکیان بۆ ئامادە بکەم، کە خۆم هیچ پێی ماندوو نەبم ، جا عەرەبەکانی بانگ کردو مەغرییش نیلی دا بەردەستیان ،کە پێشتر لێیان قەدەغە کرا بوو جا بەم جۆرە خەڵکێکی زۆریان پەڕینەوەو هاتن.[1]

ئەمیر مستنصر کۆبویەوە لەگەڵ گەورە پیاوانی هۆزە عەبەرەکان و یارمەتی ماددی و مەعنەوی دانو، ئەسپ وچەك و هەموو کەل وپەلێکی جەنگی و ماڵی پێ بەخشین.

بۆ ئەوەی ئامانجە گڵاوەکانی بێنێتە دی ئەفریقیەشی دانێ، کەچی لێ دەکەن بیکەن و پێی گوتن: من ئەفریقیە و موڵکی إبن بادیسم دانێ ئیتر باش ئەوە هەژاری بە خۆوە نابینن.[2]

کاتێك عەرەبەکان لە ساڵی (٤٤٢) کۆچی بەرامبەر ١٠٥٠ زاینی هەموو کۆبوونەوە، وەزیری ڕق هەڵساوی عوبەیدی نامەیەکی بۆ إبن بادیس نارد، کە پێی وتبو: (أما بعد فقد أرسلنا خیولا فحولا وحملنا علیهم رجالا کهولا لیقضي الله أمرا مفعولا[3])

ئەو هۆزانە توانیان بە بێ بەرگری دەست بەسەر بەرقە دابگرن و، بەرقەش پێشتر لەسەر دەستی عوبەیدیەکان وێران کرابوو، لە سەردەمی مستنصر گوێ ڕایەڵی خۆی ڕاگەیاندبوو بۆ موعیزو، ئەو مینبەرانەشی سوتاند، کە عوبەیدیەکان وتاریان لەسەر دەخوێندەوەو ئاڵایەکانیشی سوتاندن و ڕاشی گەیاند، کە ئەو سەر بەدەوڵەتی عەباسییە.[4]

جا هۆزە عەرەبەکان ڕۆیشتن بۆ تەرابلس و دەوروبەری تونس، کە ژمارەیان چوارسەد هەزار کەس دەبوو، لە دواشیانەوە وەك یەدەگەکێك هێزێکی گەورە هەبوو بۆ یارمەتی

---

١ـ ظهور الخلافة الفاطمیة وسقوطها، عبدالمنعم ماجد لا٢٢٣.

٢ـ بڕوانە: تأریخ الفتح العربي لا ٢٤٩.

٣ـ ظهور الخلافة الفاطمیة وسقوطهالا ٢٤٣

٤ـ هەمان سەرچاوە لا ١٤٤.

دانیان، هەندێك مێـژوو نـووس دەڵـێن: هـەموویان ژمارەیـان دەگەیشـتە ملیـۆن کـەس، کـە دابەش کرابوونە بەسەر چەند قۆناغێك، ئـەو هۆزانـە، کـە جێگیربـوون لـە بەرقـە یـەکێك لـە شێخەکانی خۆی، کە ناوی مۆنس إبن یەحیا بن مرداس بوو ناردی بۆ ئەوەی ببێتـە میـوانی موعیز ، جا مۆنس سەرسام بوو بەو نازو نیعمەتەی، کە موعیز تێـی دابـوو مـوعیز زۆر ڕێـزو حورمەتی گرت و پاشان ڕایگەیاند کە لەنەوەی مامی ریاح پیاوانێك ئامادە بکات بـۆ ئـەوەی ببنە سەربازو بێنـە ژێر دەسـەڵاتی ، بـەڵام مـۆنس ئامـاژەی بـۆ کـرد ئـەو کـارە نـەکات و هۆیەکەشی بـۆ ڕوون کـردەوە، کـە لەبـەر پەرتـەوازەییان و کۆنەبوونـەوەیان لەسـەر یـەك ڕا بەدەم بانگەوازەکەتەوە نایەن، بەڵام موعیز قەناعەتی بەقسەی مۆنس نەهات.

مۆنس بە موعیزی وت تۆ درەقەتی ئەوانە نایێت.

مـوعیزیش پێـی وت: ئەوانـە لـەوە کـەمترن، کـە باسـیان دەکـەی، مـۆنس ئەمـەی وەك سەرزەنشتێك بۆ عەرەب لێکدایەوە، موعیزیش بەڕاشکاوی پێـی وت، کـە: ناتـەوێ جگـە لـە خۆت کەس گەورەی گەلەکەت بێ.

جا مۆنس کە گەڕایەوە بۆ لای گەلەکەی هانی دان و باسی خێرو خێراتـی ئەفریقیـەو ئـەو نازو نیعمەتانەی کرد، کە موعیز لە نێـوی دایـە ئـەوانیش هـەرزوو کۆچـیان کـردو ژمارەیـان ئەوەندە زۆربوو، کە سەرو بنی دیار نەبوو.[1]

لە بەناو بانگترین ئەو هۆزە عەرەبانەی چوونە لای موعیز بنو سلیم بن منصـور و بنـو هـلال بن عامر بوون کە هەردووکیان لە عەشیرەتی مضر بوون، لە موضةرة عەدنانیەکانیش هـۆزی زغبەو أثبج و عدیو ریاح ئەوانەی لە هلال بن عامر صعصعه وبنی هاشم بن معاویەن.

هەروەها کەهلانیش کە قەحطانی بوون و چەندهۆزێکی تریش، کە ناودار نەبوون.

کاتێك بنو ریاح و أثبجو بنو عدی بـۆ ئەفریقیـە چـوون، دەیـان ویسـت بگەنـە قـەیرەوان، مــۆنس پێیــانی وت: ئــەوەی ئێــوە بڕیارتــان لــە ســەرداوە تــەواو نیــەو پێویســتی بەبیرکردنەوەیەکی تۆکمە هەیـە، پێیـان وت: ئـەی چـی بکـەین؟ وتـی: بـەرماڵێکم بـۆ بێـنن ئەوانیش بۆیـان هێنـا، ئـەویش ڕای خسـت و پێیـانی وت: کـێ دەتوانـێ بچـێتە ناوەڕاسـتی

---

١ــ بڕوانە: تأريخ الفتح العربي لا ٢٩٥.

بەرماڵەکە بێ ئەوەی بەسەری دا بڕوات؟ جا وتیان:کێ دەتوانێ وابکات؟ وتی: من، بەرماڵەکەی لولدا ئەنجا هاتە لایەکیو بە ئەندازەی بستێك کردیەوەو ئەنجا لە سەری ڕاوەستا، پاشان لایەکی تریشی کردەوەو چووە سەری و وتی: ئەوها بە وڵاتانی مەغریب بکەن ، بەش بەشی بکەنو بیکەنە موڵکی خۆتان تەنها قەیرەوان نەبێ و دواتر بڕۆن ئەویش دەبێتە موڵکی خۆتان ، رافع بن حماد کە یەکێك بوو لە سەرکردە عەرەبەکان پێی وت: مۆنس تۆ ڕاست دەکەی وەڵاهی تۆ شێخ و ئەمیری عەرەبانی ، ئەوا بە پێش خۆمانمان خستی و، هیچ کارێك بەبێ فەرمانی تۆ ناکەین.

هۆزەکان تیرەپشکیان کرد لە سەر وڵاتەکان، ڕۆژهەڵاتی مەغریب وەك بەرقە و چواردەوری بەبەر بنی سلیم کەوت، کە دەکا طرابلس و قابس، بنو جەشمیش هاتە پاڵ بنو هلال.

جگە لە بنو هلال و بنو سلیم، کە عەرەب بوون و هەروەها جشم بن معاوية بن بكر بن هوزان و سلول بن مرة بن صعصعة بن معاوية و معقل کە لە تیرەیەکی یەمەنی بوون، هەمووشیان لە ژێر حوکمی بنی هلال بوون بەتایبەتیش لە ژێر حوکمی أثيج بوون، چونکە براگەورەیی هەر بۆ بنی هلال و أثيج بوو، بۆیە چوونە ناویان. أثيج ژمارەو تیرەیان زیاتر بوو، هەر ئەوانیش لەپێشەوەی هەڵمەتەکان بوون، تیرەکانیشیان وەك ضحك و مقدم و عاصم و لطيف و دريد و كرفة بوون هەروەکو لە ڕەچەلەکەکەیان ئەوها دەردەکەوێ.

ئەوانە زۆر بە هێز بوونو لەو هیلالیانە بوون ،کە هاتبوونە ئەفریقیە،یەکێك لەهەرە پیاوە خانەدانەکانیان حسن بن سرحان و برایەکەی بدرو فضل بن ناهض بوون،کە ئەوانە لە دريدی کوری اثيج بوون.ماضي بن يقرب و سلامة بن رزق لەتیرەی کرفة بوون، ذياب بن غانم وموسی بن يەحيا لە بني صقر بوون کە تیرەیەکن لە مرداس رياح .زيد بن زيدان وفارس بن ابي الغيث وبرایەکەی عامرو فضل بن ابي علي ئەوانە لە شیعرەکانیان باسیان لێوە کراوە.

## تەوەرەی چوارەم :بەگژدایەکچوون لە نێوان موعیز بن بادس و هۆزە عەرەبەکان.

لە ڕووداوەکانی ساڵی(٤٤٢) کۆچیدا إبن الأثير باسی هاتنە ژوورەوەی عەرەبەکانی کردووە بۆ ئەفریقیا و وتویەتی: پاشان ئەمیرە عەرەبەکان هاتنە لای موعیز بن بادیس و ئەویش کردنیە براگەورەو ماڵ سامانێکی زۆریشی پێبەخشین، کە لەلای ڕۆیشتن پاداشتی کارە چاکەکەیان نەدایەوە، بەڵکو هێرش دوای هێرشیان کردە سەرو ڕێگریان کردو کشت و

کالّ و بەروبومەکانیان لە ناو بردو، ئابلۆقەی شارەکانیشیان داو خەڵکیش گوزەرانیان لێ تاڵ بوو بژێویان لێ تێك چوو نەیان توانی سەفەر بۆ هیچ لایەك بکەن، بەلاو بەلایەکی یەکجار تەنگ توشی ئەفریقیە هات، کە هیچ جار بەخۆوەی نەبینیبوو، لێرە موعیز خۆی ئامادە کردو سەربازەکانی کۆکردەوە، کە ژمارەیان سێ هەزار سوارچاك و پیادەشیان لەگەڵدا بوو، جا ڕۆیشت بەرەو قەیرەوان، ژمارەی عەرەبەکانیش سی هەزار سوار چاك بوو، ڕاستیش وایە، کە ژمارەیان وەکو ژمارەی سەربازەکانی موعیزبووە هەروەکو خاوەنی موسوعة المغرب العربي باسی کردوە، کاتێك عەرەبەکان سەربازەکانی صەنهاجە و عەبیدەکانیان بینی زۆر ترسان و شلەژان و لەرزین، جا مؤنس بن یحیی پێی وتن: ئەمە چیە لەم ڕۆژە ڕادەکەن ؟ وتیان: چۆن بتوانین لەوانە بدەین لە کاتێك زرێو کلاوی ئاسنیان لەسەر کردووە؟ وتی: نیشانە بگرن و لە چاویان بدەن، بۆیە ئەم ڕۆژە ناوی لێنرا (یوم العین)، ئەنجا هەر دوولا گەیشتنە یەك و شەرێکی توندو خوێناوی لە نێوانیاندا ڕوویداو صەنهاجە دۆڕاو ڕووخا، بەلام عەبیدەکان هەر لەگەڵ موعیز مانەوەو خەڵکێکی گەلەك زۆریان لێکوژرا... دۆڕانەکەلە صەنهاجە هەر بەردەوام بوو خەلکێکی یەکجار زۆر کوژراو ، موعیز لەگەڵ ئەوەی ژمارەشیان زۆربوو بەدۆڕاوی گەڕاوە ناو قەیرەوان و، عەرەبەکانیش ئەسپ و ڕەشماڵ و ئەوەی هەبوو بۆخۆیانیان برد.[1]

کتێبەکانی مێژوو ئەو ڕووداوەیان بە دژوارترین شێوە وەسف کردیە، چونکە جەنگێك بووە کوشتارێکی زۆری لێ ڕوودواە، ئەمەش لە ئەنجامی خۆڕاگرتنی هەردوو سوپا بەرامبەر یەکتری لە پێناوی لە ناو بردنی بەرامبەرکەی و کۆتایی پێهێنانی، شاعیری عەرەبی علی بن رزق البراحی چەند دێرە شیعرێکی وتوە لە سەر ئەو جەنگەی ڕوویدا لە نێوان موعیز و عەرەبەکان:

وإن إبن باديس لأحزم مالك ولكن لعمري مالديه رجال
ثلاثة آلاف لنا غلبت له ثلاثين ألفا إن ذا لنكال.

---

١ــ الكامل في التأريخ ب ٦ لا ١٥٣.

هەر لە سالّی (٤٤٢)کۆچی لە ڕۆژی چەژنی قوربان موعیز حەوت هەزار سوارچاکی کۆکردەوەو لە ناکاو هێرشی کردە سەر عەرەبەکان، کە لە نوێژی چەژن دابوون، عەرەبەکانیش هەڵسانەوەو سواری ئەسپەکانیان بوون و هێرشیان کردە سەر سەربازەکانی موعیزو تێکیان شکاندن و خەڵکێکی زۆریان لێ کوشتن، پاشان موعیز لە صەنهاجە و زەناتە خۆی کۆکردەوەو بە خۆی و کۆمەڵێکی زۆر دەرچوون‌و، هێرشیان کردە سەر عەرەبەکان لە ماڵەکانی خۆیان بەڵام هێزو شەوکەتی صنهاجە شکاو، زەناتەش پشتی لە پاش کرد، موعیزو ئەو عەبیدانەی لە گەڵی بوون بە جۆرێك خۆیان ڕاگرت و مانەوە، کە قەت نموونەی نەبووەو پاشان موعیز دۆڕاو بۆ مەنصوریە گەڕایەوە، عەرەبەکان هاتن هەتا لەمزگەوتی قەیرەوان جێگیربوون و چەند جەنگێکی خوێناویش لەگەڵ موعیز کرا، کە لەمەنصوریە و ڕەقادە خەڵکێکی زۆر کوژرا، پاشان، کە موعیز ئەم کارەساتەی بینی ڕێی بە خەڵکەکە دا بچنە قەیرەوان بۆ کرینی پێداویستیەکانی ژیانیان، کە چوونە ناویەوە خەڵکی لێیان هاتنە پێشو بوو بەشەڕ ، هۆی شەڕەکەش فیتنیەك بوو لە نێوان پیاوێکی عەرەب و یەکێکی تر ڕوویداو عەرەبەکان تیایدا سەرکەوتن، لە سالّی (٤٤٦) کۆچی موعیز وتیە گەلەکەی کە کۆچ بکەن بۆمەهدیە ئەمەش لە بەر عەرەبان، کە نەیتوانی گەلەکەی لێیان بپارێزێ.

پاش ئەوەی کاروباری پایتەختی نوێ زیریەی ڕێکخست موعیز لە سالّی(٤٤٩) کۆچی بۆ مەهدیە چوو لەوێ تەمیمی کوڕی پێشوازی لێکرد، عەرەبەکانیش دەستیان بەسەر قەیرەوان داگرت و قەڵاو کۆشکەکانیان وێران کرد و هەرچی بەروبومی کشتوکاڵی هەبوو لێیان کردەوەو، جۆگەو ڕووبارەکانیان وێران کرد، ئەو ڕووداو جەنگانەی موعیز لەگەڵ عەرەبەکان بەخۆیەوەی بینی وانەیەك بوو بۆی دەرکەوت و قەناعەتی کرد، کەوا تاقەتی عەرەبەکانی نیەو پێیان ناوێرێ و هەروا هاتە قەناعەت، کە عوبەیدیەکان فێلێکی باشیان لێکردوە ،یەکێك لە هۆکارەکانی ئەو دۆڕانە یەك لە دوای یەکانەی تووشی موعیز هات هێزو ئازایەتی و چاونەترسی عەرەبەکان بوو، لەگەڵ سەرشۆڕی سەربازە بەرابیرەکان ئەوانەی بەردەوام خیلافەتی عوبەیدیەکانیان بەرز ڕادەگرت و بەگەورەیان دەزانی، کە موعیزیان زیاتر لە جەنگێك بە دۆڕاندندا، هەروا هۆیەکی تریش ئەوە بوو، کە موعیز ئەو عەبیدانەی لە خۆی نزیك کردەوە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی خەڵکی صەنهاجەو زەناتە ڕقیان لێببێتەوەو

خۆشیان نەویّ، کاتێك موعیز لەمەهدیە جێگیربوو کاروباری دەوڵەت و حوکمڕانی دایە دەست تەمیمی کوڕی، کە باوکی لێی ڕادەدیت و بەشایەنی دەزانی بۆ ئەم کارە.

ئەو موجاهیدە گەورەیە لەمیوانداری کوڕەکەی بوو، هەتاوەکو خوای گەورە لە ساڵی(٤٥٣) کۆچی گیانی سپارد.

بەڕاستی مێژووی ئیسلامی بەڕبەڕی گەواهی دەدات، کە لە پاش فەزڵ و چاکەی خوا هەر ئەوان بوون توانیان بیروباوەڕی ئیسماعیلیە باطینیەکان لەناو ببەن، هەروەها مێژوو گەواهی بۆ موعیز بن بادیس ئەو بەرابیرانەی شوێنی کەوتبون دەدات، کە نەهجی ئەهلی سوننەت وجەماعەتیان گرتبوە بەرو پەیڕەویان دەکردو، باکورە ئەفریقیەکەی خۆیان بە خیلافەتی شەرعی لە بەغدا بەستبۆوە، هەروەها مێژوو گەواهی بۆ موعیز دەدات، کە بەیداخێکە لە بەیداخەکانی ئیسلام و هێمایەکە لە هێماکانی و لەفراوانترین دەرگاکانی هاتتە ناو مێژوویان ، کە زۆر کارو کردەوەی گرنگ و گەورەی تێدا تۆمارکرد، داوا لە خوای گەورە دەکەین، کە بیخاتە تەرازووی چاکەکانی لە ڕۆژێك ،کە ماڵ و مناڵ سودی نیە تەنها ئەوەی بە دڵێکی پاك و دوور لە گوناهو تاوان هاتبێتە لای پەروەرگار.

إبن الأثیر لە ڕوداوەکانی ساڵی (٤٥٣)ی کۆچی باسی لەمردنی موعیز بن بادیسو ویلایەتی کوڕەکەی کردوە، کە دەڵێت: ئەو ساڵە موعیز بن بادس خاوەنی حوکمی ئەفریقیە بە نەخۆشی کزی جگەر وەفاتی کرد، ماوەی حوکمی (٤٧) ساڵ بوو، کاتێك هاتە سەر حوکم تەمەنی (١١) ساڵان بوو، هەندێکیش دەڵێن: (٨) ساڵو شەش مانگ بوو.

موعیز زۆر دڵ نەرم و ملکەچ بووەو، خۆی زۆر لە خوێن ڕشتن دەپاراست تەنیا مەگەر مەسەلەکە سنورێکی خوای گەورە بوایە ئەوا جێ بەجێی دەکردو، زۆر بەباشیش مامەڵەی لەگەڵ دۆست وهاوەڵانی دەکردو زۆریش ڕێزو حورمەتی ئەهلی عیلمی دەگرت وپارەوپولی زۆری پێدەبەخشین، جارێك هەزار دیناری بەخشیە مستنصر الزناتي کە لەلای دانیشتبوو ئەویش پێی زۆر بوو، موعیز فەرمانی کرد کیسەکە لە پێشی هەڵبڕێژن ئەوانیش وەیان کرد، پاشان وتی ئەمە بۆ خۆت ، پێیان وت: بۆچی فەرمانت کرد پارەکە لە کیسەکە هەڵبڕێژن، وتی: نەوەك بوترێ: ئەگەر نەیدیتبایە پێی ڕازی نەدەبوو.

کاتێك موعیز وەفاتی کرد شاعیرەکان سەرەخۆشیان لێکردو شیعریان بەسەرداهۆنیەوە، لەوانە ابوالحسن بن رشیق کە وتویەتی:

| | |
|---|---|
| لكل حي وإن طال المدى هلك | لاعز مملكه يبقى، ولا ملك |
| ولي الموعيز على أعقابه فرمى | أوكاد ينهد من أركانه الفلك |
| مضنى فقيدا وأبقى في خزانته | هام الملوك، وما أدراك ما ملكوا |
| ماكان إلا حساما سله قدرمه | على الذين بغوا في الأرض وانهمكوا |
| كأنه لم يخض للموت بحر وغى | خضر البحار، إذاقيست به، برك |
| ولم يجد بقناطير مقنطرة | وقدأرخت بأسمه إبريزها السكك |
| روح الموعيز وروح الشمس قد قبضا | فانظر بأي ضياء يسعد يصعد الفلك[1] |

## تەوەرەی پێنجەم کوڕو نەوەکانی موعیز

### یەکەم تەمیمی کوڕی موعیز:

تمیم لە مەنصوریە لە ساڵی(٤٢٢) کۆچی لە سێ ی ڕەجەب لە دایك بووە، باوکی لە ساڵی(٤٤٥) کۆچی کردیە والی لەسەر مەهدیە پاشان هەر لە باوکیەوە ویلایەتی ئەفریقیایی پێ سپێردرا، تەمیم لەگەڵ خەڵکی دا بە مامەڵەیەکی باش هەڵسوکەوتی دەکردو، ئەهلی عیلمیشی زۆر لە خۆی نزیك دەکردەوەو ئازاو چاونەترسیش بوو خاوەن هیمەتێکی بەرز بوو بەزیرەکی و بلیمەتی و سیاسەتە حەکیمانەکەی توانی شوێنی باوکی بگرێتەوە، هەروەها بە هۆی پێدانی ماڵ و سامان توانی دڵی سەرکردەکانی عەرەب بۆ خۆی ڕابکێشێ‌و خزماتیان لەگەڵ بکات و تێکەڵیان بێت، زۆر بوێرانەو زیرەکانەش هەندێکی کردنە سەربازی دەوڵەتەکەی‌و توانیشی لە ساڵی ٤٥٥ دەست بگرێت بەسەر شاری سوسە پاش ئەوەی، کە زاڵ بوو بەسەر ئەو بەرگریە چەکداریەی ڕووبەڕووی بوویەوە[2].

لە ساڵی ٤٥٧ کۆچی ناصر بن علناس الحمادی سەرکردەی دەوڵەتی حمادیە ویستی مەهدیە داگیر بکات و تەمیمی پاشا بکوژێت، جا سوپایەکەی لە صەنهاجەو زەناتە و بنی

---

١ـ تأريخ الفتح العربي لا ٢١٤.

٢ـ الكامل إبن الأثير ب٦ لا ٢٣٤.

هیلال ئامادەکرد، تەمیم توانی هۆزە عەرەبەکان  بۆ خۆی ڕابکێشێ و ماڵ وچەك و تفاقی پێدانو، توانیشی بەسەر سوپای ناصردا زاڵ بێتو(٢٤) هەزار کەسیشی لێکوشتن و غەنیمەت و پارەو پولیشی بۆ عەرەبەکان بەجێهێشت، کە بەوە زۆر دەوڵەمەند بوون، تەمیم وتی: نەنگە بۆ من غەنیمەتی کورە مامەکانم ببەم و عەرەبەکان بەوە ڕازی بکەم.[1]

لە ساڵی (٤٨٤) کۆچی تەمیم شاری قابسی گەڕاندەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی، پاش ئەوەی، کە عمرو بن الموعیز کاروباری گرتبووە دەست، لە پێش عەمریش قاضي إبراهیم بن بلمونة کاروباری هەڵدەسوڕاند، بەسوپایەکی بە هێزو گەورە ئەوشارەی گەڕاندەوە، هاوەڵەکانی پێیان وت: کاتێك قاضي لەوێ بوو گرنگیت پێنەداو نەت گەڕاندەوە، بەڵام کاتێك براکەت کاروباری شارەکەی هەڵسوراند سوپات ئامادەکرد. وتی: کاتێك کوڕێك لە عەبیدەکانی ئێمەی لێبوو لابردنی سوك و سانا بوو، بەڵام کەمن لەمەهدیە کوڕی موعیزم کوڕێکی تریشی لە قابس بێت ئەوا ناکرێ لەسەر ئەوە بێدەنگبین.

لەفەتح کردنی ئەو شارە إبن خطیب سوسة هۆنراوە بەناوبانگەی وت: کە لەسەرەتاکەی دا وتویەتی:

| | |
|---|---|
| ضحك الزمان،وكان عابسا | لما فتحت بعد سيفك قابسا |
| الله يعلم ما حويت ثمارها | إلا وكان ابوك قبل الغارسا |
| من كان في رزق الاسنة خاطبا | كانت له قلل البلاد عرائسا |
| فابشر تميم بن الموعيز بفتكة | تركت من أكناف قابس قابسا |
| ولوا فكم تركوا هناك مصانعا | ومقاصرا و مخالدا،ومجالسا |
| فكانها قلب، و هن وساوس | جاء اليقين، فزاد عنه وساوسا[2] |

لەساڵی (٤٩٣) کۆچی تەمیم توانی بە زەبری هێز شاری صەفاقس لە حاکمە زۆردارەکەی حمو بن فلفل البرغواطي بسەنتەوە .

وا دادەنرێ کە سەردەمی تەمیم لە چاو باوکی باشترو پێشکەوتوو تر بووە چونکە هۆزە عەرەبیەکان هاتنە ناو دەوڵەتەکەی .

---

١ـ سەرچاوەی پێشو.

٢ـ الكامل في التأريخ ب ٦ لا٣٦٧

تــــەميم پێشـــەنگ بـــوو لەدەســـت بـــڵاوی و ئازايـــەتی و ڕێـــزو بەخشـــين و نمونـــەی پێدەهێنراوە.إبن كثير لە بارەيەوە وتويەتی :يەكێك بووە لە باشترين ئەو پادشايانەی ،كـە خۆی بە چـەند سـيفەتێكی بـەرز ڕازانـدبۆوە وەك نـەرم نيـانیو ڕێـزو حورمـەتو چاكسـازی (٤٦)ساڵ حوكمی كردو،تەمەنيشی (٩٩)ساڵ بووەو، نزيكەی (١٠٠) كوڕيشی لە دوای خـۆی بە جێهێشتوەو لە كچانيش (٦٠) كچ، لە پاشە خۆشـی يـەحيا هاتۆتـە جێگـەی. لەباشـترين ئەو هۆنراوانەی بەسەر تميم وتراوە هونراوەی شاعيرە، كەوتويەتی:

أصح وأعلى ما سمعناه في الندى — من الخبر المروي منذ قديم[1]

أحاديث ترويها السيول عن — البحر عن كف الأمير تميم[2]

تەميم زانايەكی گەورە بووەو شاعيرێكی ناسكيش بووە،لە يەكێك لە شيعرەكانی وتويەتی :

فإما الملوك في شرف و عز — على التأريخ في أعلى السرير

و اما الموت ظبا العوالي — فلست بخالدا ابدا الدهور[2]

ابن الأثيريش وتويـەتی: تـەميم پادشـايەكی دلێـرو بـە جـەرگ و ئـازاو زيـرەكو هۆشـيار بووەو، زۆر نەرم ونيان بووەو لێبوردە بووە بەرامبەر تاوانە گەورەكان ،شـيعری زۆر چـاك و بە پێزيشـی هەيـە لـە وانـە، كاتێـك جـەنگێك ڕوويـدا لـە نێـوان دوو هـۆزی عـدیو ريـاح لـە عەرەبـەكان،جا لـە ريـاح پياوێـك كوژرا،پاشـان هـەردوولا سـولحيان كـردو خـوێنی كـابرای بكوژيان حەلال كرد، ئەگەر چی ئـەو سـولحە زەرەری هـەبوو بۆ تـەميمو وڵاتەكـەی بـەڵام، چەند دێرە شيعرێكی وت: كە تێيدا داوای خوێنی خۆی دەكردەوە، كە وتويەتی:

متى كانت دمائكم تطل — أما فيكم بثأر مستقل

أغانم ثم سالم إن فشلتم — فما كانت أوائلكم تذل

ونمتم عن طلاب الثأر حتى — كان العز فيكم مضمحل

وما كسرتم فيه العوالي — ولا بيض تفل، ولا تسئل.

جـا برايـەكانی كوژراوەكـە ئـەميرەكيان لـە عـەدی كوشـت، بەمـەش شـەڕ لـە نێوانيانـدا هەڵگيرساو، خەڵكێكی زۆر كوژراو، سەرئەنجام توانيان بنی عەدی لە ئەفريقيا دەربكەن.[1]

---

١ـ البداية و النهاية ب ١٢ لا ١٨١

٢ـ تأريخ الفتح العربي في ليبيا ص ٣٠٢

له وته بەنرخـەکانی مـوعیز کـە ببـوە نموونـە لـە ئەفریقیـە أسـرار الملـوك لا تـذاع[2] واتـە نهێنیەکانی پادشا پارێزراوەو نابێ بڵاوبکرێتەوە.

پاشان دوای ئەوەی دەوڵەتی زیری هەیبەتو گەورەیی بۆ گەڕاوە تەمیم لـە سـاڵی (٥٠١) کۆچی دوایی کرد.

**دووەم: یحیی بن تمیم بن الموعیز بن بادیس:**

له ساڵی(٤٩٧) کۆچی لـە (٦)ی مـانگی ذي الحجة بـاوکی، کـە هێشـتا لـە ژیانـدا مـابوو ویلایـەتی دا پێی،کـە تەمـەنی(٤٣) سـاڵ و شـەش مـانگ و بیسـت ڕۆژ بـوو ئـەمیرێکی زۆر چاپوك بوو.[3]

کاتێك یەحیا هاتە سەر تەختی حوکم کەشتیەکی زۆری ئامـادەکرد بۆ دوورگـەی جربـة ، هۆیەکەشی ئەوە بوو کە خەڵکەکەی ڕێگریان لـە بازرگانـەکان دەگرت و دەسـت بەسـەریان دەکردن، ئەویش ئابلۆقەی دانو جێگەیانی بەرتەسك کردەوە، ئـەوانیش تەسـلیمی بـوونو، بڕیاریاندا واز لە خراپەکاری بهێنن و ڕێگایی چاك سازیشیان گرتەبەر[4].

یـەحیا زۆر گرنگـی بـەدەنگ و بـاس و هـەواڵ و مێـژوو پزیشـکی دەداو، زۆریـش عـەودالی زانستی کیمیا بوو شارەزا بوو لێی، ڕۆژێك سێ لە باطینیەکان، کە وایـان دەزانـی شـارەزانە لە زانستی کیمیا هاتنە لای ویستیان بیکوژن، بەڵام خوای گەورە پاراسـتی و نـەیان تـوانی بیکوژن.

ذهبي وتویەتی: سێ غەریبە هاتنە لای یەحیا کەوایان پیشاندا شارەزانەلە زانستی کیمیـا ، ئەویش شوێنی بۆ ئامادەکردن بۆ ئەوەی سەیریان بکاو، لە گەڵیشـی گـەورەی سـوپاکەی إبراهیمو شریف ابو الحسن دانیشـتبوون، یـەکێك لـەو سێ کەسـە چـەقۆیەکی دەرهێنـاو لـە پاشـای دا، بـەڵام هیچـی پێنـەکرا و پادشـا لێـی داوەو دەسـت بـەجێ لـەوێ هەسـتا چـوە شوێنێکی ترو دەرگای لە سەرخۆ داخست، ئەمجارە یەکێکی تریان لە شەریفی داو کوشتی،

---

١ـ الکامل ب٦ لا ٤٨٥

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ تأریخ الفتح العربي في لیبیا ص ٣٠٢

٤ـ التذکار لا٣٩٧

بەلآم إبراهیم شمشێرەکەی دەرهێناو لەڕویان ڕاوەستا، ئەنجا مەمالیکەکان هاتن ئەوسێ کەسە باطینیەیان کوشت، واش گومان دەبەم، کە الآمرا العبیدي ئەوانەی ناردبێ[1].

یەحیا زۆر حەزی لە خوێندنەوە بووەو جیهادیشی زۆر لەلا خۆشەویست بووە ،کە چەند قەلآیەکی فەتح کرد کە باوکی نەیتوانی فەتحی بکا، زۆر میهرەبان و بەزەییش بووە بۆ بێ نەوایان و هەژارانو لەرۆژە سەخت و دژوارەکان خواردنی دەدا پێیان و،ئەهلی عیلم و عەقلی زۆر لە خۆی نزیك دەکردەوەو، بە سیاسەتێکی حەکیمانەش لەگەلّ عەرەبەکان دەجولآیەوە ،ئەوانیش زۆر لێی دەترسان و وای کرد کە چلێسیان کۆتایی پێ بهێنێ... شارەزاییەکی باشیشی هەبوو لە زانستی ئەستێرەکان و، دەم وچاوێکی گەشی شینی هەبوەو خالّێکشی لەرووی هەبوەو لە درێژیان کەمێك بە لادا هاتبوو،لاقەکانیشی باریك بوون[2].

زۆر شاعیری هەبوونە، کە لای دانیشتوونەو بە شیعرەکانیان مەدحیان کردوەو لە کتێبەکانیشان تۆماریان کردوە، لە کۆی ئەو شاعیرانە ابو الصلت بن عبدالعزیزو أمیة بن أبي الصلت ئەو شاعیرەی ،کە بەردەوام لە لای بووە و بە هۆنراوەکانی زۆر بەباشی مەدحیان کردووە ،جا لە کۆی ئەو مەدیحانەی وتویەتی ئەوهۆنراوەیەیە:کە دەلّێت:

فارغب بنفسك إلا عن ندى و وغى ... فالمجد أجمع بين البأس و الجود

كدأب يەحيا الذي أحييت مواهبه ... ميت الرجاء بأنجاز المواعيد

معطي الصوارم والهيف والنواعم ... جرد الصلادم والبزل الجلاعيد

أشم أشوش مضروب بسرادقه ... على أشم بفرع النجم معقود

إذا بدا بسرير الملك محتبيا ... رأيت يوسف في محراب داود

پاشان هەر لە درێژەی هۆنراوەکەدا وتویەتی :

هذي موارد يەحيا غير ناضبة ... و ذا الطريق إليها غير مسدود

حكم سيوفك فيما أنت طالبه ... فالسيوف قضاء غير مردود[3]

---

١ـ سير اعلام النبلاء ب١٩ لا ٤١٤

٢ـ وفيات الأعيان ب٦ لا٢١٤.

٣ـ وفيات الأعيان ب٦ لا ٢١٥

ئەمیر یەحیا لە ساڵی(٥٠٩) کۆچی بەهۆی نەخۆشیەك وەفاتی کرد ، کە باطینیەکان هێرشیان کردە سەری بۆ ئەوەی بیکوژن، جا بە هۆی ئەو نەخۆشیە وەفاتی کرد[1].إبن الأثير وتویەتی: لە ڕۆژی جەژنی قوربان لە ناکاوی وەفاتی کرد، تەمەنیشی پەنجاو دوو ساڵو پانزە ڕۆژ بوو، ماوەی حوکم کردنیشی هەشت ساڵ و پێنج مانگ و بیست پێنج ڕۆژ بوو، لە دوای خۆشیی(٣٠) کوڕی بەجێهێشت، عبدالرحمن بن محمد بن حميس الصقلی بە شیعرێك سەرەخۆشی لێکردووەو پیرۆزبایشی لە کوڕەکەی کردوە بەبۆنەی بوونی بە پادشا، کە وتویەتی:

ما أغمد الغضب إلا جدد الذكر ... ولا إختفى القمر حتى بدا قمر
بموت يەحيا أميت الناس كلهم ... حتى إذا ما عليه جاءهم نشروا
إن يبعثوا بسرور من تملكه ... و عينها من أبيه دمعها همر
شقت جيوب المعالي بالأسى ... في كل أفق عليه الأنجم الزهر
و قل لابن تميم حزن مادهما ... فكل حزن عظيم فيه محتقر
قام الدليل و يەحيا لاحياة له ... إن المنية لا تبقي و لا تذر[2]

**سێهەم :ئەمیر عەلی کوڕی یەحیای کوڕی تەمیمی کوڕی موعیز:**

لە ڕۆژی (١٥)مانگی (صفر)لەساڵی (٤٩٩) کۆچی لەدایك بووە ، باوکی کردیە والی لەسەر صەفاقسو پاش مردنی باوکی کاروباری حوکمی گرتە دەست. پاش دوو ساڵ لەحوکم ڕانی عەلی کەشتی گەلێکی لە دەریا ئامادەکردو ڕەوانەی شاری قابسی کردو ئابلۆقەی لەسەر دانان،إبن الاثير باسی هۆکاری ئەمەی کردوەو وتویەتی: هۆی ئەم هێرشە ئەمە بوو،کە حاکمی ئەو شارە رافع بن مكن الدهمانی کەشتیەکی ئامادەکرد بۆ ئەوەی بازرگانەکان هەڵبگرێ ئەم ڕۆژەی ئەو ڕووداوەشی لێ ڕوودا دواین ڕۆژی مەلیك یەحیا بوو،ئەم کارەشی قەدەغە نەکرد،ئەمەش وەك نەریتی خۆی لە مامەڵە کردندا،جا،کە عەلی لە پاش باوکی کاروباری حوکمی کەوتە دەست، ،سەر لە نوێ ئەم کارەی قەدەغە کردو وتی:نابێ کەس لە خەڵکی ئەفریقیە وەکو من کەشتی هەبێت و بازرگانەکان سوار بکا،رافیع کە ترسا لەوەی

---

١ـ إبن عذاري ب١لا ٣٠٦.

٢ ـ الكامل ب ٦ لا٥٢٤

عەلی ڕێی لێ بگرت هانای وەبەر ڕەجاری نەفرەتی برد بۆ ئەوەی سەری بخاو یارمەتی بدا لە ڕۆیشتنی کەشتیەکەی لە ناو دەریادا،جا دەم و دەست کەشتی گەلێکی ئامادە کرد بۆ قابسو بە لای مەهدیەش دا ڕۆیی، لێرە عەلی بەرێکەوتنەکەی نێوانیانی زانی.

کاتێك کەشتی گەلی ڕەجار لە مەهدیە تێپەر بوو،عەلی کەشتی گەلی خۆی بە گەر خست و شوێن پێی ئەوان ڕۆیی و،هەتا گەیشتە قابس،کاتێك خاوەنی کەشتی گەلی فەرەنجیەکان موسوڵمانانیان بینی کەشتیەکانی خۆیان بە گەڕ نەخست و کەشتیەکانیان گەرانەوەو، کەشتی گەلی عەلیش ماویەوەو، ڕافیعیشی لەقابس ئابلۆقەداو، دوایی گەڕانەوە مەهدیە[1] پاش ئەو ڕافیعە ویستی ئابلۆقەی مەهدیە بدات بۆیە هەڵسا بە کۆکردنەوەی عەرەبە پەرتەوازەکان و سوپایەکی ئامادەکردو واشی نیشاندا، کە ئەو دەیەوێ بچێتە ژێر فەرمانی ئەمیر عەلی بەڵام ئەمیر بەو فێڵەی زانی گوێی پێنەداو شەڕی لەگەڵ کردو پۆتی شکاند هەتا هەندێك لە عەرەبەکان و هەندێکی تر هاتنە ناو کێشەکەو سولحیان لە نێواندا کردن.[2]

ئەمیر عەلی هەستی بە ترسناکی ڕەجار کرد ، کە گەورەی صقلیە بوو فەرمانی دەکرد بۆ نوێ کردنەوەی کەشتیەکانی و ئامادەی کردنی کەل و پەل و کەرستەی شەڕ بۆ لە ناوبردنی هێزە دەریاییەکەی ڕەجارو نامەشی بۆ ئەو مورابیطانەش نووسی، کە لە مەراکش بوون بۆ ئەوەی لەگەڵی کۆببنەوەو بچنە نێو صقلیە، ڕەجار کە بەمەی زانی وازی لەشەڕو شۆڕەکەی خۆی هێنا، ئەمیر عەلی بن یەحیا خاوەنی ئەفریقیە لە دە ڕۆژی ئەخیر لەمانگی ربیع الآخر دا وەفاتی کرد، کە جەنگەکانو کردەوەکانی تری بەڵگەبوو لەسەر هیممەتی بەرزی، کە وەفاتیشی کرد حەسەنی کوڕی لە جێگەی خۆی دانا، بەڵام ئەوەی کاروباری دەوڵەتەکەی هەڵدەسوڕاند صەندەل الخصی بوو، چونکە ئەوکات حەسەن تەمەنی دوانزە ساڵان بوو بەتەنیا نەیدەتوانی کاروباری وڵات بەڕێوە ببات، صەندەل بە باشترین شێوە بەو کارە هەڵسا بەڵام تەمەنی لەم کارە زۆر درێژ نەبوو ، کە وەفاتی کرد جیاوازی کەوتە نێوان هاوەڵان و گەورە پیاوانیو هەموویان دەیانوت: من لە هەموویان لە پێشترم و حەلل و عەقد بەدەستی منە، ئەوان هەر ئەوها مانەوە تا کاروبارەکە کەوتە دەست سەرکردیەك لە

---

١ــ الکامل ب٦ لا٥٤.

٢ــ الکامل ب٦ لا٥٢٤.

برادەرانی باوکی، کە ناوی ابو عزیز موفق بوو، بەم جۆرە جیاوازی نەماو بارودۆخە ئاسایی بوویەوە.[1]

## چوارەم: ئەمیر حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی یەحیای کوڕی تەمیم:

لە سوسە لە ساڵی(٥٠٢) کۆچی لە دایك بووە، باش باوکی کاروباری وڵاتی گرتە دەست و لە سەردەمی ئەو چەند ڕوداوێك ڕوویدا، کە باسکردنی درێژە دەکێشێ، دەوڵەتی حەسەن بێهێز بوو وای لێهات بووە ئامانجی فەلە داخ لەدڵەکانو، زانیان، کە بارودۆخەکە لە بارە بۆ داگیرکردنی باشوری دەریای ناوەڕاست و سەرشۆڕکردنی موسڵمانان، ڕەجاریش توانی طرابلس و مەهدیە داگیر بکات.

کاتێك حەسەن بن علی لە مەهدیە دەرچوو دەیوت: سەلامەتی موسولمانانم پێ باشترە لە کۆشك و تەلارو موڵك.

حەسەن ویستی بۆ لای عوبەیدیەکانی میسر بچێت ، بەڵام دوایی وازی لەم بیرۆکەیە هێناو چوو بۆ لای کوڕە مامەکەی، کە سەرۆکی دەوڵەتی حەمادیە بوو لە مەغریبی ناوەند جا کوڕە مامەکەی بەندی کردو ئیقامەی جەبری لەسەر دانا لە ترسی ئەوەی نەوەك پەیوەندی بە عبدالمؤمن بن علی خەلیفەی موەحیدینەوە بکات، بەڵام حەسەنی کوڕی عەلی هەر توانی پەیوەندی بە خەلیفەی موەحیدین بکات و بچێتە ژێر دەسەڵاتی و دواتر پێکەوە کاریان کرد بۆ ڕزگارکردنی زەوی موسڵمانانو ئەو کەنارانەی لە بن دەستی نەصرانیەکان بوو ڕزگاریان کردو زۆریش بە خیلافەتی موەحیدینەکان ڕازی بوو.لەڕاستیدا جیاوازیەکی زۆر هەیە لە بارەی ئەم ساڵەی حەسەنی تێدا مردوە، بەڵام شتێکی جەخت کراوە، کە لە پاش ساڵی(٥٥٥) کۆچی وەفاتی کردوە، کاتێك دەچوو بۆ پایتەختی موەحیدین لە ڕێگا وەفاتی کرد.

بە کەوتنە دەستی مەهدیە لەلایەن نەصرانیەکان بە سەرکردایەتی رجار الصقلي لە ساڵی (٥٤٣) کۆچی دەوڵەتی بنی زیری کۆتایی پێهات، پاش ئەوەی موڵکەکەی لەسەر زەوی ئەفریقیەو مەغریبی ناوەند نزیکەی (١٨٠) ساڵی خایاند لە دامەزرێنەری یەکەمەوە

---

[1] ــ موسعة المغرب العربي ب٤ لا ٨٢ــ ٨٣.

بەلكین كە دەكا سالّی (٣٦٢) كۆچی هەتا وەكو حەسەنی كوڕی عەلی كە دەكاسالّی (٥٤٣)ی كۆچی. پێش ئەوەی بچینە ناو هۆكارەكانی ڕووخانی دەولّەتی زیری بەتایبەتی دەولّتی عوبەیدی ئەوا ڕوونی ئەو شتە دەكینەوە ، كە لە تەرابلس ڕوویدا لەو هێرشە دڕندانەیەی،كە لەلایەن نەصاری كرایە سەریانو هەروا باس كردنی ئەو ڕووداوانەی لەو ماوەیەدا ڕوویان داوە.

**أـ والیی تەرابلس لەسەردەمی ئەمیر حەسەنی كوڕی عەلی صەنهاجی:**

ناوی محمدی كوڕی خزرونی كوڕی خلیفەی كوڕی ورو.. پاش شاە عبد الملك والیی تەرابلس بووە.شێخەكانی بنی مطروح زۆر لێی نزیك بوونەوە چونكە ئەوان لەتەرابلس خاوەن دەسەلات بوون ،ئەویش كاروباری سەربازی دایە دەستیانو هەر بەگوێی ئەوانیشی دەكردو چیدیكە گوێڕایەڵی حەسەنی كوڕی عەلی نەكردوو،پارەو پولی بۆ نەناردوو ڕاشیان گەیاند كە ئێمە گوێڕایەڵی عوبەیدیەكانین لە میسر.

ب ـ ڕەجار هێرش دەكاتە تەرابلس:

لەسالّی (٥٣٧)كۆچی ڕەجار هێرشی كردە سەر تەرابلوس و بەكەشتیەكانی ئابلۆقەی داو دیوارەكانی شارەكەشیان كون كرد، خەلّكەكەی تامردن بەرگریان لەشارەكەیان كردو داوایی یارمەتیشیان كرد لە عەرەبەكانی دەوروبەریان ئەوانیش بەدەم داواكاریەكەیان هاتن و یارمەتیان دان، ڕەجار نەیتوانی بچێتە ناو شارەكە بۆیە بەدۆڕاوی و سەرشۆڕی بەرەو صقلیة گەڕایەوەو تەرابلسیەكانیش توانیان هەندێك چەك و كەرەستەی سەربازی بە غەنیمەت بگرن و إبن خزرونیش بەتەنێ لە تەرابلس ماوە، كە پلانی دادەڕشت و كاروباری شارەكەی بەڕێوە دەبردو گوێڕایەڵی عوبەیدیەكانیش بوو لەمیسر.[١]

ج ـ گرانیەكەی تەرابلس:

لەسالّی (٥٠٤) كۆچی تەرابلس تووشی برسیەتیەكو گرانیكی كوشندەبوو، هەندێك خەلّكی ناوچەكە ناچاربوون ولاتەكەیان بەجێبهێلّن و چۆلّی بكەنو محمد بن خزرونیش

١ـ تأريخ الفتح العربي في ليبيا لا ٣٠٥

لەسەر دانیشتوانی ولآت زۆر توند بوو، ژیانی خەڵکی ناخۆش و تەنگ کردبۆوەو رۆژ بەرۆژیش توندو تیژیەکەی لەزیادبووندا بوو.

بنو مطروحیش لەپیاو ماقولآن و کاربەدەستانی تەرابلس بوون و زۆریش یارمەتی محمد بن خزونیان دەدا، بەلآم لە بەر توندوتیژی رقیان لێ هەستاو هەوڵیاندا لای بدەن‌و، خەڵکیان کۆکردەوەو، هەموو پێکەوە محمد بن خزون‌و دارودەستەکەیان شاربەدەرکرد، رەجاریش کە حاکمی صقلیە بوو لە نزیکەوە دەیڕوانیە ئەو کێشەو دووبەرەکیە.

جا رەجار بارودۆخەکەی وەك هەلێك قۆستەوەو، زۆر سودیشی بینی لەو گرانیەو لەو شۆڕشەی خەڵکی کردیان لەسەر إبن خزرون ،رەجار ویستی تۆڵە لە دۆڕانەکەی یەکەمی بسەنتەوە بۆیە لەساڵی(٥٤١) کۆچی سەربازو کەشتیەکانی ئامادەکردو هێرشی کردە سەر تەرابلس و بەبێ بەرگری داگیری کردو چووە ناویەوە.

بەکۆتایی هاتنی إبن خزرون حوکمی بنی خزرون لە تەرابلس کۆتایی پێهات.

سەرکردەی کەشتی گەلی رجار ناوی جرجی بن میخایل الأنطاکي بوو، کە لەشام بە بەردەوامی لەگەڵ تەمیمی کوری موعیز دابوو ئەوا بوو بەحاکم لەسەر تەرابلس و داوای سەلامەتی و ئەمانی لەخەڵکەکەی کرد ، ئەوانیش دایانێ‌و،ئەویش پەیمانی دانێ، کە بە پێچەوانەی ئاینەکەیان شتیان لەسەر فەرز نەکات.

جا ئەوە یەکەم جار بوو فەلە داخ لەدڵەکان دەست بگرن بەسەر تەرابلس، بەلآم لە هەوڵدانی یەکەم لە ساڵی (٥٣٧) کۆچی نەیان توانی تەرابلس داگیر بکەن.[1]

رەجار ویستی هەر بەهۆی یارمەتی خەڵکی تەرابلس زاڵ بێت بەسەر تەرابلسدا بۆیە کردیە ویلایەتەك‌و یوسفی کوری زیری کە نازناوەکەی ابو الحجاج بوو، کردیە قازی بە سەریدا، جا رافع بن مطروح دوانزە ساڵ حوکمی کرد لە گوێ ڕایەڵیشدا هەر سەر بە رەجار بوو.

---

١ـ تأريخ الفتح العربي في ليبيا لا ٣٠٧

پێم وایە لەبەر ناچاری رازی بوو کار بکات لە ژێر چەتری نەصرانیەکان بە شێوەیەك، کە لە دەرێی تواناو ویستی دابووە، بەلام بە هەموو هێزو توانای هەولی دەدا لەسەر خەلکی زەرەرو زیان کەم بکاتەوە.

رەجار کە حوکمی نێوان مەهدیە و تەرابلسی دەکرد، بێجگە لە قابس ئەوا لە سالی (٥٤٨)ی کۆچی مردو لە دوای خۆی کورەکەی غالیالم جێگەی گرتەوەو ناویشی لە خۆنا رەجاری دووەم . غالیالم لە باکوری ئەفریقی زۆر بەهێزو دەسەلات بوو توانی شاری قابسیش بهێنتە ژێر حوکمی خۆی، ئەو پیاوە زۆر بەتوندی مامەلەی لەگەل موسلمانانداا دەکرد، جا لەحوکمەکەی بێزار بوون و لەگەل بەدیارکەوتنی دەعوەی موەحیدینیش لە ئەفریقیەو نزیك بوونەوەیان لە مەهدیە چالاك بوونەوەو گەشانەوە.

شۆرشی چەکداری دژی غالیالم لە صەفاقس دەستی پێکردو هەتا گەیشتە ولاتە کەناریەکانو دەوروبەری تەرابلس، غالیالم ترسا لەوەی تەرابلسیەکان پەیوەندی بە موەحدینەکان و شۆرشەکەوە بکەن بۆیە فیتنەو ئاشوبێکی لە نێوان خەلکیدا هەلگیرساند بۆ ئەوەی شۆرشیان لە بیر بباتەوەو هەر بیری لێ نەکەنەوە... داوای لە خەلکی تەرابلس کرد، کە جنێو بە موەحیدینەکان بدەن، بەلام خەلکی تەرابلس بەوە رازی نەبوون و پەنایان بردە بەر ابو الحجاج و داوایان لێکرد بەوەی غالیالم تێبگەینێ، کە ئەو داوا کاریەکەی لە ئێمەی دەکا پێچەوانەی ئایینە، جا قازی توانی ئیقناعی بکا بەوەی لەو کارە عەفویان بکا.

بەراستی هەلسو کەوتی غالیالم لەگەل تەرابلسیەکان وای لێکردن شۆرش بکەن لە دژی، ئەمەش بەهۆی ئەم زولم و ستەمو کارانەی ئەنجامی دەدا، جا شۆرشەکە بەسەرکردایەتی رافع بن مطروح دەستی پێکردو توانیان تەرابلس لە ژێر دەستی نەصرانیەکان لە سالی (٥٥٣)ی کۆچی رزگار بکەن ، رافع بن مطروحیش لە بەر پلەو پایەو رێزی لەلای تەرابلسیەکان بوو بە حاکمیان، لەگەل بەرفراوان بوونی موەحیدەکان لەباکوری ئەفریقیە

تـەرابلس چـووە ژێـر حـوكمی گـەورەی موەحیـدەكان عبـدالمؤمن بـن علـي ئەمـەش لـە ساڵی(٥٥٥) كۆچی بوو.[1]

## تەوەرەی شەشەم : هۆكارەكانی ڕووخانی دوڵەتی زیری لەباكوری ئەفریقیا.

١ـ دەوڵـەتی زیـری نـەیتوانی یـەكێتی بـاكوری ئـەفریقیا بپـارێزێ و یـەكی بخـات لەبـەر بـە دیاركەوتنی هەندێك هۆزی دژ بە صەنهاجیەكان وەكو هۆزی زەناتە، كە هاوپەیمانی بەست و ڕێككەوت لە گەڵ ئەمەویەكانی ئەندەلوس.

٢ـ ئەو دابەش بوونە ناخۆییەی، كە لە خێزانی زیریەكان ڕوویدا بـوو بـە هـۆی سـەرهەڵدانی دەوڵەتی حەمادیە لە مەغریبی ناوەند.

٣ـ بەردەوام بوونی شەڕو شۆڕ بۆگەیشتنە دەسەڵات لە نێوان صـەنهاجیەكانو زەناتیـەكان و كەتامیەكان وای كرد دەوڵەتەكە لاوازبێت لە بەردەم هەڕەشە دەرەكیەكان.

٤ـ فـێڵ كردنـی بـاطنیـەكان لەدەولـەتی زیـری خـۆی نوانـد لـە هەولـدان بـۆ كوشـتنی سوڵتانەكانیان و ڕەوانەكردنی هۆزی بنی هلال و بنی سلیم بۆ تۆڵە سەندنەوە لـە سـوڵتانی دەوڵەتی زیری موعیز بن بادیس.

٥ـ جودا بوونـەوەی هەنـدێك شـار لـە پایتـەختی دەوڵـەتی زیـری ئەمـەش بـە هـۆی هـاتنی لێشاوی عەرەبی ،كە لەلایـەن بـاطنیـە داخ لـە دڵەكانـەوە پالپشـتی دەكـران. سـوڵتانەكانی دەوڵەتی زیری هەوڵیاندا بۆ گەڕاندنەوەی ئەو شارە دابڕاوانە، كە لەو پێنـاوەدا قوربانیـەكی زۆریان دا بۆ ئەوەی تونس لە ژێر دەستی بنی خوراسان ڕزگاربكـەنو صەفاقسـیش لـە ژێـر دەستی برغواطي ڕزگار بكانو فاسیش ڕزگار بكەن لە بنی جامع.

٦ـ ئەو داگیر كردنە خاچ پەرستیەی لە پشت دەریایی ناوەڕاسـتەوە هـات و هـەروا كێشـەو شەری زیریەكان لەگەڵ ئەو سەربازە دڕندانـەی لـە ئـەوروپاوە هـاتن، ئـەوا ئـەو داگیركردنـە لەلایەن نەصرانیەكان دەستی پێكرد پاش ئـەوەی هێـزی النورمـان دەسـتی گـرت بـە سـەر

---

١ـ تأريخ الفتح العربي في ليبيا لا ٣٠٧

دوورگەی صەقلیە لە ساڵی (٤٨٤) کۆچی و دوورگەی جربەشیان لە ساڵی (٥٢٩) کۆچی داگیر کردو دواتر بەرەو فاس هەڵکشان و لەساڵی (٥٤٢)کۆچیداگیریان کرد جا ئەو کێشە ناوخۆییانەی لە نێوان زەناتە و عەرەبەکان و بنی حماد ڕوویاندا وای کرد هێزو توانای دەوڵەتی زیري کەم بکاتو، وای کرد سانا بێت بۆ خاچ پەرستەکان بۆ ئەوەی کۆتایی بێنن بەدەوڵەتی الصنهاجیة الزیریة ئەمەش بۆ خاچ پەرستەکان هاتەدی کاتێك مەهدیە لە ساڵی (٥٤٣) کۆچی داگیرکرا.

٧ـ کۆچ کردنی زاناو فەقیهەکان لە قەیرەوانو مەهدیە بۆ ڕۆژئاوای ناوەڕاست و بۆ مەغریبی ناوەند.

٨ ـ بازرگانی و پیشەسازی و کشت وکاڵ تووشی نەگبەتی و نەهامەتی و قات قوریەکی زۆر هات ئەمەش لە ئەنجامی ئەو تێکچوون و کێشە ناوخۆییانەی ڕوویاندا ،کەوای کرد خەڵکی کۆچ بکەن بۆ ئەندەلوسو صەقلیەو ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی.

## کاربەدەستانی بنی زیری لە قەیرەوان و مەهدیە

١ـ بلكین بن زیری بن مناد بن منقوش الصنهاجی.٣٦٢ـ ٣٧٤ـ ٩٧٣ـ ٩٨٤.

٢ـ المنصور بن بلكین بن زیری ٣٧٤ـ ٣٨٦ـ ٩٨٤ـ ٩٩٦

٣ـ بادیس بن المنصور بن بلكین ٣٨٦ـ ٤٠٦ـ ٩٩٦ـ ١٠١٥.

٤ـ الموعیز بن بادس بن منصور ٤٠٦ـ٤٥٣ـ ١٠١٥ـ ١٠٦٢.

٥ـ تمیم بن الموعیز بادیس: ٤٥٣ـ ٥٠١ـ ١٠٦٢ـ ١١٠٧.

٦ـ یەحیا بن تیمیم بن الموعیز بن بادیس: ٥٠١ـ ٥٠٩ـ ١١٠٧ـ ١١١٦.

٧ـ علی بن یەحیا بن تمیم ٥٠٩ـ ٥١٥ـ ١١١٦ـ ١١٢١.

٨ـ الحسن علی بن یەحیا ٥٠٩ـ ٥٤٣ـ ١١٢١ـ ١١٤٨.

## لە هۆکارەکانی ڕووخانی دەوڵەتی عوبەیدیو داکشانی شەپۆلی باطنیەکانو دەست تێوەردانی نصرانیە خاچ پەرستەکان

١ـ مەغارییەکان لەڕووی شەپۆلی عوبەیدیە باطنیەکان بەرگریەکی دلێرانەیان ئەنجام دا ئەمەش بە قیادەکردنی زاناو فەقیهو فەرمودەناسەکان، کە وای لە سەرکردەکانی عوبەیدیەکان کرد بڕیار بدەن موڵك وحوكمی خۆیان بۆ میسر بگوازنەوە.

٢ـ بە دیارکەوتنی قائیدی ئیسلامی موعیز بن بادیس البربری المغربی، کە باڵی سیاسی و سەربازی و عەقەدی خۆی پچڕاند لە گەڵ دەوڵەتی عوبەیدی لە میسر.

٣ـ کێشەی دەوڵەتی عوبەیدی لەگەڵ قەرامیتەکان لە شام ئەمەش تەنها لە پێناوی چلێسی دونیا.

٤ـ پشت بەستنی عوبەیدیەکان بە نەصرانیە ئەوروپیەکان بۆ ڕاوەستان دژی پێشکەوتنی سەلاجیقەکان لە وڵاتی شام، پاشان نەصرانیەکان غەدریان لێکردن پاش ئەوەی هاتن و دەوڵەتی عوبەیدیان لەمیسر ڕیسواو زەلیل کرد.

٥ـ میسریەکان مەزهەبی عوبەیدیە باطنیەکانیان ڕەتکردەوەو زانایان و فەقیهەکانی گەلی میسریش کۆششێکی بێ وچان و بەردەوامیان کرد بۆ ڕووخاندن و پوکانەوەی دەوڵەتی عوبەیدیە باطنیەکان.

٦ـ گەڕانەوەی دەوڵەتی عەباسی بۆ دەست پێوەگرتنی قورئان وسوننەت و بانگەشە کردن بۆیان، سەرەتایی گەڕانەوەش خەلیفە قائم بالله لە ساڵی (٤٠٨) کۆچی دەستی پێکرد،کە تۆبەی بە فەقیهەکانی موعتەزیلە کردوو ئەوانیش تۆبەیان کردو نکۆڵیان لە بیرۆکەی إعتزالو رفض کردو پەشیمان بوونەوە لەو شتانەی پێچەوانەی ئیسلام بوون.[1]

سوڵتان محمود بن سبکتکین بەدەم فەرمانی أمیرالمؤمنینەوە هاتو، لەسەر سوننەتی ئەویش ڕۆیشت لەسزادانی موعتەزیلەو ڕەوافیزە ئیسماعیلیەکانو ، هەڵسا هەموو بیدعەچیەکانیشی لە جێگای خۆیان دوورکردەوەو دەریکردنو کتێبە فەلسەفیەکانیشی

---

١ـ الکامل ب٩ لا٣٠٥.

سوتاند.[1] موجاهیدی سوارچاك محمود الغزنوی شەپۆلی ئیسماعیلیە باطنیەکانی بەرەو داکشان برد بۆ بیلادی هیندو بیلادی ئەفغانستان.

إبن کثیر لە بارەیەوە وتویەتی: پادشای بەرزو موجاهیدی سەنگەر ابو القاسم خاوەنی بیلادی غەزنە و دەوروبەری، زۆر ولاتی فەتح کردوە، لەوانە: ولاتی: هیند، کە نە لە پێشە خۆی، نە لەدوای خۆی بۆ هیچ پادشایەکی تر رێك نەکەوتووەو غەنیمەتێکی زۆریشی جنگ کەوتوە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر دیندار بووەو زۆریش گوناهو تاوانو ئەنجامدەرانی بوغزاندوەو، زۆریش زاناو فەرمودەناسەکانیشی خۆش ویستوەو زۆریش ئەهلی خێرو دینی لە خۆ نزیك کردوەتەوەو خۆشی ویستوونە.[2]

کاتێك عوبەیدیەکان لەمیسر ویستیان بە دیاری و پارەو ماڵ دەمی چەور بکەن بۆ ئەوەی لە ولاتەکەی خۆی پڕوپاگەندەیان بۆ بکات، هەڵسا بە سوتاندنی کتێب و دیارەیەکانیان[3] و نێردراوەکەشیانی، کە ناوی تاهیرتی بوو کوشتی و ئێسترەکەشی بە دیاری پێشکەش بە قازی ابو المنصور محمد الأزدي کردو وتی: ئەو ئێسترە سەرکردەی خوانەناسان سواری پشتی دەبوو ئێستاش با سەرکردەی یەکتاپەرستان و [4]خواناسان سواری پشتی بێت.

ئەو پادشایە سوننیە چاکە توانی لەولاتەکەی هێزی ئیسماعیلیەکان و بیدعەچیەکان بشکێنێ، خوا پاداشتی بە خێری بداتەوە، ئەو پادشایە موجاهیدە لە ساڵی(٤٢١)ی کۆچی وەفاتی کردو، دەوڵەتەکەشی ماوەیەکی درێژ لە غەزنە بەردەوام بوو نەوەکەشی وەکو خۆی بەردەوام بوو لەسەر هەڵس و کەوتو سیاسەتە باشەکەی، غەزنەویەکان بەردەوام بوون لە حوکم کردنی هیند بەمەزهەبی ئەهلی سوننە تا سەدەی سیانزەهەمی کۆچی هەتا ئەو کاتەی ئینگیزەکان هاتن و دوایی، کە ڕۆیشتن دەسەلاتیان دا دەست هەنادیکەکان.[5]

---

١ـ البداية والنهاية ب١٢ لا٢٨ـ ٣٢

٢ـ البداية والنهاية ب١٢ لا٢٨ـ ٣٢

٣ـ البداية والنهاية ب١٢ لا٣٢ـ ٤٢، وأيعيدالتأريخ نفسه؟ لا ٦٦ـ ٦٨، والروضتين لا٣١.

٤ـ أيعيدالتأريخ نفسه؟ لا٦٦

٥ـ هەمان سەرچاوە.

٧ـ له وڵاتی خوراسان سەلاجیقه سوننیەکان به دیارکەوتن و دەسەڵاتیان درێژبوویەوه هەتا گەیشته پایتەختی خیلافەو، توانیان لەساڵی (٤٤٨) کۆچی بوەیهیەکان له ناو ببەن ، بەمە دەوڵەتی بوەیهی شیعی له ناوچوو، هەروەها توانیان فیتنەی بەساسیری شەڕانگێز کۆتایی پێ بهێنن‌و، له ساڵی (٤٤٨) کۆچی توانیان ئەو جنێوه ناشیرنانەی، کە بە هاوەڵەکان درابوو له سەر دەرگایی مزگەوتەکان نوسرابوو بیسڕنەوه، سەرکردەکەشیان فەرمانی کرد أبی عبدالله الجلال بکوژن، کە شێخی ڕەوافیزەکان بوو زیادەڕۆیی دەکرد لە مەسەلەی ڕەفز.

لەسەردەمی ئەلب ئەرسەلان ،کە سەرۆکی سەلاجیقەکان بوو، ئەو ڕێزو بەهاو قەدرەی کە ئوممەت له دەستی دابوو گەڕاوە بۆیان‌و ، توانیان چەند سەرکەوتنێك بەدەست بێنن لە سەر نەصاراو، ئەلب ئەرسەلانیش توانی حەلەب‌و شام لەژێر چەپۆکی عوبەیدیەکان ڕزگار بکاو بیگەڕێنێتەوه بۆ خیلافەی عبباسیەکان و لە ساڵی (٤٦٢) کۆچیش شاری مەککە گەڕاوە[1] بۆ ژێر دەسەڵاتی عەبباسیەکان و توانی خۆی دا بماڵێنێ لە شوێن کەوتنی بۆ عوبەیدیەکان‌و سوڵتان ئەلب ئەرسەلان وەك دیاری سی هەزار دیناری دایە حاکمی مەککە کە ناوی محمد بن أبی الهاشم بوو.[2]

لەسەردەمی وەزارەتی نظام الملك حسن علي دەوڵەتی سەلجوقی گرنگی دابە پێدانی کاروباری قیادی دەوڵەت بۆ ئەو سەرکردەو ئەمیرانەی خاوەن ڕەوشتێکی جوان و دین و ئازایەتی بوون و، هەروا هەڵسان بە بڵاوکردنەوەی زانستی ئەهلی سوننه، ابو شامة ی مێژوو نووس وتویەتی: کاتێك سەلجوقیەکان حوکمیان کەوتە دەست ترس و هەیبەتی خیلافەتی نوێ کردەوە پاش ئەوەی لە دەستی دابوو ئەمەش بەتایبەت لە وەزارەتی نظام الملك، کە هەیبەت و ڕێزو قەدەری خیلافەتی بەباشترین شێوە گەڕاندەوە[3] .

نظام الملك حسن بن علي ئەو وەزیرە باشەبوو ،کە قوتابخانەی گەلێك زۆری دروست کرد بۆ قوتابیان، کە لە ساڵی ٤٥٩ کۆچی تەواو بوو لە دروستکردنی قوتابخانەی نیظامي لە

---

١ـ أیعیدالتأریخ نفسه؟ ل٦٦

٢ـ أیعیدالتأریخ نفسه؟ ل٦٦

٣ـ والروضتین في أخبار الدولیتین ل٣١.

بەغدا، لە وڵاتی نەیسابورو هی تریش گەلێك قوتابخانەی تری دروست کرد، پاشان ئەو ئاراستەیە بەرەو میسریش چوو بۆ دروستکردنی قوتابخانەی سوننی، کە لەژێر حوکمی عوبەیدیە باطنیەکان بوو، وەزیر ظافر،کە ناوی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی سەلار بوو لە ساڵی ٥٤٤ کۆچی قوتابخانەیەکی دروستکردو حافظ السلفیشي کردە بەڕێوبەر لە سەری، کە ئەو قوتابخانەیە لە ئەسنکەندەریە تاکە قوتابخانەی شافعیەکان بوو ، هەروا قوتابخانەی عوفیەش لە ساڵی ٥٣٢ دامەزرا، کە بەڕێوبەرەکەی إبن الطاهر بن عوف المالكي بوو، ئامانجیش لە دروستکردنی ئەو دوو قوتابخانەیە ڕاوەستان بوو لە ڕووی مەزهەبی شیعی و بانگەشەکردن بۆ مەزهەبی سوننی[1].

مێژوونووس ابو شامە لەبارەی نظام الملك وتویەتی: زاناو فەقیهو دیندارێکی بێ نەفس و حاکمێکی دادگەربووەو ئەوەی دیندار بوایە خۆشی دەویست، بەبێ سنور ماڵی دەبەخشی و وەقفی دەکرد بۆ کاری باش، قوتابخانەکانیشی لە جیهان بەناوبانگن، کە شوێن نەما دروستی نەکا لێی هەتا دورگەی إبن عمر ،کە ڕووبەرەکەی پارچە زەویەکە قوتابخانەیەکی باش و چاك و گەورەی لێ دروست کردو، زۆریش ئاگای لە نوێژەکان بوو لە کاتی خۆی ئەنجامی دەدان بە جۆرێك، کە ئەوەی لێبڕاو (متفرغ) بوایە بۆ عیبادەتەکان ئاوای پێنەدەکرا[2].

ئەو زانایە چاك وباشە بە دەستی غەدرو خیانەت کوژرا، کە باطنیەکان لە نزیك نەهاوەند لە (١٠)ی مانگی ڕەمەزان لە ساڵی (٤٨٥) کۆچی ئەم کارە پیس و گڵاوەیان ئەنجام دا[3].

٨ـ زانایانی قوتابخانەی شافیعی زۆر چالاك بوون و لە سەرووی هەموویان إمام الحرمین ابو المعالي الجوینی ، کە زۆر گرنگی بە گیروگرفتەکانی سەردەمەکەی خۆی دەداو، لە سیاسەی شەرعیش کتێبە بەناوبانگەکەی نووسی غیاث الأمم في التیاث الظلم، کە لە گیروگرفتە واقیعیەکانی موسڵمانانی دەکۆڵیەوە، لە قوتابیە پێگەیشتوەکان و زیرەکەکانی پێشەوا جوینی ابو حامد الغزالیو کیاهەراسی بوون، کە غەزالی کتێبی إحیاء العلوم الدینی

---

١ـ أیعیدالتأریخ نفسه؟ لا٦٩

٢ـ الروضتین في أخبار الدولیتین لا٥.

٣ـ البدایة والنهایة ب١٢ لا١٥٠.

دانا، کە لە نیەتی دابوو، ببێتە یەکێك لەهۆکاری چاکسازی بۆ بارودۆخی موسڵمانان، بەڵام ئەو کتێبە ئەو ڕەخنەیەی لێ گیراوە، کە پڕە لە فەرمودەی لاوازو موضوعو، هەروەها پڕیەتی لە چیرۆکە بێ سەروبەرەکانی سۆفیەکانو هەندێك لە قسەی خراپو پوچەڵی فەلاسیفەکان، کتێبەکەی چەند ڕوانینێکی چاکسازی تێدایە، کە دڵ و دەروون پاك دەکاتەوە، غەزالی بەم لێکۆڵینەوانە توانی کاریگەریەکی قوڵ بکات، لە دەروونی مرۆڤەکان و واقیعی موسڵمانانی زۆر بەرەو باشتر برد[1].

پێش پێشەوا جووەینی پێشەوا ماوردی هەوڵیدا ڕێ خۆش بکات بۆ إمام الحرمین و هەڵسا بە نووسینی کتێبەکەی الأحکام السلطانية بۆ چارەسەری گیروگرفتەکانی حوکم، کتێبی أدب الدين والدنياشی نووسی بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتێکی ورد لە ژیانی موسڵمانان ئەویش: چۆن بە هاوسەنگیەکی شەرعی دین و دونیا پێکەوە گرێ دەدەی و کۆی دەکەیەوە؟

بەڕاستی زانایانی قوتابخانەی شافیعی سوننی وەك ابو إسحاق الشيرازي و قوتابیەکانی بەشداریان کرد لە شکان و بەزینی بیرۆکەی ڕەفزو مەزهەبە باطنیەکان[2].

٩ـ بەدیار کەوتنی زانایە سەر ڕاست و دڵسۆزەکان ئەوانەی سەر بە قوتابخانەی حەنبەلی بوون لە بەغدا وەك شێخ ابو الوفاء بن عقيلو شێخ ابو الفرج الجوزي ،کە کاریگەریەکی یەکجار زۆریان هەبوو لە گەڕانەوەی خەڵکی بۆ ئایین لەسەر بنچینەی ئەهلی سوننە، بە تایبەت قوتابخانەی ابو سعيد المخرمي الحنبلي کە ڕۆڵێکی زۆر دیاری هەبوو لە فێرکردنی ئوممەت و پەروەردەکردنی بە تایبەتیش، کە زانای خواناس عبدالقادر الجيلاني بووە بەڕێوبەری، کە گەروە زانایانی وڵاتانی شام دەهاتنە بەغدا بۆ فێربوونی فیقهی حەنبەلیو، پەیوەندی کردن بەو قوتابخانە عەقەدی و فقهيە، لەو زانایانەی لە قوتابخانەیە پەروەردە بوون الحافظ عبدالغني المقدسي بوو، کە لە ساڵی (٥٦٠) کۆچی لە گەڵ الموفق إبن قدامة هاتن بۆ بەغدا، کە لەوێ عبدالقادر الجيلاني زۆر ڕێزی لێ گرتن[3].

---

١ـ أيعيدالتأريخ نفسه؟ لا٦٦

٢ـ هةمان سةرضاوة.

٣ـ وأيعيدالتأريخ نفسه؟ لا٦٧

ابو عمرو براکەی الموفق لەگەڵ عبدالغنی کورە خاڵیان و شێخ عیماد بە هیچ شێوەیەك دا نەدەبڕان لە هیچ غەزایەك، کە ناصر صلاح الدینی لەگەڵ بوایە بۆ وڵاتـی فەرەنجیـەکان، لـە فەتح کردنەی قودسدا[1] لە گەڵی بوون، ئەو زانایانە کاریگەریەکی زۆریان هەبوو لـە دەروونـی خـەڵکی و هانـدانیان بـۆ جیهـادو خۆبـەخت کردنـدا لـە پێنـاوی عەقیـدەو دژایـەتی کردنـی بیروبـاوەڕی عوبەیدیـە ئیسـماعیلیە بـاطنیـەکان و دیـار خسـتنی پیلاکانیـان و شـێوازە فێڵاوەکانیان.

الواعظ الفقیه الحنبلي الدمشقي علي بن إبراهیم بن نجا یەکێك بوو لە قوتابیانی قوتابخانـەی حەنبەلی لە بەغدا، کە خۆی داپاڵ صلاح الدین و پلەو پایەکی زۆری لەلای هەبوو، هەر ئـەو بوو یارمـەتی صـلاح الـدینی دا لـە دیارخسـتنی پیلانێکـی گـڵاوی عوبەیـدی، کـە وەك تۆڵـە سـەندنەوەیەك گێڕایـان بـۆ ئـەوەی ئـەهلی سـوننە لـە میسـر لـە نـاو ببـەن و دەوڵەتەکـەی خۆشیان بگەڕێننەوە[2].

خەڵکی لەوڵاتی شام زۆر دڵ خۆش بوون بە گەڕانەوەی سوننە بۆیان، ابـو مظفـر الجـوزي وتویەتی: شێخ عیماد بەر بـەردەوامی دەهاتـە کـۆڕو کۆبونـەوەم صـلاح الـدینیش دەیـوت: یوسف کەنارەکەی بۆ فەتح کردین و ئیسلامەتیشی ئاشکرا کرد تۆش ئـەی یوسـف لـە شـام سوننەتت ژیاندەوە[3].

العماد المقدسی ـ رحمەالله ـــ لـە نوێـژی بەیانیـەوە تـا پشـتی نوێـژی عیشـا دادەنیشـت قورئانو تەفسیرەکەی بۆ خەڵکی ڕاڤە دەکردو ئیسلامی فێردەکردن، بەڕاستی قوتابخانـەی حەنبەلیە سوننیەکان ڕۆڵێکی زۆر کاریگەریان بینی لەدژایەتی کردنی نـەفامی و لـەناوبردنی ڕەفزو ژیاندنەوەی سوننەو، تیژکردنەوەی جیهاد لەدەرونی موسڵمانان.

١٠ـ هێرشە یەك لە دوای یەکانەی کاربەستانی سـەلاجیقەکان پێـی هەڵسـان بـۆ ڕیشـەکێش کردنی باطنیەکان، خزمەتێکی زۆرو سودێکی زۆری گەیاند بە جیهانی ئیسلامی لەوانە:

---

١ـ هەمان سەرضاوة.

٢ـ أیعیدالتأریخ نفسه؟ لا٧٠ـ ٧٣.

٣ـ هەمان سەرضاوەی ثێشو.

لەساڵی (٤٣٦) کۆچی سوڵتانی بلاد ماوراء النهر بغراخان هەڵسا بە هەڵمەتێکی پیرۆز بۆ لەناوبردنی تایفەی ئیسماعیلی، سەرەتا ئەوانەی لە ناوبرد، کە دەوڵەتی عوبەیدی لـە میسـر وەك بانگخواز ناردبوونی، جا هەموویانی کوشت و نوسراوێکیشی نارد بۆ دەڤـەرەکانی وڵات بـەوەی ئەوانـە بکوژن، بـە کوشـتنی ئـەو عوبەیدیـە بـاطنیانـە، وڵات هـێمن و ئـارام و پـاك بوویەوە، خەڵکی شاری ئەصبەهانیش ئەوانەی لە لایان هەبوون هەموویان کوشـتن، لەمـەدا پێشەنگیان مسعود بن محمد الخجندي بوو،کە فەقیهێکی شافیعی سوننی بوو.

لەساڵی (٥٠٠) کۆچی سوڵتان محمد بـن ملكشـا سـەلجۆقی لـە شـەڕێکدا خـەڵکێکی زۆری لێکوشتن و قەلای ئەسفەهانی لێ پاکردنـەوە پـاش ئـەوەی ئابلوقـەی داو دواتـر بـەفرۆفێڵێك توانی گەورەکەیان إبن غطاش لە ناو ببات.[1]

لەساڵی (٥٢٣) کۆچی ئیسماعیلەکان ویستیان دیمەشق تەسلیمی خاچ پەرستەکان بکـەن لە بەرامبەر ئەوەی ئەوانیش شاری صوریان تـەسلیم بکەن، ئـەمیری دیمەشـق بـەم پیلانـەی زانی و هەڵسا بە کوشتنی گەورەکەیانو بە خەڵکیشی ڕاگەیاند، کە ئەوەی باطنیە بیکـوژن، جا شەش هەزار کەسیان لێکوژراو ئەمەش لەمانگی ڕەمەزان ڕوویدا.[2]

لەڕووداوەکانی ساڵی (٥١١) کۆچی إبن الأثير وتویەتی: سـوڵتان محمـد السـلجوقي زانـی، کـە بەرژەوەنـدی وڵات و خـەڵکی بەسـتراوەتەوە بەسـڕینەوەی شـوێنەوارو وێرانکردنـی مۆڵگـەکانیان و دەسـت بەسـەراگرتنی حەسـارو قـەڵاکانیان، ئەوکەسـەی لـەو سـەردەم گەورەیان بوو یەکێك بوو ناوی حسن بن الصباح الرازي بـوو ، کـە مـاوەی حـوکمی درێـژەی کێشاو نزیکەی (٢٦) ساڵ دەستی بەسەر قـەڵای مەوتـدا گـرت، ئەوانـەی لـە دەوروبەریشـی بـوون لـە خـراپترین بـارۆدخ دابـوون، چـونکە زۆر هێرشـی دەکـردە سـەریان و پیاوەکـانی دەکوشـتن، جـا سـوڵتان لەشـکرێکی ئامـادەکرد بـە قیـادەی أنوشـتكين کـە تـوانی چـەند قەڵایەکیان لێ بسەنتەوەو پاشان بەرەو قـەڵای مـەوت ڕۆیـیو مـاوەی یـەك مـانگ ئابلوقـەی دانو ئەوانیش مراوەغەیان دەکرد بـۆ وەرگرتنـی ئـەمان بۆیـە وازی لەقەڵایەکـە هێنـا، ئـەو سەرکردەیە بەردەوام بوولە ئابلۆقە دانیان،پاشان هەواڵی مردنی سـوڵتان محمـد هـات بۆیـە

---

١ــ الكامل ب١٠ ل٤٣٠.

٢ــ محمد كردعلي، خطط الشام ب ٢ل ٣ نقلاً عن كتاب أيعيدالتأريخ نفسه.

سەربازەکان پەرتەوازەیان کردو قەلاکە فەتح نەکرا[1]، بەلام لە سەردەمی سولتان سنجەر لە سالی (٥٢١) کۆچی توانی زەبرێکی کوشندەو خوێناوی لە باطنیەکان بدات لە قەلای موت و خەلکێکی زۆری لێکوشتن.

عوبەیدیەکان بەو هێرش و پەلامارانەی کرا سەریان دەولەتەکەیان نەزیف بوو شوێنەواریان سڕاوەو شەپۆلی باطنیش لە جیهانی ئیسلامی کزبوو بەرەو داکشان چوو.

بەڕاستی کردەوەی سەلاجیقەکان لە بە دواداچونی شوێنەواری باطنیەکان، کەس ناتوانی پاداشتیان بداتەوە لەو کارە گەورەیەی کردیان بۆ خزمەتی ئوممەتی ئیسلامی تەنها خوای پەروەرگار نەبێت.

١١ـ بە دیار کەوتنی چەند ئەمیرێکی خواناس و شارەزا لە بواری جەنگ ،کە عەودالی شەهید بوون بوون، بە تایبەتیش ئەمیری خواناس و قائیدی گۆڕەپان عمادالدین زەنکی کە دەستی بە جیهاد کردن کرد لە گەل خاچ پەرستەکان و متمانەشی گەڕاندەوە بۆ دەروونی موسلمانان، مدن الجزيرة و موصلیشی یەکخست، بە هێزی باوەڕیش هێرشی کردە سەر نەصرانیەکان بۆ سەندنەوەی ئەو قەلاو شوێنانەی دەستیان بەسەردا گرتبوو هەروەها توانی لەسالی(٥٢٢) کۆچی شاری حەلەب ڕزگار بکات لە ژێر دەستی نەصارا. لە سالی (٥٣٢) کۆچی ڕۆم لەشکرێکی زۆر گەورەیان هێنا، کە فەرەنجیەکانیشان لە گەلدا بوو، عمادالدین زەنکیش لەگەل سولتان إبن منقذ الكناني هاوپەیمانیەتیەکیان بەست کە بەم هۆیە نەصرانیەکان دۆڕان و هەلاتن.

لەسالی (٥٣٤) کۆچی زەنکی چەند هەلمەتێکی کردە سەر فەرنجیەکان، کە لە مەدا موسلمانان ئارامیەکی زۆریان گرت، کە نموونەی کەم بووە، مەگەر ليلة الهدير یان قادسیة وەکو ئەو بوو بێ، جا خوای گەورە موسولمانانی سەر خستو پادشای فەڕەنجیەکانیش ڕایان کرد.

یەکێك لە هەرە کردەوە گەورەکانی فەتح کردنی شاری ڕەها بوو لە سالی (٥٣٩) کۆچی، کە ئەو شارە هاتە ژێر حوکمی ئیسلام، ئەم شارە لەلای نەصاری لە پیرۆزترین

---

١ـ أبعيدالتأريخ نفسه؟ لا٧٥ـ ٨١.

شارەکانیان بوو، پاشان لە دوایی ئەوەش چەند قەڵایەکی نزیك ئەو شوێنە ڕزگار کرا، بەمە دیار الجزیرة قوتاری بوو لە حوکمی فەرەنجیەکان.

زەنکی نەیتوانی ئەم قۆناغەی تەواو بکات، چونکە کاتێك دەیویست قەڵای جەعبەد ڕزگار بکا، کە کەوتبوە سەر ڕوباری فورات لەوێ کوژرا، زەنکی ــ رحمە الله ــ لە پادشا هەرە چاك و باشەکان بوو زۆریش ئازاو دلێر و بەجەرگ بوو لەساڵی (٥٤١) کۆچی کوژراو شاعیرەکانیش گەلێك مەدحی کردەوەکانیان کرد.

لەو کردەوانەی شاعیران مەدحیان کرد ئەوەبوو کاتێك پادشای ڕۆم هێرشی کردە سەر شیزر ئەمیر زەنکیش بەرپەرچی داوە، جا مسلم بن خضر بن قسیم الحموری لە هۆنراوەیەکدا مەدحی دەکات و دەڵێت:

| | |
|---|---|
| بعزمك أيها الملك العظيم | تذل لك الصعاب وتستقيم. |

هەر لە درێژەی هۆنراوەکەیدا وتویەتی:

| | |
|---|---|
| ألم تر أن كلب الروم لما | تبين أنه الملك الرحيم |
| فجاء يطبق الفلوات خيلا | كأن الجحفل الليل البهيم |
| وقد نزل الزمان على رضاه | ودان لخطبهالخطب العظيم |
| فحين رميته بك في خميس | تيقن أن ذلك لا يدوم |
| وأبصر في المفاضة منك جيشا | فاحرب لايسير ولا يقيم |
| كأنك في العجاج شهاب نور | توقد هو شيطان رجيم |
| أراد بقاء مهجته فولى | وليس سوى الحمام له حميم.[1] |

## تەوەرەی دووەم: نورالدين محمود

نورالدین زەنکی پاش عمادالدین زنکی، کە باوکی بوو کاروباری وڵاتی گرتە دەست و هەر لەگەڵ باوکیشی لە عێراقو موصلو شام گەورە بوو.

لەپاش مردنی باوکی جێگایی گرتەوەو کاروباری زۆرباش و گرنگی ئەنجام دا لەوانە: سوننەی ژیاندەوە لە حەلەب و هەڵسا بە نەهێشتنی بیدعە و بن برکردنی رافضەو،

١ــ الكامل ب ٧ ٢١ــ ٢٢.

قوتابخانەی زۆریشی دروست کردو پارەیەکی زۆریشی بۆ خێرو خێرات وەقف کردو ، زۆریش موتالاَی کتێبە ئاینیەکانی دەکردو پێ بەپێش شوێن کەوتەی فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ بوو، بەردەوامیش بوو لە کردنی نوێژەکان بە جەماعەتو زۆریش وریای خواردنو جل وبەرگی حەرام بوو بە هیچ شێوەیەکیش وشەیەکی ناشیرنی لە دەم نەبیسترا[1]، إبن الأثير لە بارەیەوە وتویەتی: موتالاَی مێژووی پادشاکانی پێش ئیسلام و پاش ئیسلامی کردوەو هەتاوەکو ئێستا نەم بینیوە کەسێك هەبێ وەکو ئەو دادگەرو باش بوو بێ، مەگەر خولەفای ڕاشیدین و عومەری کوڕی عبدالعزیز[2].

لەو زوهدو تەقوایەی هەیبوو ئەوەبوو، کە نەیدەخواردو جلیشی لەبەر نەکرد تەنیا لەو ماڵە نەبێ، کە لەغەنیمەت بەری دەکەوت ، هەروەها لەو ماڵەی تەرخان دەکرا بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان، ڕۆژێك خێزانی شەکوای نەبوونی خۆی کرد لەلایو داوای نەفەقەی زیادی لێکرد ئەویش ڕەنگی سور هەڵگەراو وتی: لە کوێ نەفەقەی زیادی بدەمێ وەڵلاهی لە بەر هەواو نەفسی ئەو خۆم ناخەمە ناو ئاگری دۆزەخ.

پاشان وتی لەحیمص سێ دوکانم هەیەو مولکی خۆمە بابۆ خۆی بێ[3] هەر ابن الاثير لەو بارەیەوە وتویەتی : بەشەو زۆر نوێژو استغفاری دەکردو بەردەوامیش لەسەر ئەوەبوو هەتاکو وەفاتی کرد.

## جمع الشجاعة والخشوع لربه  ما احسن المحراب في المحراب[4]

نورالدين زەنکی زۆر شارەزای مەزهەبی ئەبو حەنیفە بوو، بێ ئەوەی دەمار گیری لاهەبی، بەڵکو ئینصاف و دادگەریەکەی لەهەموو شتێکدا سروشتی بوو، بەڕاستی هەر ئەو بوو پادشاکانی فێرە ئینصاف و دادگەری کردو خۆشی زۆر دوور دەگرت لەخواردن و خواردنەو جل و بەرگی حەرام، پادشاکانی پێشە خۆی وەکو سەردەمی نەفامی پیشەیان هەرتێر کردنی زگو عەورەتیان بوو، کەنەیاندەزانی ئیشی چاکە چیەو کاری خراپەشیان

---

١ـ والروضتين في أخبار الدوليتين لا٣١.

٢ـ الكامل ب ٧ ـ٢٤٢.

[3] ـ الكامل ب ٧لا٢٤٢

[4] ـ الكامل ب ٧لا٢٤٢

قەدەغە نەدەکرد، لەولاتی خۆشی باج و گومرگ و فرت و فێلی نەهێشت، بەلکو لەولاتانی شام و جەزیرەو میسریش قەدەغەی کرد.[1]

یەکێك لەدادگەریەکانی ئەوەبوو، کە شوێنێکی تەرخان کرد بۆ دادگەری و هۆی تەرخان کردنی ئەو شوێنەش ئەوە بوو، کەهەندێك لەئەمیرو بەرپرسانی لەشکرەکەی ستەمیان لە خوارەوەی خۆیان دەکرد جا زۆر شەکوا هاتە لای قازی کمال الدین ئەویش هەندێکی دادگایی کردن بەلام جورئەتی نەبوو بەرامبەر اسدالدین شیرکۆ، نورالدین کە بەمەی زانی ئەو جێگایەی تایبەت کردو تەرخانی کرد بۆ داجگەری لە نیچوان خەلکیدا ، اسدالدین شیرکۆش کە بەمەی زانی وتیە دارو دەستەکەی ئەگەر بەهۆی یەکێکتان بانگ بکرێمە دار العدل ئەوا لەخاچی ئەدەم جا برۆن ئەوەی گرفتی هەیە لەگەڵ هەر یەکێك بابچێ رازی بکاو ئیشەکەی کۆتای پێ بهێنێت وتیان ئەگەر ئەوە بکەین خەلکی داواکاریان زۆردەبێ، وتی: هەموو مولکم لەدەست بدەم ئاسانترە لەلام لەوەی نورالدین بەستەم کار لە قەلەمم بدات ، نورالدین هەفتەی دوو رۆژان لەو شوێنە دادەنیشیت ئەوەی اسدالدینیش وتبووی پێی زانی یەکسەر سوجدەی شوکری بۆ خوای گەورە برد.

نورالدین لەولاتی ئیسلام بەرژەوندی زۆری دابین کرد بۆ مسولمانانو کاری زۆر چاکی کردو، پەرژینی بۆ هەموو ولاتانی شام دروستکرد، لەشاری حەماو حەلەبو دیمەشقیش قوتابخانەی زۆری دروست کردو، ئەهلی خواناسانیش لای ئەو جێگایەکی بەرزیان هەبوو، ئەمیرو کاربەدەستەکانی لەسەر ئەمە حەسودیان پێ دەبرد،جارێکیان یەکێك لەئەمیرەکان لەبەردەم نورالدین باسی خراپەیەکی شیخ قطب الدین النیسابوري کرد جا سولتان پێی وت : کورە ئەوەی تۆ باسی دەکەی چاکەیەکی هەیە ئەویش دین و عیلمەو هەموو خراپەکانی رەش دەکاتەوە بەلام تۆو هاوەلانت هەلەتان زۆرەو هیچ چاکەیەکیشتان نیە بیسرێتەوە منیش خراپەکانتان هەلدەگرم لەگەڵ ئەوەی هیچ چاکەیەکیشتان نیە ئایا خراپەکەی ئەو ئەگەر وابێ لەگەڵ ئەوەی چاکەی هەیە بۆ چی هەڵیان نەگرم، ئەگەر چیش

---

[1] ـ الروضتین ب ١ لا ٦٧

من باوەر ناکەم بەوەی دەیلێیو جارێکی تریش ئەگەر هاتیەوەو باست کردەوە ئەوا سزات دەدەم.[1]

یەکێك لەتەقواو خوا پەرستیەکانی ئەوە بوو ، کەئەو دیاریانەی لەلایەن پادشاکانەوە بۆی دەهات دەست کاری نەدەکرد بەڵکو دەینارده لای قازی جا کە نرخەکەی بەدەست دەکەوت سەرفی دەکرد لەدروست کردنی ئەو مزگەوتانەی چۆل کرابوون، نورالدین بەسینگێکی زۆر فرازان ڕەخنەی وەردەگرت با ڕەخنەکە هەر چەندە توندو قورسیش بوایە، جارێکیان ابو عثمان منتخب بن ابي محمد الواسطي کەیەکێك بوو لەپیاوە باشەکانی سەر دەمی خۆی ڕەخنەی لەدەوڵەتی زەنکی گرت چونکە باجو گومرگی وەردەگرت جاهەر لەپێش خودی نورالدین ئەو ڕەخنەیەی لێ گرتو ئاگاداری کرنەوەو ترساندیانی لەوەی تێی کەوتوون جا ئەو هۆنراوەیەی بۆ نور الدین وت:

مثل وقوفك ايها المغرور    يوم القيامة والسماء تمور
ان قيل نورالدين رحت مسلما    فاحذر بان تبقى ومالك نور
انهيت عن شرب الخمر وانت    كاس المظام طائش مخمور
عطلت كاسات المدام تعففا    وعليك كاسات الحرام تدور
ماذاتقول اذا نقلت الى البلى    فردا وجاءك منكر ونكير
ماذا تقول اذا وقفت بموقف    فردا ذليلا والحساب عسير
وتعلقت فيك الخصوم وانت فى    يوم الحساب مسلسل مجرور
وتفرقت عنك الجنودوانت في    ضيق القبور موسر مقبور
وودت انك ماوليت ولاية    يوما ولاقال الانام الامير
وبقيت بعد العز رهن الحفيرة    في علم الموت وانت حقير
وحسرت عريانا حزيناباكيا    قلقا ومالك في الانام مجير
ارضيت انا تحيا وقلبك دارس    عافي الخراب وجسمك المعمور
ارضيت ان يحضى سواك بقربة    ابدا وانت معذب مهجور

---

[1] ـ الروضتين ب١ لا ٨ـ ٩

مهد لنفسك حجة تنجو بها     يوم المعاد ويوم تبدوالعور.

کاتێك نورالدین ئەم دێڕە شیعرانەی گوێ لێ بوو زۆر گریاو دەست بەجێش فەرمانی دەرکرد بۆ هەموو وڵات کەچیتر باج و گورمك وەرنەگرن، [1] نوسراوێکیشی بۆ خەڵك نووسی کەوا گەردەنی ئازاد بکەن لەوەی لێی وەرگرتونە چونکە ئەوەی لێیان وەرگیراوە بۆ شەڕکردن بووە لەگەڵ دوژمنەکانیانو بۆ بەرگری بووە لە وڵاتو ماڵو منداڵیان جا ئەم نوسراوەی گشتاند بۆ کاربەدەستەکانی ویلایەتەکەیو واعیظە کانیشی راسپاردەکرد کە بازرگانەکان لێی خۆش ببن لەوەی لێیانی وەرگرتوە ، نورالدین لەکاتێك سوجدەی بۆ خوا بېردبایە دەیوت: خودایە بەزەیت بە محمودی باجگرو ستەم کارو سەگدا بێتەوە [2]

نورالدین زۆر دژی مەرایو نیفاق بوو، لەوانە وتار خوێنەکانی لەسەر مینبەر قەدەغەکرد، کە بەبێژەی زرنگەدار، کەلەسەری راهاتبون دوعای بۆ بکەن ، بۆئەوەی خۆیان نزیك بکەنەوە لەسوڵتان... بۆیە داوای لەخالد بن محمد بن نصر القیسرلنی کرد واز لەم جورە قسانە بهێنێو بەچەشنێکی تر دوعا بکات دوعایەکەش ئەوە بوو کە نووسی:

اللهم اصلح عبدك الفقير الى رحمتك الخاضع لهيبتك المعتصم بقوتك المجاهد في سبيلك المرابط لاعداء دينيك ابا القاسم محمد بن زنكي بن أق سنقر ناصر امير المؤمنين.

نور الدین دوعایەکەی خوێندەوە پاشان بەم گوزارشتە تەعلیقێکی لەسەر لێداو وتی: مەبەستم ئەوەبوو درۆ لەسەر مینبەر نەکرێت من بەپێچەوانەی هەموو ئەوانەوەم کەپێمدا هەڵگوتراوە ئایا کەیف خۆش بم بەوەی کە تێم دا نیە؟ بەڕاستی ئەوە زۆر بێ عەقلیە...

---

[1] ـ البداية والنهاية ب١٢ ل٣٠٢

[2] ـ ئەم وتەیە ئەگەر ڕاست بێ نور الدين بەخۆی وتبێ ئەوا بەهیچ شێوەیەك ڕەوا نیە مسوڵمان بەخۆی بڵێ چونکە خوای گەورە بەگشتی ڕێزی لەنەوەی ئادەم گرتوەو بەتایبەتیش ئەگەر موسوڵمان بێت، ئەمە چ جای نورالدین محمود کە خەلیفەیەکی دادگەرو دیندارو عامیل بەعیلمەکەی بووەو ئەهلی عیلمیشی زۆر خۆش ویستوە بەڵام ،کە بەخۆی گوتوە سەگ ئەوە ویستویەتی نەفسی خۆی نزم بکات و خۆی سادەبکات ، واتە بەنیەتەکی باش وتویەتی : بەڵام ئەگەر بەنیەتی باشیش وتبی ئەوا ڕەوانیە، چونکەخوای گەورە لەقورئان زانای خراپ و دین فرۆشی بەسەگ شوبهاندوە، پێغەمبەریش قەدەغەی کردوە وەك وشتر دابنیشین، لەکاتی سوجدە بردنو، هەروا وەکو سەگ دەستی خۆمان دابنێین، زانایانیش دەفەرمون خواو پێغەمبەرکەی ئەگەر مرۆڤیان بەئاژەڵ چواندبێ ئەوا تەنها لەجیهەتی زەم بووە.والله اعلم . وەرگێر

ئـەوەی دوعایـەی خـۆم نوسـیومە شـتێکی زۆر باشـەو چـەند دانەیـەکی لەبـەر بگرنـەوە بۆئەوەی بۆ هەموو شارەکانی وڵات بنێرن، پاشان وتی ئەمەشی بۆ زیاد بکـەن اللـهم اره الحق حقا اللهم اسعده اللهم انصره اللهم فقهه[1].

کاتێك داوا کرا لەنورالدین رێ بەئەمیرەکان بدات بۆ ئەوەی جۆرە سیاسەتێك بـەکار بهێـنن چـونکە تێـك دەرەکـان و رێگرەکـان زۆر ببـوون و پێویسـتی دەکـرد بـە سیاسـەتێکی تـر مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت ئەو سیاسەتەش نەدەهاتـە دی تـەنها بەکوشـتن و لـەخاچ دانیـان نەبێت، چونکە ئەگەر ماڵی یەکێك لەبیابانێك ببردرایە کێ دێت شاهێدی بۆ بدات؟

کاتێك نوسراوەکە بەدەستی نورالدین گەیشت وەری گێڕاو لەسەر پشتی نووسی: خوای گـەورە ،کـە ئـەو هـەموو دروسـت کـراوەی بـەدیهێناوە هـەر خۆشـی شـارەزاترە بـە بەرژەوەنـدیانو بەرژەوەندیەکەشـیان بەشـەرعە پـاك و تەواوەکـەی دێتـەدی، هـەر بەرژەوەندیەکیش هەبێ خوای گەورە لەکیتابەکەی باسی کردوە جا پێویستمان بـەوە نیـە یەکێك لەسەر شەرعەکەی خوا شتێك زیاد بکـات ، ئـەوەی شـتێك زیـاد بکـات ئـەو مانـای ئەوەیە، کەشەریعەت کـەم و کـوڕی تیایـەو ئـەو دەیـەوێ بـەم شـتە زیـاد کراوانـە تـەواوی بکات، ئەمەش زوڵم و سـتەم و بێ ئەدەبیـە بەرامبـەر خـوای پـەروەردگار و شـەرعەکەی، عـەقلی تـاریکیش هیدایـەت وەرنـاگرێو هەرخواشـە هیدایـەتمان دەدات بـۆ کیتـاب و رێگـا ڕاستەکەی ،ئەو کەسەی ،کە ئەو داوایەی لەسوڵتان نورالدین کرد شێخ عمرالملاء بـوو، کـە لەسەر داوای ئەمیرەکان ئەو داوایەی کردبوو جا کەوەڵامی سوڵتان گەیشـت شـێخ خـەڵکی موصلی هەموو کۆکردەوەو نامەکەی بۆ خوێندنەوەو وتی: بڕواننە کیتابی من بۆ سوڵتان و هی سوڵتانیش بۆ من.[2]

خوێنەری بەرێز ئەوەی باسم کرد لەسیرەو ژیانی سوڵتان نورالـدین محمـود بـۆ ئەوەیـە ،کە بزانی ئەوەی خوای گەورە رێزی لێ بنێ بەسەر خستن و پاڵ پشـتی کردنـی ئـەوا هـەر دەبێ پیاوەکی خوایی بێت و بەردەوام دەبێت پەیوەست بێت بەخوای پەروەدگاری.

---

[1] ـ نورالدین محمود.د حسین مونس لا٤٠٠ـ ٤٠١

[2] ـ الکواکب الدریة ابن قاضي شهبة لا٢٥ـ٢٦

سیاسـەتەکانی نورالـدین چـەند ئامـانجێکی هـەبوو، کـە لەپێشـەی خـۆی داینـابوون‌و بەهەموو هەوڵ و تەقەلایەکیش هەوڵی دەدا بیان هێنیتە دی جا یەکێك لـەگرنگ تـرین ئـەو ئامانجە دیارانە ئەمانەی خوارەوە بوو:

یەکەم: ئامادەکردن و پەروەردەکردنی گەل بە پەروەردەکردنێکی ئیسلامیانە و پاك کردنەوەی ژیانی ئاینی و ڕۆشنبیری لە هزرە لارێبوەکان وەك باطنیەکان و فەلسەفەی یۆنانی و مومارەسەی عوبەیدیەکان بۆ پەرستنەکان و دروشمەکان ،جا بۆخاتری هێنانەدی ئەم ئامانجە بێگەردو پیرۆزە دەوڵەت هەڵسا بەدرۆست کردنی چەند قوتابخانەو حوجرەیەکی تایبەت بۆ فێربوونی قورئان و فەرمودە،کە بۆ ئەمە بەناو بانگ ترین زانان و پەروەردە ناسانی هێنایە ناو قوتابخانەکان و بەتایبەتیش ئەوانەی دەرچووی قوتابخانەی غەزالی و قادری بوون ، ئەو پلانە تەعلیمی و پەروەردەییەی لەسەردەمی نورالدین موسوڵمانانی پێوە پابەند کرا ئەوا یەکی دەگرت لەگەڵ ئامانجەکانی ئیسلام‌و لەسەر بنچینەی بیرو باوەرێکی ڕوون ئاشکرا دامەزراو، ئەم کارە پیرۆزەش لە قوتابخانەو مزگەوتەکان ئەنجام دەدرا ،کە تەنها لەدیمەشق سەد(١٠٠) مزگەوت هەبوو. ئەو ڕاپەڕینە عیلمیە جەغتی لەسەر یەکلا کردنەوەی ڕۆحی ئیسلامی‌و خاوەن مەفاهیمی سوننی و ڕێگای پێغەمبەر دەکرد.... لەهەمان کاتیشدا هەڵسان بەوشك کردنەوەو بەرتەنگ کردنەوەی تەعالیمی مەزهەبی ئیسماعیلی و فەلسەفی، کە بیرو باوەڕی خەڵکیان زۆر گۆری‌و زۆریش کاریان لە نەریتە سیاسی‌و کۆمەڵایەتیەکانی خەڵکی کرد هەر لەبەر ئەوەش ابن جبیر وەسفی کردونە ،کە ئەوانە هیچ ئیسلامەکیان نەبووەو، ئەهلی هەواو بیدعە بوونە، مەگەر ئەوەی خوا قوتاری کردبێ، دەوڵەتی زەنکی هەموو ئەو دیاردانەی عوبیدیەکان پێوەی ناسرابوون قەدەغەی کرد لەوانە حی علی الخیر العمل لەبانگدان قەدەغە کردو زۆر بەتوندیش ڕەتی کردەوە، کەجنێوو بەهاوەڵە بەڕێزەکان بدرێ، زانایانی ئەهلی سوننە لەمەدا وەك سەربازێکی دلسۆز لەگەڵ دەوڵەت ڕاوەستان و یارمەتیان دا، لێرە لەبەر هیچرشی توندی دەوڵەتی زەنکی سوننی تائیفەی ئیسماعیلی‌و شیعەکانی تر بەگشتی هێور بوونەوە. فەقیهی شافیعی قطب الدین النیسابوري الخراساني لەسەردەمی سوڵتان نورالدین خاوەن ڕۆڵێکی یەکجار کاریگەر بوو لەژیاندنەوەی سوننەت هەروا کوڕی

شێخ ابي نجيب الاكبر البغداديش کۆلەگەیەك بوو لەکۆلەگەکانی دەوڵەتی زەنکیو لەئەصبەهانیش شرف الدين عبدالمؤمن بن شوردة خۆی دایە پاڵ نورالدینو یارمەتیدا.

سوڵتان سیاسەتی تەعلیمی دەوڵەتی ڕوون کردەوەو وتی: مەبەستمان لەدروست کردنی قوتابخانەکان تەنها بۆ بڵاوکرنەوەی عیلم و لەناو بردنی بدیعەو ئاشکرا کردنی ئایین بوو.

وەزیرو سەرکردەو دەوڵەمەندو پیاوو ئافرەت پێش برکێیان کرد لەسەرف کردنی ماڵ و سامانیان بۆ دروست کردنی قوتابخانەو دامو دەزگا زانستیەکانو هەڵێکی باشیشیان ڕەخساند بۆ تاك تاکی ئوممەت بۆ ئەوەی بچنە ناویو سوودی لێ وەربگرن.

دەوڵەتی زەنکی هەتا کرێکارو جوتیارو بازرگانەکانی فەرامۆش نەکرد بەڵکو ئامۆژگاری کردن و عەقیدەو ئەخلاق و بەهای بەرزی لەدەروونیان چاند. ئەو تەصەوفە مام ناوەندەیەی ،کەشیخ عبدالقادر الجیلانی سەرکردایەتی دەکرد کاریگەریەکی باشی هەبوو لەدەرونی خەڵکی ، دەوڵەتی زەنکی سودێکی زۆری بینی لەحرکة الصوفية الاصلاحية القادرية و هەڵسا بەتەرخان کردنی شوێن بۆیانو، زۆریش ڕێزی لەشێخەکانیان نا چونکە بەگوێرەی پلانی دەوڵەت هەڵسان بەپاککردنەو پەروەردەکرنی موسوڵمانانو لەلایەکی تریش لەتەك پرۆسەی فێرکردن و پەروەردەکردن دەوڵەت گرنگی بەلایەنی سەربازی داو، هەموو موسوڵمانانی مەشق پێکردو ڕووحی جیهادی لەنێوانیاندا زیندوو کردەوەو ئەو مەشقەش لەسەر دوو کۆلەگە ڕاوەستابوو:

١ـ ئامادەکردنی مەعنەوەیو روحی.

٢ـ پاشان مەشق کردنی سەربازی لەو بارەیەش سوڵتان نورالدین کیتابێکی نووسی لەسەر جیهادو ئەحکامەکانی .

لەناو دام و دەزگاکانی دەوڵەتی هەمە چەشن هەوڵ و تەقەلای زانازو فەقیە و پەروەردەناسو سەر کردەکان بوو بە یەك و کامیل بوو هەمووشیان هەوڵیاندا بۆ هێنانەدی بەرنامەی دەوڵەتی نورالدین ی سوننی.

جا بەهۆی ئەو تەکامولو ڕێککەوتنە دەوڵەتی دروشاوەی نورالدین بوو بە جەمسەرێکی سەرنج ڕاکێش بۆ هەموو زانایان و پیاو چاکان، بۆیە لە زۆربەی ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی کۆچیان کرد بۆ لای و هاتنە ژێر بەیداخە ئیسلامیە پیرۆزەکەی، کەژمارەیان

دەگەیشتە چەند هەزارێك، دەوڵەتیش بەگوێرەی بەرنامە دارێژراوەكانی سوودی زۆری لێ بینین ، كتێبەكانی مێژوو ناوی هـەزاران لـە قوتابخانـەو حوجرەكـانی فێربـوونی قورئـان و فەرمودەو تەكیەكانیان باس كردوە، كەئەوانە هەموویان ببوونە یەك هێزو بەیەك ئاراستەدا دەرۆیشتو دەوڵەتی زەنكیش بەسەركردایەتی كردنی نورالدین سەر پەرشتیار بوو لەسەر هـەموو پـلان و بەرنامەكان،كـە بـەرو بـوومێكی باشـی لێهاتـە دی بـەوەی ژێرخـانی كۆنی وڵاتانی شامی گۆڕیو نەوەیكی بگۆڕی فیعلی دروست بوو رۆحی ئیسلامیش زاڵ بوو بەسـەر هەموو چـین و توێـژكانی كۆمـەڵ، لەهـەموو بوارەكـانی ژیـانیش چـالاكانە هێـزو توانایـان خستە گەڕ، جـا گـۆارن بـووە ئـاوازی ئوممـەتێك و، سـوننەتی خـوای گـەورەی نـەگۆڕییان لەسەر هاتە دی ﴿إنَ اللهَ لايُغيُرُ ما بِقَومٍ حتِى يُغَيِّرُ ما بانْفُسِهِم﴾ الرعد/١١

دووەم: دەوڵەتی نورالدین و یاریدەدەرەكانی لە سەركردەو سوپاو هێزی لەسەر عـیلم و ئـەخلاق و پلـەو پایـەكی زۆر بـەرز بـوون ،یـەك لـەو نموونانـە وەزیرەكـەی كـە نـاوی ابـو ابوالفضل محمد بن عبدالله بن قاسم الشهرزوري بـوو، كەفـەقیهو ئوصـولیەكی زۆر بلیمـەت بـوو، زۆر مەنصەبیشـی پێـی سـپێردراوە وەك: سـەفارەتو وزارەت ، ئـەوقاف و مالیـەو قەزاوەتیشی كردوەو هەتا هاتنی صلاح الدین هەر بەردەوام بوو لەسەر ئەو مەناصیبانە.[1]

وەزیرێكی تریشی: عبدالله بن محمد بن ابی عصرون كە قـازی دیمەشـق بـوو لەئـەوقافیش كاری دەكرد[2]، صلاح الـدینیش خـۆی هـەر فەقیـە بـوو فیقهـی ئیمـامی شـافعی خوێنـدبوو فەرمودەشی لە ابو الطاهر السلفي بیستبوو، چەند كەسێكیش فـەرمودەیان لێـوە ڕیوایـەت كردوە وەك: یونس بن محمد الفرقی و عیمادی نوسەرو هی تریش ، وتراوە كە صلاح الـدین قورئانی لەبەر بووەو لەفقهیش كتابی التنبیە و لەشیعریش كیتابی الحماية.

وەزیریكی تریشی قاضي الفاضل عبدالرحیم بن علي بـوو كـە نووسـەرو ڕاوێـژكاری بـوو، صلاح الدین لەبارەیەوە وتویەتی: وڵاتم بەشمشێر فـەتح نـەكرد بـەڵكو بـەڕاو بـیری قاضـي الفاضل عبدالرحیم فەتحم كرد. ئەو قازیە زۆر سیاسەیەكی بلیمەتو دینداریكی گـەورەبوو، زۆر نوێژو رۆژوی دەگرتو قورئانی دەخوێندو زۆریش سـادە بـوو سـەردانی نەخۆشانیشـی

---

[1] ـ هكذ ظهر جيل صلاح الدين ل٢١٥ـ ٢١٧

[2] ـ طبقات الشافعية للسبكي ب ٦ ل١٨٨

زۆر دەکردو چاکەی زۆریشی دەرهەق بەفەقیران دەکرد. بەڕاستی ئەو نەوەیە شارەزایەکی هەمەجۆری هەبوو لە تەخطیط و تەنفیذو کۆکردنەوەی وزەو تواناو ڕێکخستنیان ، کە وای لێکرد ڕووبەرووی هەموو تەحەدیاتی ناوەوەو دەرەوە ببێتەوە، هەندێك لە نمونەی ئەو شارەزاییانە ئەمانەی خوارەوەیە:

یەکەم: کامل بوونی سەرکردەی فیکری و سیاسی، کە ئەو سەرکردایەتیە بەتەواوی لە ترسناکی تاك ڕەوی سەرکردەیەك تێگەیشت، بۆیە لەدەرکردنی بڕیارەکانی پشتی بەڕای زانایان و پسپۆران بەست، نورالدین کوڕێکی هەبوو ،کە تێیدا لەگەڵ سەرکردەو سەربازو زاناو پسپۆرەکان کۆدەبوەوەو ، ڕێزو پلەو پایەیەکی گەورەشیان لەو کوڕە لێ دەگیرا.

دووەم: پشت بەستن بەشوراو نەمانی تاك ڕەوی لە بڕیارداندا، بەڕاستی ئیدارەی نورادیین بەو شورایە جیا دەکرایەوەو لەهەموو کارو بارەکانی دەوڵەت ڕا گۆڕینەوەی تێدا دەکرا، کۆڕێکیش هەبوو کە نوێنەری هەموو مەزهەبەکان بگرە سۆفیشی تێدا کۆدەبوونەوە، کە دەیان کۆڵیەوە لە بودجەی گشتیو کاری ئیداری ، جا ئەگەر لە مەسەلەیەکیان بکۆڵیبایەوەو مەسەلەکەش پەیوەندی بەهەموو ئوممەتە هەبوایە، کە دانرا بوون بۆ بەرژەوەدی گشتی ، یان پەیوەندی بەماڵ و سامانانەوە هەبوایە، کە دانرابوون بۆ بەرژەوەندی مسوڵمانان، ئەوا ئەندامانی ئەو کۆرەی هەموو کۆدەکردەوەو ڕایانی وەردەگرت و لەو ڕایەش لای نەدەدا، کە لەسەری کۆ ببوونایەوە، لەوانە ئەو ڕوداوانەی لەساڵی (٥٥٤) کۆچی بەرامبەر (١١٤٩) زاینی ڕویدا ،کە نورالدین کۆڕێکی سازداو بانگی قازیەکانو گەورە پیاوانی دەوڵەتو چەند کەسێکی تریش لەشاهێدو دادگەرانی کرد بۆ لێکۆڵینەوە لەو ماڵ و سامانانەی وەقف کرابوو بۆ مزگەوتی ئەمەوی، پێشتر شێخەکانی مزگەوت چەند زەویو زارو شتی تریان هێنا بووە ناو ئەو قافی مزگەوت، جا نورالدین ویستی ئەمانە لەوانی تر جیا بکاتەوە بۆئەوەی ئەو شتە بەسوودانە بەکار بێنێ بۆ بەهێز کردنی کاری جەنگی و سەربازی و هەروا بۆ بەهێز کردنی دیواری دیمەشق بۆ ئەوەی موسوڵمانان خۆیان و ماڵیان پارێزراو بێت، چونکە ئەمە لەلای نورالدین لەهەم و بەرژەوەندیەکان گەورەتر بوو، جا کۆرەکە لەسەر یەك ڕا کۆك نەبوونو پێچەوانەی حەزو ویستی نورالدین بوو ڕێیان پێ نەدەدا شتە زیادەکانی ئەوقاف بەکاری بێنێ بۆ چاك

کردنەوە دیواری دیمەشق و هەڵکەندنی خەندەق ،بەڵام ڕێیان بەوەدا، کە بەقەرز ئەو شتانە ببات دوایی لە بیت المال بیگەڕێنێتەوە ، نورالدین لەگەڵ ئەوەی زۆریش پێویستی بەوماڵ و سامانە هەبوو بۆ بەهێز کردنی لایەنی سەربازی ، بەڵام بەدڵێکی زۆر فراوان ئەو ڕایەی وەر گرتو ڕێزی لە ڕای ئەو کۆرە گرتو دەستی لەپارەو پولی ئەوقاف نەدا[1]

سێ یەم: لەو جیاکاریانەی ئەو ئیدارەی پێی جیا دەکراوە پێش خستنی بەرژەوەندیە گشتیەکان بوو لەسەر هەڵچوونی بەرژەوەندی تاکە کەسی لە چارەسەرکردنی گیرو گرفتەکانی کە لە نێوان ئەندامانداا پەیدا بوو.

چوارەم: خۆ بەخت کردن بە برایەتیەکی ئیسلامیانە بۆ جیهاد کردن لەپێناوی خواو، پەیوەندیان بەئاین و شەرعیش بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی ،کە خاوەن پەروەردەیەکی ڕەسەن بوون و، بەڵگەی خۆشەویستیان بۆ ئاین ئەوە بوو ،کە ئەمیرو کار بەدەستەکان و سوڵتانەکان ناوی وایان هەڵدە بژارد کە پەیوەندی بەدین هەبوایە، وەك: عمادالدین و سیف الدین و معین الدین و صلاح الدین و اسد الدین و نجم الدینو زین الدین. بویهیەکانیش ئەوەندە خۆشەویستیان هەبوو بۆ دونیا بۆیە ناویان لەخۆنابوو عضدالدولة، بهاءالدولة، صمام الدولة.

ئەمیرو کاربەدەستەکانی دەوڵەتی درەوشاوەی نورالدین حەزیان لەمردن بوو لەگۆرەپانی جیهادو ئەگەر پێشیان نەکرابایە ئەوا لە وەسیەتەکانیان دەیان نووسی کە لەشاری مەدینەی پێغەمبەر بمان شارنەوە، لەوانەی ئەو وسیەتەیان کرد جمال الدین الموصلی و اسدالدین شیرکۆ و برایەکی نجم الدین کە دەکا باوکی صلاح الدین الایوبی[2].

## یەکگرتنی وڵاتانی شام و دیاری میسری

سیاسەتە عاقلو حەکیمانەکەی نورالدین محمود هەوڵی دەدا بۆ یەکگرتنی موسوڵمانان لەژێر یەك سەر کردەو لەسەر یەك ڕێبیری ڕەسەن بۆیە توانی دیمەشق و حەلەب و ڕەهاو جگە لەوانەش یەك بخات ، کە ئەوشارانە شاری ئیسلامی بوونو موسڵمانان بە خەباتێکی بێ وچان و خۆشەویستی شەهید بوون توانیان ڕزگاریان بکەن. نورالدین هێرشی بردن بۆ

[1] ـ هكذا ظهر جيل صلاح الدين لا٢٢٥

[2] ـ البداية والنهاية ب١٢ لا ٢٧٢

سەر قەڵاو شارەکانی نەصاری ،کە کەوتبووە نێوان میسرو شام، حەزو ویستی نورالدین لەپاك کردنەوەی میسر لەعوبیدیە باطینیە داخ لەدڵەکان ئاواتێکی گەورەو پێویستیەکی شەرعی بەرز بوو، بۆیە چەند زاناو فەقیە و واعیزی نارد بۆ میسر بۆئەوەی ڕزگاری بکەن و بیگەڕێننەوە بۆ باوەشی سوننەو وڵاتیش پاك بکەنەوە لەپیس و پۆخڵی ڕەوافضە کان ، لەبەناو بانگ ترینو دیارترین ئەو زانایانەی هەڵسان بەو کارە محمد بن موفق خەبوشانی بوو ، کە لەساڵی (٥٦٠)کۆچی چوو بۆ میسرو دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی ئیسلامێکی ڕاستو مژدەشی پێدان کە لەو زوانە بۆباوەشی سوننی دەگەڕێتەوەو لەلایەکی تریش نەفرەتی لەعوبەیدیەکان دەکردو بەبێ باوەری و بە کاسە لێسی بۆ یەهودیەکان تۆمەت باری دەکردن جا کاری گەری ئەو زانایە گەلێگ زۆر بوو، بۆیە ناوبانگی لەهەموو جیهانی ئیسلامی دەرکرد[1]

دەوڵەتی نورالدینی سوننی لەهەلێك دەگەرا بۆ ئەوەی بەسەربازەوە بچێتە ناو میسر جا ئەو هەڵە هات و ڕەخسا بەوەی کاربەدەستە عوبەیدیەکان لەمیسر لەنێوانە خۆیان لەسەر ماڵو سامانی دونیا پێك نەهاتن، جا وەزیر شاوەر هانای بۆ نورالدین هێناو قائد ضرغام یش هانای بردە بەر خاچ پەرستەکانو شەر لەنێوانیاندا دەستی پێکرد لەسالی ٥٦٤کۆچی بەتەواوی بەچەند قۆناغێك نورالدین توانی رزگاری بکاو پاشان صلاح الدین کاروباری میسری گرتە دەست و سوننەتی بۆ گەڕاندنەوەو دەستیشی کرد بەکۆ کردنەوەی موسوڵمانان و کردنیە یەك ڕیز بۆ فەتح کردنی بیت المقدس.

## وەفات کردنی نورالدین محمود

لەسالی ٥٦٩[2] کۆچی سوڵتانی سوننە مەزهەبو موجاهیدو دلسۆزو بەجەرگ و مرێنەری بیدعەو زیندو کەرەوەی بیدعەو لەناوبەری نەصاراو سەرخەری ئایین سوڵتان نورالدین ڕۆیشت بۆ رەحمەتی خوا پاش جیهادێکی گەورەو خۆبەخت کردنێکی کەم وێنە ، پاشان قوتابیە دلسۆزەکەی سوڵتان صلاح الدین کە لەبەر دەستی خۆی پەروەردەی کردبوو کردیە سەرکردەی سوپا.

---

١ ، هکذا ظهر جیل صلاح الدین ل٢٦٢

٢ ـ البدایة والنهایة ب١٢ـ ل٣٩٧.

## تەوەرەی سێ یەم صەلاحەدینی ئەیوبی ڕزگار کەری قودس و لابەری دەوڵەتی عوبەیدی لەمیسر

سوڵتان یوسف بن ایوب لەسالی (٥٣٢) کۆچی لەقەڵای تکریت لەعیراق لەدایك بووە ،باوکیشی ایوب بن شاد والی بووە لەسەر ئەم شوێنە، پاشان باوکی لەگەڵ اسد الدین شیرکۆی برای هاتنە موصل ،جا ئەو بەچکە شێرە ئەیوبیە لەژێر باڵی باوك و مامە موجاهیدەکەی پەروەردەبوو، لەکەتیبەکانی سەربازیش هەر پلەی بەرز دەبۆوە، کاتێك نورالدین محمود اسدالدین شیرکۆی نارد بۆ میسر صلاح الدین وەك یارمەتیدەرێكو بەردەستێك لەگەڵی رۆیی پاش کۆتایی هاتنی دەوڵەتی عوبەیدی و لەدوای مامی وەزارەتی تفویض ی گرتە دەستو دەستی کرد بەگەڕانەوەی میسر بۆخیلافەتی عەبباسی سوننی ، کە لەمەدا بە ژیرانەو لەسە خۆیی ئەو ئامانجە نایابەی هێنایەدی ، کە دەروونی موسوڵمانان زۆر بۆی پەرۆش بوو، پاشان هەڵسا بە هێنانە خوارەوەی قازیە عوبیدیەکانو کارو باری قەزاوەتیشی دا بە عبدالملك بن بندرباس الشافعیو لەبانگداندا رستەی حی علی الخیر العملی لابردو وتاری هەینیشی گەڕاندەوە بۆ خەلیفەی عەباسی پاش ئەوەی ماوەی (٢٠٨)ساڵ وتار لەعباسیەکان قەدەغەکرا، نورالدین محمود مژدەی ئەو هەواڵی بەخلیفەی عەبباسی ڕاگەیاندو خەڵکیش زۆر کەیف خۆشو شادومان بوون، صلاح الدین نەیهێشت هیچ هەولێك سەریگرێ بۆ گەڕانەوەی میسر بۆ خیلافەی عوبەیدی و بە باشیش مامەڵەی لەگەڵ ڕەوەندەکان کرد.عماد الاصبهانی لەگەڕانەوەی میسر بۆخەلافەتی عەبباسی چەند دێرە شیعرێکی جوانی وتوە پاش مردنی العاضد العبیدي و لەدەست دانی مولك و دەوڵەتی لەمیسر:

توفي العاضد الداعي مما    يفتح ذو بدعة بمصر فما
وعصر فرعونها انقضى وغدا    يوسفها في الامور محتكما
قدطفئت جمرة الغواة وقد    داخ من الشرك كل ما اضطرما
وصل شمل الصلاح ملتئما    به وعقد السداد منتظما
لما غدا مشعرا شعار بني    العباس حقاوالباطل اكتتما
وبات داعي التوحيد منتظرا    ومن دعاة الاشراك منتقما
وضل اهل الضلال في ظلل    داحية من غبائه وعمى

وارتكس الجاهلون في ظلم　　لما اضائت منابر العلما

وعادالمستضيئ معتليا　　ببناء حق بعدماكان منهدما

اعيدت الدولة التي اضطهدت　　وانتصر الدين بعدماكان اهتفما

واهتز عطف الاسلام من جلل　　وافتر ثغر الاسلام وابتسما

واستبشرت اوجه الهدى فرحا　　فليقرع الكفر سنه ندما

عاد حريم الاعداء منتهك الهدى　　وفي الطغاة منقسما

قصور اهل القصور اخربها　　عامر بيت من الكمال سما

ازعج بعد السكوت ساكنها　　ومات ذلا وانفه رغما[1]

ڕووخانی دەوڵەتی عوبیدی لەسالی(٥٦٧)کۆچی بوو، ابن کثیر لەوبارەیەوە وتویەتی: ماوەی حوکمی دەوڵەتی عوبەیدی دوسەد ساڵ و هەندێك بوو، بەڵام دوایی وەکو ئەوەیان لێهات هەر نەبووبن ﴿كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا فِيهَآ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾﴾ هود: ٩٥ یەکەم پادشایان مەهدی بوو پیشەی ئاسنگر بوو لەتیرەی سولەیمیەکان بوو ناویشی عبید بوو بەڕەچەڵەکیش جولەکە بوو، جا هاتە وڵاتی مەغریب و ناوی لەخۆی نا عبیدالله و پڕۆپاگەندەی ئەوەشی کرد کە یەکێکە لەعەلەویە فاطمیە بەڕێزەکان و وتیشی من مەهدیم هەروەکو کە زۆربەی زانایان لەپاش سالی (٤٧) کۆچیەوە ئەم وتەیەیان وتوە، مەبەست لێرەدا ئەوەیە کەئەو درۆزنە درۆیەکانی برەوی سەندو لەو وڵاتانە بازاری گەرم بوو خەلکێکی نەفامیش پشتیان گرت و یارمەتیاندا هەتا بووە خاوەن دەولەتێك پاشان شارێکی دروست کردو ناوی نا مەهدیەو نیسبەتی دایە خۆیو وای لێهات بوو بەپادشایەکی گوێرایەڵ کراو مەزهەبی ڕەفزیشی ئاشکرا کرد کە پێك هاتبوو لەکوفری ڕوون وئاشکرا، پاشان کوڕەکەی القائم محمد لەدوای خۆی هاتوو دواتر کوڕەکەی تری المنصور اسماعیل، پاشان کوڕەکەی موعید ، کە ئەمەیان یەکەمین کەسیان بوو چوو بۆ دیاری میسرو لەوێ شاری قاهیرە و مەغریبەوعەصرانەیان بۆدروست کردو دواتر کوڕەکەی العزیر نزارو، پاشان کوڕەکەی الحاکم منصورو، پاشان کوڕەکەی الظاهر علی و پاشان کوڕەکەی المستنصر

---

١ البداية والنهاية ب الا ٢٨٤

موعیدو، پاشان کوڕەکەی المستعلی احمدو ، پاشان کوڕەکەی الآمر منصورو، پاشان کوڕە مامەکەی الحافظ عبدالمجیدو، پاشان کوڕەکەی الظاهر اسماعیلو پاشان الفائز عیسا پاشان کوڕە مامی العاضد عبدالله ،کە کۆتایان بوو، هەموویان ژمارەیان چواردە پادشا بوو ماوەی حوکمیشیان دوو سەدوو هەشتاساڵو هەندێك بوو هەروەها پادشاکانی ئەمەویش ژمارەیان چواردە پادشابوو بەڵام ماوەی حومکم ڕانیان هەشتاو هەندێك ساڵ بوو، بەراستی فاطمیەکان لەهەموو خەلیفەکان ماڵیان زۆر ترو دەوڵەمەندتر بووینەو لەهەمووشیان بەزەبرو زەنگترو ستەم کارتر بووینەو لەهەمووشیان نگریس ترو پیس تر بووینە، لەسەروی ئەوانەشەوە بیدعە چیو سەرپێچی فەرمانەمانی خواو **پێغەمبەرکەیان** کردوەو فەسادو گەندەڵی و بی ڕەوشتی لەسەردەمی ئەوان گەلێك زۆر بوونو ، زاناو پیاو چاکانیش لەناویان گەلێك کەم بوون، لەزەوی وڵاتانی شامیش گروپی نصرية ودرزيةو حشيشية زۆر بوون، فەرەنجیەکانیش توانیان بەتەواوی دەست بە سەر کەنارەکانی شام دا بگرن و هەتا توانیان قدس و نابلس و عجلون و غورو بلاد غزة و عسقلان وکرك و شوبك وطبرية و بانياس و صورعكا و صيدا و بيروت و صفدو طرابلس و انطاكية و هەموو ئەوانەی لەدەوروبەری ئەوانەش بوون توانیان دەستیان بەسەر دابگرنو ژمارەیەکی زۆریشیان لەموسوڵمانان کوشت، کە هەر خوای گەورە دەیزانی چەندە، پاشان ئافرەتو منداڵی موسوڵمانانیان بۆخۆیان حەلال کرد، بەشێوەیەك کەوەسف ناکرێ، ئەو شوێنانەش پێشتر هاوەڵە بەڕێزەکان فەتحیان کردبوو ببوە دارالأسلام ،بەڵام ئەوانە دەستیان گرت بەسەر موڵكو سامانی موسوڵمانان و نزیکیش بوو بەسەر دیمەشقیش زاڵبن بەڵام خوای گەورە پاراستی جا ، کە ڕۆژیان ئاوا بوو دەرکران و خوای گەورە بەهێزو توانا و گەورەیی و کەرەمی خۆی ئەو شوێنانەی گەڕاندەوە بۆ موسوڵمانان[1]

زانایانی ئەهلی سوننەو خەتیب و حاکمەکان مەدحی ئەو کارە چاکەیان کرد ،کە صلاح الدین پێی هەڵسا ئەویش لەناو بردنی عوبەیدیە رافضية باطنیەکان بوو، شاعرانیش بەهونراوەکانیان مەدحیان کرد جا یەکێك لەوان وتویەتی :

---

١ ـ البداية والنهاية ب١لا٢٨٧

ابدتم من بلى دولة الكفر من بني عبيد ان هذا هوالفضل
زنادقه شيعية باطنية مجوس ومافي الصالحين لهم اصل
يسرون كفرا يظهرون تشيعا ليستروا سابور عمهم الجهل[1]

بەڕاستی نورالدین محمود وای دەیڕوانی ،کە لابردنی عوبیدیەکان ئامانجێکی ئیستراتیجیە بۆ لە ناوبردنو نەصرانیەکانو دەسەلاتی باتینی لەولاتی شامدا ، بۆیە هەوڵیدا میسر بگەڕێنێتەوە بۆ حوکمی ئیسلامی ڕاستو هەڵسا لەم پێناوەدا پیلانی داناو لەشکری ئامادە کردو ئەمیری شیاویشی دانا، جا خوای گەورە ئەوەی ویستی پێیدا بەهۆی سەرکردە دلسۆزەکەی صلاح الدین، کەسیاسەتە حەکیمانەکەی نورالدین ی جێ بەجێ کرد، پاش ئەوەی کاروباری ولات و خەڵك هێمن بویەوەو ، بیدعەو شتی پڕو پوچ لە ناوبراو سوننەت ژیاندراوەو فیتنەش کوژێنرایەوە ، نورالدین گەڕاوە لای پەروەردگاریو کاروباری دەولەت کەوتە دەست صلاح الدین پاش چەند دورست بوونی چەند فیتنەیەك، کەتوانی لەناوی ببات ، لەژێر سەرکردایەتی خۆی توانی ولاتی شام و میسر یەك بخاتو ، دەستیشی کرد بەجێ بەجێ کردنی ئەو ئامانجە دیاری کراوانەی دەوڵەتی نورالدین، یەکێك لە ئامانجەکانی کە لەلای زۆر گەورەبوو ڕزگارکردنی شارو شارۆچکەکانی موسوڵمانان بوو لەژێر چەپۆکی نەصارا بەتایبەت بیت المقدس هەتا مینبەرێکی گەورەی بۆ ئەم کارە ئامادە کردبوو بەلام پێش ئەوەی ئەم ئامانجە گەورەیە بێتەدی وەفاتی کردو خوای گەورە هەڵی گرت بۆ صلاح الدین . صلاح الدین هەڵسا بەدرێژە پێدانی جیهادی پیرۆزو بەهێزو پلانێکی ڕوونو قایم توانی قەلاو شارەکانی رزگار بکات لەژێر چەپۆکی نەصاراو توانی لەساڵی (٥٧٥)کۆچی لەشەری مرج العیونو بانیاس بەسەر فەرەنجیەکاندا زاڵ بێتو سەرکردەکانیان بەدیل بگرێتو قەلای ئەحزانیشی لەصفد وێران کردو بەردەوامیش پەلاماریانی دەداو قەلا دوای قەلای لێ دەسەندنەوە هەتا لەگۆڕەپانی حطین سوپایەکی زۆری بۆ کۆ بۆوە، کە لەو شەڕە گەورەیەدا ئێسك و پروسکی خاچ پەرستەکانی شکاندو ڕێگاش خۆش بوو بۆ ڕزگار کردنی قودس، لەم شەڕە زۆربەی هەرە زۆری فەرنجیەکان کوژران ،جائەوەی کوژراوەکانی بدیبایە

---

[1] ١ ـ البداية والنهاية ب ١٢\٢٨٨

دەیوت نابی هیچیان لێ بەدیل گیرابێت ئەوەی سەیری دیلەکانیشی بکردایە دەیوت نابێ هیچیان لێ کوژرابێ، جا لەو کات فەرەنجیەکان دەستیان گرت بەسەر کەناری شامداو موسوڵمانان هیچ ڕۆژێکیان وەکو رۆژی حطین نەبوە بۆ ئەوەی تینوەتیان بشکێنێو کەیف خۆشیان بکات ،یەکێك لەو دیلانە ناوی ئەرناط بوو خاوەنی کەرك بوو،کە ئازاری حاجیەکانی دەداو جنێویشی بە**پێغەمبەر** دابوو، ئەو هەواڵەش گەیشتبوە صلاح الدین جا لەبەر غیرەتی بۆ ئاینەکەی و خۆشەویستی بۆ **پێغەمبەرەکەی** نەزری کرد بەخۆی بیکوژێ، جا صلاح الدین نەزرەکەی خۆی بەجێ گەیاندو کوشتی و لەکۆڵ موسوڵمانانی کردەوە.

شەری حطین لەسالی ٥٨٣ کۆچی بوو نەصارا خاچ پەرستەکان تووشی ترس و بیمو دڵە راوکێیەکی زۆر بوون. سوپای صلاح الدین بەر دەوام بوو لەڕزگار کردنی وڵاتانی موسوڵمانان و خاچ پەرستە داخ لەدڵەکانیش ڕیسواو زەلیل بوونو دیلە موسوڵمانەکانیش قوتاریان بوو لە دیلی، کە ماوەیەکی زۆر بوو دەست بەسەر بوون، سوڵتان صلاح الدین ئەوانەی لەسەر کردەی فەرەنجیەکان نەکوژرابوون لەگەڵ ئەوخاچانەی ،کە لەجەنگەکانیان لەگەڵ خۆیان دەهێناو واش مەزندەیان دەکرد ،کە عیسی علیەالسلام لەسەری لەخاچ دراوە،جا بە هاوڕێیەتی لەگەڵ قازی ابن ابی عصرون ناردنی بۆ دیمەشق بۆ ئەوەی ماڵ ئاوایی لە قەڵاکەیان بکەن، جا لەورۆژە خاچەکان زەلیل بوونو سەریان شۆرکرا.

سوڵتان بەردەوام بەرەو قەڵاو شاری نەصرانیەکان دەرۆیی و ڕزگاری دەکردن لەوانە قەڵای طەبەریەو دیلە موسوڵمانەکانیشی ڕزگار کرد ،کە ژمارەیان چوار هەزار موسوڵمان بوو، پاشان صەیداو بەیروتو عەسقەلانو نابلسو بیبسانو ارض الغوری رزگار کردو هەمووی هێنایە ژێر موڵکی خۆی.

سوڵتان فەرمانی دا بەسوپاکەی پشویەك بدەن لەم شوێنانەو پاشان خۆیان ئامادە بکەن بۆ فەتح کردنی قودس ئەم هەواڵە کەوتە ناو زانایایەکان و خەڵکی ،کە سوڵتان ئەم کارە دەکات بۆیە زاناو پیاو چاکان وەك سەربازێك لەهەموو شوێنێك هاتن بۆ خزمت کردنیو سەرخستنی.[1]

---

١ - الروضتین ب٢لا١٧٨

جا مژدەی ڕزگار کردن دەستی پێکرد بەرۆیشنی صلاح الدين بەرەو بيت المقدس کە٩٢ ساڵ لەژێر دەستی خاچ پەرستە داخ لەدڵەکان بوو، سەربازەکانی ناصر صلاح الدين دەستيان کرد بە ئابلۆقەدانێکی سەختی قودس و بەردەواميش بوون لەئابلۆقە دانەکەيان .

هەندێك لەکيتابە مێژووييەکان باسيان کردوە ،کە کاتێك صلاح الدين بەرەو بيت المقدس رۆيشت نامەيەکی لەيەکێ لەبەندکراوەکانی قودس پێگەيشت کەوا لەسە زوبانی مسجد الاقصی دەدوا:

ياايهاالملك الذي لمعلم الصلبان نكس

جائت اليك ظلامة تسعى من البيت المقدس

كل المساجد طهرت وانا على شرفي منجس

پاش توند کردنی ئابلۆقە لەسەريان نەصرانيەکان داوای ئەمان و سەلامەتيان کردو پادشای بيت المقدس يش بە هاوڕێيەتی لەگەڵ سوڵتان هات بە شێوەيەك ،کە زۆر زەليلو سەر شۆر بوو ئەنجا صلاح الدين ئەمانی دانێو موسوڵمانان چوونە ناو قودس و وەفاداريش بوون بەو سولحەی ڕێککەوتبوون لەسەری ،موسوڵمانان دەستيان کرد بە پاك کردنەوەی مسجد الاقصی لەو خاچ و روهبان و بەرازانەی تێی دابوو هەڵسان وەکو جارانيان لێکردەوەو بەردەکەشيان بەئاوی پاك و خاوێن شوشتو بەئاوی گوڵ و ميسکی گران بەها بۆن خوشيان کرد هەتا وای لێهات زۆر جوان و پرشنگدار بوو، پێشتر نەصرانيەکان شاردبويانەوە لەبەر چاوان بەڵام موسوڵمانان هێنايانەوە بەرچاوانو ئەو خاچەی لەسەريشی چەقيبوو هێنايانە خوارەوەو گومبەتەکە حورمەت و ڕێزی جارانی هاتەوە ، صلاح الدين ڕێزێکی زۆری لەکچە پادشاکانو ئەو ئافرەتانەی لەگەڵيان بوون گرتو لەزۆربەی هەرە زۆريان خۆش بوو تکاش کرا بۆ خەلکێکی زۆر ئەويش لە هەموويان خۆش بوو ئەو زێرەی لێشيان سەندرا بوو هيچی نەبرد بەڵکو هەمووی لەناو سەربازان پەرت و بڵاوکردەوە چونکە زۆر سەخيو دەست بڵاو بوو ، کاتێك بيت المقدس پاك کرايەوە لەخاچ و زەنگول و روهبان و قسيسەکان و ئەهلی باوەڕی چووە ناو دەست کرا بەبانگدان و قورئان خوێنراو خوای پەروەردگار بەتاك ڕاگيراو يەکەمين وتاری هەينيش ،کە سازکرا لەچواری مانگی شەعبان بوو پاش فەتح کردنی قودس بەهەشت رۆژ ، جا مافوريان ڕاخست و چرايان

هەڵواسیو قورئانیش خوێنراو حەقیش هات و نارەواش بودەڵ بویەوەو بەرماڵەکان زۆر بوونو نوێژ دابەستراو بانگدەرەکان بانگیانداو قەشەکانیش کەڕ بوونو ناخۆشی نەماو گەشبینی هاتو بێبەختیو ڕەش بینی پشتی لەپاش کردو ئەو خوایە تاك و تەنهایەش پەرستراکەفەرمویەتی ﴿ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ۝٤ ﴾ الإخلاص: ٣ - ٤ هەروا راکیع و ساجید و ڕاوەستاو دانیشتو خوایان بەگەورە ڕاگرتو وتیان الله اکبر و مزگەوتەکان پڕ بوون و لەبەر دڵە ناسکەکانیش چاوەکان فرمێسکیان ڕشت کاتێك پێش نوێژی نیوەرۆ بانگ دەرەکان بانگیاندا بۆ نوێژ دڵەکان خەریك بوو لەخۆشیان بفرنو هێشتا هیچ وتار خوێنیکیش دەست نیشان نەکرا بوو، بەڵام صلاح الدین قازی محی الدین بن زکی هەڵبژراد بۆ ئەوەی وتار بخوێنێتەوە، جا جلێکی ڕەشی لەبەر کردو وتارێکی سوننی بەهێزو بەپێزی داو لەو میانەدا باسی شەرەفی بیت المقدس ی کرد، ابو شامه لەکیتابی الروضتین وتارەکەی بەدرێژی باس کردوە کە لەسەرەتای وتارەکەی ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٤٥ ﴾ الأنعام: ٤٥ پاشان زۆر لەو ئایەتانەی قورئان خوێندەوە، کەحەمدو سوپاسی خوای گەورەی تێدایەو پاشان وتی: سوپاس بۆ خوا، کەئیسلامی سەرخستو ڕێزی لێ گرتو بەزەبرو هێزی خۆی شیرکی لابردو بەفەرمانی خۆی کارەکانی ڕەخساندو سوڕاندو بەشوکری خۆی نیعمەتەکانی زیاد کردو بەفێڵەکەشی کافرەکانی فریودا ،ئەو خوایەی کەلە دادگەری خۆی سوننەتی ڕۆژان گۆرکێی داناوەو دینەکەشی دیار خستوەو زاڵ کردوە بەسەر هەموو دینەکان ،ئەو خوایەی کەزاڵەو توانایە بەسەر هەموو بەندەکانیو کەس نیە بێتە بەربەست لەبەر دەمیو، ئەو خوایەی ،کە لەسەر دروست کراوەکانی دیارە بێ ئەوەی کەس بتوانێ بەربەرەکانێی بکات ، ئەو خوایە بەویستی خۆی ئەمران دەکات بێ ئەوەی ڕەت بکرێتەوەو سوپاسی ئەو خوایە زاڵو سەرخەرە دەکەم ،کە خۆشەویستانی عەزیز دەکاو سەریان دیخێو سوپاسی دەکەم لەناوەو درەوەو بەپەنهانی و بەئاشکرا ، هەروا لەدرێژەی وتارەکەیدا وتی: واشهد ان لا اله الا الله وحده لاشريك له الاحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفوا احد ، شهادة من طهر قلبه بالتوحيد، وارضي به ربه واشهد ان

محمدا عبده ورسوله رافع الشكر وداحض الشرك ورافض لافك ،الذي اسرى به من المسجد الحرام الى المسجد الاقصى وعرج به منه الى السموا ت العلى الى سدرة المنتهى. هەروەها وتی سەلامیش لە خەلیفەی ڕاست گۆ بێت کە لە باوەڕەوە لەپێش هەموو ئومەتەو سڵاویش لەعومەر بێت کە یەکەمین کەسە دروشمی خاچی لەسەر ئەو ناوچەیە هەڵگرتو سڵاویش لەئەمیری باوەر داران بێت عثماني کوری عفان کە کۆکەرەوەی قورئانەوەو سڵاویش لە علی کوری ابی تالیب بێت کەشیرکی هەژاندو شکێنەری بتەکانە هەروا سڵاویش لەهەمو هاوەڵ و شوێن کەوتەکانی بێت بەچاکە[1]

پاشان لەسەر وتارە پڕ بەجۆشو خرۆشەکەی ، کەپڕی بوو لەسۆزو هەستی دەروونی بەردەوام بوو هەتا وتی : خۆش بەختی بۆتان لە سوپایەك ،کە خاوەنی موعجیزاتی پێغەمبەرانەو زەبر وەشێنی بەدریانەو خاوەن عەزیمەتی ابوبکر و فتوحاتی عومەری و سوپای عوسمانی و لەناو بەرانەی عەلیە، ئێوە بەڕاستی رۆژانی قادسیە و یەرموكو خەیبەرو هێرشەکانی خالدی کوڕی وەلیدتان بۆ ئیسلام نوێ کردوە خودا بە باشترین جۆر پاداشتان لەباتی پێغەمبەرەکەتان بداتەوە ، سوپاس بۆ ئێوە لەوەی کرتان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن، ئەوخوێنەی ،کە ڕشتان خوای گەورە لێتان وەربگرێو بە بەهەشت پاداشتان بداتەوە، جا ڕەحەمەتی خواتان لێبێت ، زۆر قەدرو ڕێزی ئەو نیعمتە بگرنو هەڵسن بەشوکرانە بژێری ئەو نیعمەتانە بۆ خوای گەورە چونکە هەر خۆی ئەو نیعمەتەی پێ بەخشینەو هەڵیشی بژاردونە بۆ ئەم خزمەتە گەورەیە،[2]..هەتا دواین وشە،کە بەردەوام بوو لەوتارەکەی.

پاش ئەوەی ئەو فەتحە گەورەیە کرا شاعیرو زانایان و نوسەران و مێژوونووسان بەوەفد هاتن بۆلای سوڵتانو لەبەردەمیدا پەخشانی شیعری بەپێزیان دەوت ، هەتا وای لێهات کیتابە پانو پۆڕەکان پڕبوون، لەوانە ئەو پارچە هۆنراوەیە بوو ،کە شاعیر ابوالحسن بن علی الجوینی وتی:

---

١ـ البداية والنهاية ب ١٢لا ٣٤٦

٢ـ صلاح الدين بطل الحطين لا٧٨

جندالسماء لهذا الملك اعوان　　من شك فيهم فهذا الفتح برهان

هذه الفتوح فتوح الانبياء وما　　لها سوى الشكر بالافعال اثمان

اضحت ملوك الفرنج الصيد في　　صيدا وما ضعفوا يوما وما هانوا

تسعون عاما بلادالله تصرخ　　والاسلام انصاره صم وعميان

فالان لبى صلاح الدين دعوتهم　　بامر من هو للمعوان معوان

واذا طوى الله ديوان العباد فما　　يطوي لاجر صلاح الدين ديوان

محمد بن سعيد نقيب الاشرف بالديار المصرية، وتويەتی:

اترى مناما ما بعيني ابصر　　القدس تفتح والفرنجة تكسر

ومليكهم في القيد مصفود ولم　　ير قبل ذالك لهم مليك يؤسر

فتح الشام وطهر القدس الذي　　هوفي القيامة للأنام المحشر

يايوسف الصديق انت لفتحها　　فاروقها عمر الأمام الاطهر

ولأنت عثمان الشريعة بعده　　ولأنت في نصر النبوة حيدر

بەندی ئەو سوڵحەی صلاح الدین لەسەری ڕیککەوتبوو لەگەڵ نەصارانیەکان ئەوەبوو کە: ماوەی چل ڕۆژ مۆڵەتیان پیێ بدرێ بۆ چوونە دەرەوەو هەر پیاوێکیش دە دینار بداتو ئافرەتیش پێنج دینارو مناڵیش دوو دینار ، ئەوەی پێشی نەکرا بەدیل هەژمار دەکرێ[1] ، بەڵام دوایی صلاح الدین ئەو بەندەی لەسەری ڕێککەوتبوون جێ بەجێی نەکردو لەگەڵ خاچ پەرستەکان مامەلەی باشی ئەنجامدا بۆ ئەوەی نمونەیەکی بەرزو گەورەو کەم وێنە نیشانی پادشا ستەم کارو خاچ پەرستە داخ لەدڵەکان بداتو هەتا ببێتە پێشەنگ لەم کارە بۆ ئەوەی ڕۆحی لێبوردەییو دادگەری دیار بخات کاتێك ،کە لەوپەری هێزو توانایە.

ئەو نەصرانیانەی پەککەوتە بوونو ئەمیرەکانیان بەجییان هێشتبوونو کەس نەبوو یارمەتیان بدات صلاح الدین کەرەستەکانی چوونە دەری بۆ فەراهەم کردن بۆ ئەوەی کێوە دەچن بابچن.

---

١ ـ صلاح الدین بطل الحطین لا ٧٩

دەگێرنەوە، کەخێزانی یەکێك لەپادشاکان ببوە راهیبە جا ئیزنی خواست بۆ ئەوەی بچێتە لای مێردەکەی و لەگەڵیدابێت جا مۆڵەتیان پێدا بۆ ئەوەی بچێتە لای مێردە بەندکراوەکەی ،کە لەقەڵای نابلس بوو کۆمەڵێك ئافرتیش هانایان بردە بەر سوڵتان بۆ ئەوەی مێردو منداڵەکانیان بەربدات جا بەزەیی پێداً هاتنەوەو هەڵسا بەبەر دانیان ، بۆ یەککەوتەو هەژارانیش بێ سەرانە لێیان خۆش بوو دەرگای بۆ واڵا کرن. زۆر لەنوسەرانی رۆژ ئاوا وەك ستیڤن سن واستانلی لیس بول باسی چاکەو بەزەیی صلاح الدین یان کردوە دەرهەق بەنەصارا.

هەروا سوڵتان مۆڵەتیدا پیاوانی دین ماڵ و سامانیان هەمووی لەگەڵ خۆیان ببەن بێ ئەوەی کەس رێیان پێبگرێ جا ئەوەی پێیان چوو بردیانو ئەوەی نەیان توانی بیبەن موسوڵمانان لێیان کڕینەوە.

یەکێك لە بەطارقەکان کاتێك ویستی بڕوات ماڵو سامان و زەخیرەیەکی زۆری لەگەڵ خۆی هێنابوو بۆ ئەوەی بیکاتە فیدا بۆ هەژارو نەدارەکان ،جا بەسوڵتانیان وت: بۆ چی ماڵ و سامانەکەی لێ ناسەنی بۆ ئەوەی لەکارو باری موسوڵمانان سەرف بکەی ؟سوڵتان پێیانی وت جگە لەو دەینارەی لەسەرم داناون چیدیکەی لێناسەنمو غەدری لێناکەم.[1]

بەڵام سەبارەت بە هەڵسوکەوتی نەصرانیە داخ لەدڵەکان لەگەڵ موسوڵمانان کاتێك لەساڵی٤٩٢ ی کۆچی قودسیان لەژێر چنگی ئێمە دەرهێنا ئەوا هەروەکو مێژوو نووسی ئینگلیزی(مل) باسی کردوە وتویەتی: موسوڵمانان لەماڵەکانیان و لەسەر شەقامەکان دەکوژرانو هیچ شوێنێك نەبوو خۆیانی تێدا حەشار بدەنو هەندێکیان لەترسی کوژرانو سەربرین خۆیان لەسەر دیوارە بەرزەکان فرێداو هەندێکیش چوونە ناو کۆشك و تاوەرە بەرزەکانو مزگەوت بەڵام ئەوان بۆ هەرشوێنێك چووبانە مەسیحیەکان هەر شوێنیان دەکەوتن پاشان وتویەتی: مەسیحیەکان بەسوارو پیادە لەدوای هەڵاتوەکان دەچوون جا لەوحەشاماتە تەنها دەنگی مردن و ئاخو نرکەی دەبیسترا، ئەوانیش بەسەر لاشەکانیان دا دەرۆیشتنو لەدوای ئەوانە دەگڕان ، کە لەکون و کەلەبەرو کەلێنەکان خۆیان حەشار دابوو.

---

١ ـ صلاح الدين بطل الحطين ل٨٣

صـلاح الـديني خوانـاس و موسـوڵمان بۆ مرۆڤايـەتي چـەند وانەيـەكي جـوان و قەشـەنگ نيشان دەدات كە تۆمار كرا لـە لاپـەرەكاني مێـژووی مرۆڤايـەتي بـۆ ئـەوەی گـەورەيي ئـەو ئايينە بەديار بێخێ، كە نمونەی وەكو: نورالدين محمود و صلاح الـدين ئـەيوبي و هێناوەتـە بوون‌و پەروەردەی كردوونەن رەزای خوايان لێبێ، شاعير وتويەتي:

ملكنافكان العدل منا سجية    فلما ملكتم سال الدم ابطح

وحللتم قتل الاساری وطالما   غدونا علی الاساری نمن ونصفح

فحسبكم هذاالتفاوت بيننا    وكل اناء بالذي فيه ينضح

من لە مياني لێكۆلينـەوەم بـۆ كەسـايەتيە ئيسـلاميەكان گەيشـتومەتە ئـەوەی ،كـە هـەر سەركردەيەكي خواناس سەر كەوتني لەگۆرەپاندا بەدەست هێابێ‌و كوفرو دروشمي كـوفری لابردبێ ئەوا لەپشتيەوە زاناو شەرع زان هەبوينە ئاراستەيان كردوەو ئامۆژگاريان كردوە بۆ ڕای باش‌و ڕاست ئەمەش ئەوە بوو ،كە بۆ صلاح الـدين هاتـە دی بـەوەی زۆر ڕێـزی لـەزاناو شەرع زانەكان دەگرت و گرينگي پێدەدان، بەڵام لەناو ئەوانە زاناو شـەرع زانێـك هـەبوە كـە كاريگەريەكي باشي هەبوە لەژياني بۆيە هەر دەبێ بيناسين و باسـي لێـوە بكـەين، ئـەويش زانای پايە بەرز **القاضي الفاضله**.

ذهبي باسي ژياني كردوەو  وتويەتي: المولی الامام العلامة البليـغ، القاضـي الفاضـل، محـي الدين يمين المملكة ،سيد الفصحاء، ابو علي عبدالرحيم بن علی بن حسن بن احمد بن المفرج اللخمـي، الشـامي، العسـقلاني ،المولـد ،المصـري ،الـدار ،الكاتـب صـاحب الـديوان الانشـاء الصلاحي  لەساڵی (٥٢٩) ی كۆچـی لـەدايك بـووە [١] عمـاد الاصـبهاني لەباريـەوە وتويـەتي : بەخۆشي و شادومانيەوە ژياوەو هەر كردەوەيـەك نزيكـي بكردبايـەوە لەبەهەشـت ئـەنجامي دەداو ، هەر ڕێكەوتنێكي ببەستبايە جێ جێي دەكردو ماڵ و سـامانە وەقـف كراوەكانيشـي بـێ هـەژمارن بەتايبـەت ئەوانـەی داينـابوون بـۆ بـەردانی ديلـەكان، يارمـەتي قوتابخانـە ماليكيەكان و شافيعيەكاني دەدا و كيتابي دەدا بەهـەتيوەكان‌و قازيـەكي يـەكجار زيـرەك و لێهاتو بـوو لەقەزاوەتكـەی زوو دەگەيشـتە ڕاسـتەقينە و سـوڵتانيش گوێرايـەڵی بـوو بـەڵكو

---

١ ، سير لاعلام النبلاء ٣٣٨،٣٣٩/٧

بەهۆی راو ڕاوێژە ڕاستەکانی هەرێمەکان فەتح کران و منیش لەیەکێك لەچاکەکانی هەژمار دەکرێم، لەو رۆژگار کەتیبەکتانی کەتیبەی سەرکەوتن بوون و کاری باشیشی دەرهەق بەخەڵك دەکردو وەك سافی بەرەبەیانیش بێژەکانی ڕوون بوونو ڕەوان بێژەکی بلیمەت بوو ،پاشان لەکۆتاییدا دەلێ: لەپاش ئەو کێ هەیە وەك ئەو کارەکانی ئەوها بە پوختەیی جێ بەجێ بکات[1].

شاعیرەکانیش مەدحی بیرکردنەوە ڕاستەکەی و ڕا حەکیمانەکەیان کردوە ،کە چۆن ئەو گیرو گرفتە ئالۆزانەی ڕوو بەڕووی دەوڵەتی صلاح الدین دەبۆوە چارەسەری دکردو پاشان زۆر رۆژی گرو نوێژکەرو بوەو عیلم و ئەهلی عیلمیشی زۆر خۆش دەویست و هەروا پیاوێکی سادەو سەخی و سەخاوەت بووەو زانایەکی مجاهید بووە....

هبة الله بن سناءالملك لەبارەیەوە وتویەتی:

واتت سعادته الى ابوابه لاكالذي يسعى الى ابوابها

فلتفتخر الدنيا بسائس ملكها منه ودارس علمها وكتابها

صوامها قوامها علامها عمالها بذلها وهابها

سوڵتان بەتەواوی مەیلی خۆی دابوێو زۆر لەلای دەمایەوە.

قازی زۆر عیشقی کیتاب و نووسین بوو ناوبانگی بە پیاوێکی دیندارو پاك و خواپەرست دەرکردبوو، بەردەوام بوو لەسەر شەو نوێژکردنو قورئان خوێندن و زیکر ،کاتێك میسر کەوتە ژێر دەسەڵاتی اسدالدین ئەوا قازی هێنایە لای خۆی و زۆریش پێی سەرسام بوو، پاشان صلاح الدین کردیە ڕاوێژکاری تایبەتی خۆی و هەر لەخزمەتیدا بوو، قازی زۆر دونیا نەویست بوو چاکەی زۆر بوو زۆریش خەریکی تەفسیرو ئەدەب بوو ،زۆریش گرینگی بەخواردن و خواردنەوەو جلو بەرگ نەدەداو جلی سپیشی لەبەر دەکردو زۆرریش ئامادەی بەخاك سپاردنی مردوەکان دەبوو، بەئاشکراو بەنهێنی خەریکی چاکەو کاری چاکە بوو، پیاوێکی لاوازو دەم ناسك بوو[2].

---

١ ـ سير لاعلام النبلاء ب٢١ ل٣٤١

٢ ـ سيراعلام نبلاء ب٢١ ل٣٤٣

سوڵتان صلاح الدين لەبارەیەوە وتویەتی: وا مەزانن من بەشمشێرەکانتان وڵاتم کەوتۆتە دەسەت بەڵکو بەراو بیرکردنەوە حەکیمانەکەی قازی بووە[1].

عماد الاصبهانی لەهۆنراوەی مەدحی کردوە وتویەتی:

عاينت طود سكينة ورايــت الشمس فضيلة ووردت بحرفواضل

ورايت سحبان البلاغة سابحا ببيـانه ذيــل الفـــخار والنائـــل

حلف الحصافة والفصاحــــة والسماحة والحماسة والتقى والنائل

بحر من الفضل الغزير خضمة طامي العباب ومــــا له من ساحــل

في كـــفه قلـم يعجـل جريــه ماكــــان من اجــل ورزق عاجــل

ابصرت قسما في الفصاحة فعرفت اني في فهة باقل[2].

خاوەنی النجوم الزاهرة وتویەتی: فەزل و چاکەو ڕەوان بێژی قـازی زۆر لـەوە بـەناو بـانگ ترە باس بکرێ ئەمەش یەکێکە لەشیعرەکانی ،کەوتویەتی:

واذا السعادة لاحظتك عيونها نم فالمخاوف كلهن امان

بها العنقاء فهي حبائل واقتد بها الجوزاء فهي عنان[3].

بەراستی قاضي الفاضل جێگای متمانەی صلاح الـدين بـوو لەهـەموو کاروبارێکـدا راوێـژی پێدەکردو بەگوێی دەکردو[4] نهێنیەکانیشی هەر لەلای ئەو دادەنا.

جارێکیان قاضي الفاضل نامەیـەکی بـۆ صـلاح الـدين نووسـی لـەکاتێك ئابلۆقـەی شـاری عەکای دابوو لەنامەکەدا ترساندبووی لەوەی ،کەسەربازەکان گونـاه بکـەن و سـتم لەیـەکێك بکـەن و بـەم هۆیـەوە خـودا سـەر کـەوتنی خـۆی نـەنێرێ و تووشـی دۆران بـبن، ابـن كـثير لەوبارەیـەوە وتویـەتی: قاضـي الفاضـل لەمیسـر کاروبـاری مەمالیکـەکانی بـەڕێوەدەبردو ئەوەی سوڵتان پێویستی پێ بوو لەماڵ و سامان بۆی ئامادە دەکردو، نامە نوسینیشن هـەر ئەو بۆ سوڵتانی دەنووسی ، لەو نامانە نامەیەك بـوو ،کـە لـە ناوەرۆکەکەیدا هـاتبوو، هـۆی

---

١ ـ النجوم الزاهرة ب ٦ ل١٥٧

٢ـ النجوم الزاهرة ب ٦ ل٧٣ـ٧٤

٣ـ مصدر السابق ب ل١٥٧

٤ـ الروضتين ب٢ل٢٤١

درێژ خایەنی ئەو ئابلۆقەیە زۆری گوناهەکانە ،کەخەڵکی لەنێوان خۆیان ئەنجامی دەدەن، چونکە ئەوەی لەلای خوا هەیە نایاتەدی تەنها بەگوێ ڕایەڵی کردنی نەبێت. تاوانو گوناه لە هەموو شوێنەکان ئەنجام دەدرێو بۆلای خواش بەرز کراوەتوەو پێویست بەوە دەکا لێی پەشیمان بینەوەو داوای لێخۆش بوونی لێ بکەین، هەروا لە نامەیەکی تریش وتبوی: ئێمە ئەگەر ڕاست گۆ باینە لەگەڵ خوا ئەوا زوو ئەنجامی ڕاست گۆییەکەمان دەدی، ئەگەر گوێرایەڵیمان بکردبایە بە دوژمنمان سزای نەدەداین، ئەگەر ئەوەی پێمان بکرابایە لەفرمانەکانی جێ بەجێمان بکردایەو ئەوەی پیشێمان نەدەکرا بیکەین ئەوا بۆمانی تەواو دەکرد، جا باکەس لۆمەی کەسی تر نەکات بەڵکو بالۆمەی خۆی و کردەوەکەی بکاتو ، کەسیش با بەزۆرو بۆری سەربازەکان فریو نەخوات چونکە سەرکەوتنی خوا بەو شتانە نیە بەڵکو سەرکەوتن ئەوەیە لەلایەن خواوە بێ، دڵنیاش نینە لەو سەرکەوتنە ئایا دێتە دی یان نا ،جا پێویستە بگەرێینەوە لای خواو پەشیمان بینەوە لەگوناهەکانمانو لەرێگاش کەم و کوریەك هەیە بۆیە سەرکەوتنی خوا دواکەوتوە، جا هەر لەدرێژەی باسەکەدا ابن کثیر وتویەتی : شێخ شهاب الدين خاوەنی کیتابی الروضتین زۆر باسی لەو نامانە کردوە، کە قاضي الفاضل بۆ سوڵتان صلاح الدينی دەنارد، کە نامەکان لەوپەری بەهێزی دابوونو، ئامۆژگاری و هاندانی تێدابوو بۆ جیهاد کردن ،رەحمەتی خوا لەو پیاوە چاکە ،ئای چ وەزیرێکی دڵسۆزو چ ڕایەکی راست و حەکیم و ژیرانەی هەبوو[1] بەڵێ بەو کەڵە پیاوانە خوای گەورە ئاینەکەی خۆی سەر دێخێو تیری خۆشەویستانی والیدەکات ئامانج بپێکێ، بەڕاستی خوای گەورە بەهۆی ئەو زانایە ئەدیب و فەقیە و زاهیدو لەخواترسو وەزیرە باشەوە صلاح الدينی گەورە کردو ڕێزی لێنا.

## وەفات کردنی قاضي الفاضل:

لەساڵی(٥٩٦) کۆچی قاضي الفاضل وەڵامی خوای پەروەدگاری دایەوە لەکاتێك زۆر عەودالی مردن بوو چونکە کەم و کوڕی جیاوازی کەوتە نێوان کار بەدەستەکان ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کەخوا خۆشی ویستوە.

---

١ ـ البداية والنهاية ب١٢، ٣٦١

خاونی کیتابی النجوم الزاهرة باسی کردوه کەوا لەنێوان الملك العادل ابوبکر بن ایوب و قاضي الفاضل گرژیەك پەیابوو بوو جا کاتێك الملك العادل ویستی بێتە میسر قاضي الفاضل دوعای کرد کە خوا بیمرێنێ جا پێش ئەوەی الملك العادل بێتە میسر قاضی الفاضل وەفاتی کردو تەرمەکەشیان بەدەرگای زویلە دا بردە دەرەوە.

## وەفات کردنی سوڵتان صلاح الدین:

کاتێك ژیانی صلاح الدینم دەخوێندەوەو بەردەوام بووم هەتا گەیشتم بەدوایین ساتەکانی ژیانی چاوەکانم پڕ فرمێسك بوون و دڵم ڕاچلەکی بۆ ئەو پاڵەوانە عیملاقە، کە بۆ ئیسلام وەك پەرژینێك وا بوو بۆ فڕوفێلی کافرە داخ لەدڵەکان، وەفات کردنی لەساڵی ٥٨٩کۆچی بوو، کتێبەکانی مێژوو باس لە وەدەکەن، کە کاتێك صلاح الدین وەفاتی کرد ئەهلی دیمەشق تووشی ناخۆشی و مەینەتیەك هاتن، کە لەوەو پێش توشی نەهات بوون، هەر یەکەیان حەزیان دەکرد بەماڵ و منالّ و خۆشەویستانی ببنە فیدای ،صلاح الدین کاتێك لەسەرە مەرگ بوو ئەو ئایەتەیان لەلای خوێندەوە﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾ئەویش وتی: چۆنی خوێندەوە هەروایە کاتێکیش بانگدرا بۆ نوێژی بەیانی قاضي الفاضل هات جا، کە ئەو ئایەتەیان لەسەر خوێندەوە، ﴿ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾ ﴾ التوبة: ١٢٩
پێکەنی و ڕووی پرشنگدار بوو روحەکەی تەسلیمی خوای پەروەردگار کردو وەفاتی کرد، ڕەحمەتی خوای لێبێ و خودا بەهەشتی بکاتە مەنزڵگای، تەمەنیشی (٥٧) ساڵ بوو ، پاشان دەستیان کرد بەشوشتن و کفن کردنیو منالّ و خزم و کەسەکانیشی هاتن، ئەو کەسەی،کە شوشتی ناوی دولعی بوو، کەوتار خوێنو فەقیهی ناوچەکە بوو، قاضي الفاضل یش لەماڵە حەلالەکەی کفن و پێداویستی ناشتنی کڕیو ابن زکی ئیمامەتی بۆ خەڵك کردو نوێژیان لەسەر کرد، پاشان هەر لەماڵەکەی خۆی لەمەنصورە لە دیمەشق نێژرا، دەڵێن ئەو شمشێرەی لەگەڵ خۆی دەهێنا بۆ جیهاد کردن لەگەڵیان ناشت، ئەمەش بەفەرمانی قاضي الفاضل چونکە وتی گەش بینن بەوەی کە انشاء الله لەرۆژی قیامەت پاڵ دەداتە سەر

شمشێرەکەی هەتا دەچێتە بەهەشت[1] ئەو کەسەی، کەناشتی و شۆڕ بۆەوە ناو قەبرەکەی کوڕە گەورەکەی بوو، کەئەو کات سوڵتانی شام بوو، بەڕاستی هەواڵی مردنی صلاح الدین لەسەر موسوڵمانان وەك هەورە تریشقەیەك بوو چورتمێکی گران بوو خەمێکی وابوو،کە خەڵکی بەرگەیان لەئاستی نەدەگرت ،قازی ابن شداد باسی ئەو دیمەنە ترسناکەمان بۆ دەکات ،کە وتویەتی: ڕۆژی مردنی ڕۆژێکی ئەوەندە ناخۆش بوو، کەئیسلامو موسوڵمانان بەخۆیانەوە نەبینیبوو ،مەگەر بۆ خلیفە ڕاشیدینەکان نەبێ، دونیاو قەلعەو تەختی مولك تووشی تەنیایەك هاتن ،کە هەر خوا دەیزانی ، سوێند بەخوا گوێم لەخەڵکی دەبوو دەیان وت: ئەگەر بکرێ فیدای دەبین بەماڵ و گیان بەڵکو لەمەش زیاتر لەخۆمەوە دەم وت: ئەمە جۆرێکە لەسنور بەزاندن ئەگەر وانەباو فیدا بوون ڕەوا بوایە ئەوا خۆم و خەڵکیش بەفیدای دەبوین.

---

١ ـ ئەگەر ئەو هەواڵە ڕاست بێ قاضي الفاضل فەرمانی دەکردبێ بەوەی شمشێرەکەی صلاح الدین لەگەڵیدا بنێژرێ ئەوە ڕایەکی هەڵەیەو کارێکی بیدعەیە ،چونکە خوای گەورە ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾ الاحزاب٢١ جا، کە **پێغەمبەر** پێشەنگی هەموو موسوڵمانانەو هەموو ئەحکامەکانی جەنازەو مردوی بۆ ڕوون کردینەوە ئایا لەهیچ جەنازەیەك فەرمویەتی ئەو شتە لەگەڵ مردوەکە بنێژن، خۆ **پێغەمبەر** سید المجاهدین بووە، لەگەڵ ئەوە کاتێك وەفاتی کرد هاوەڵەکانی شمشێرەکەیان لەگەڵی نەناشت ، چونکە دەیانزانی **پێغەمبەر** فەرمانی بەمە نەکردوە، هەروا کاتێك حمزە بن عبدالمکلب شەهیدکرا ،کە گەورەی شەهیدانیشەو لەکاتی موسوڵمان بوونی ئیسلامی پێی بەعیزەت بوو لەشەری بەدر کەپوی موشریکانی لەخۆڵ چەقاند ،**پێغەمبەر** نەیفەرموو لەبەر ئەوی حەمزە ئاواو ئاوای بۆ ئیسلام کرد با شمشێرەکەی لەگەڵ بنێژین ، زۆربەی زانا سەر ڕاستەکانیش فەرمویانە ئەگەر مردو وەسیەتی کرد شتێکی لەگەڵ بنێژرێ ئەوا دروست نیە وەسیەتەکەی جێ بەجێ بکرێ ، چونکە کارێکە پێچەوانەی سوننەتی **پێغەمبەرە** ، ئەم ڕوون کردنەوەیەشم بۆ ئەوەیە ،کەموسوڵمانان بزانن سوننەت چیەو بیدعە چیە، هەروا کاتێك ژیانی موسوڵمانێك یان زانایەك یان سەرکردەیەك یان موجاهیدێك ئەخوێننەوە نابێ لەبەر فەزل و گەورەیی ئەو کردەوە باشانەی کردویەتی هەندێك شت لەبیر بکرێت یان چاوپۆشی لێ بکرێت ، کە ئەو زانا سەرکردە خواناسەیە کردویەتی لە هەمان کاتیشدا بیدعە بووە یان ناشەرعی بووە، چونکە کەس لە هەڵە بەدەرنیە ،ئێمە دەڵێین ئەو شتە بیدعانە یان ناشەرعیانە، کە لەو زاناو سەرکردانە ڕوویانداوە ئەوە یان نەیان زانیوە یان زانایەکی مجتهد فەتوای بۆ داون بەڵام لەئجتیهادەکەی هەڵەی کردوەو ڕاستی نەپێکاوە ، بەڵام کاتێك ئێمەی موسوڵمانان دەیخوێنینەوەو ئاگاداری دەبین ئەوا هەردەبێ ڕوونی بکەینەوە بۆ ئەوی سوننەت و بیدعە تێکەڵ بەیەکتر نەبن و خەڵکی نەکەونە ناو هەڵە. والله اعلم.وەرگێر

بەڕاستی صلاح الدین سەرکردەیەکی خواناس بوو لەسەردەمی نورالدین لەبارو دۆخێکی پڕ عیلم پەروەردەبوو، ئەو کەش‌و هەوایە پڕ عیلمە بارودۆخێکی نمونەیەی بەرزی بۆ دروست کردن، کە خودا گەورەیی و ڕێزو هێزی ئوممەتی پێ گەڕاندەوە.

## دیاردە سەرەکیەکان لەکەسایەتی صلاح الدین دا:

**یەکەم** : نزیك کردنەوەی زانایان لەخۆی و خۆش ویسنتیان و ڕێز لێ گرتنیان‌و راوێژ پێ کردنیان‌و دانانیان لەجێگای شایەن بەخۆیان‌و ئاوەدان کردنەوەی قوتابخانەکان و ئامادەبوون لەکۆڕی عالیمەکان، بەڵکو سوڵتان صلاح الدین بەخۆی و بەهەر دوو کوڕەکەی علي و عثمان ئامادەی کۆری الحافض السلفي دەبوون زانای پایە بەرز کمال الدین الشهرزوری بۆ پلەی وەزیر بەرز بویەوە، هەروەها ڕاوێژکاری صلاح الدین ابن نجا الحنبلی‌و وەزیرەکەی القاضي الفاضل و نجم الدین الخبوشانی‌و ئەوانە لەگەورە زانایان و نووسەران بوون ،کەزۆر شەیداو عەودالی عیلم بوون. زانای پایە بەرز الفقیه الشافعی صلاح الدین ی هاندا بۆ لەناو بردنی دەوڵەتی عوبەیدی و لێش نەگەرا چیتر وتاری هەینی بدەن ، صلاح الدین قوتابخانەیەکی بۆ دروست کردو کردیە مامۆستاو بەڕێوەبەری، یەکێکی تر، کە ناوی الفقیه الهکاری بوو ، کە سەربازێکی ئازاو سەخی و لەسەر دەستی شێخ ابو القاسم البرزی پێ گەیشتبوو، جا ئەوەی ئەو زانایە دەیتوانی قسە لەگەڵ صلاح الدین بکات کەسی تر جور ئەتی نەیدەتوانی.

ئەگەر زانایەك بهاتبایە لای صلاح الدین ئەوا زۆر گرنگی پێ دەداو لێ نەدەگەرا بڕوا هەتا پارەو کەل و پەلی بۆ خۆی و خزم و کەس و جیرانی نەدابوایێ.

بەڕاستی ئەو سەرکەتن‌و گۆڕانکاریانە بەو پەیوەندیە باشەی نێوان ئەمیرو زاناکان دێتە دی. قازی ابن شداد وتویەتی: صلاح الدین لەهەموو دووشەم و پێنج شەممەیەك لەکۆری عەدل دادەنیشت، کە لەو کۆرە گشتیەدا فەقیهو قازیەکان ئامادەی دەبوون‌و ئەمەی لەسەفەریشدا تەرك نەدەکرد، [1].

[1] ـ ایعید التاریخ نفسة؟ لا ٩٤

مەقدیسیەكانیش ،كە پێك هاتبوون لە ابو عمر محمد بن احمد بن قدامة و برایەكەی و كوڕەخاڵەكەی الحافظ عبدالغني و شێخ عیماد، كە نیشتەجێی حي الصالحية بوون لەدیمەشق ئەوا دانەدەبڕان لەهیچ غەزایەك، كە صلاح الدین بیكردبایەو لەفەتحی قودس و كەنارەكان و هی تریش هەر لەگەڵی دابوون[1].

بەڕاستی ئەو سەركردانەی ڕێز لەزانایان و فەقیهەكان دەگرن ئەوە لەڕاستیدا دەستیان بەسوننەتێك لەسوننتەتەكانی خوا گرتوە، كە سوننەتی تەمكین و نەصرو زاڵ بوونە بەسەر دوژمنان.

ئەو كەسانەی هێرش دێننە سەر زاناو ڕۆشن بیرو سیاسەت مەدارو پەروەردەكەرو فەرمودەناس و حەرەكیەكانی ئوممەت ئەوە لەڕاستیدا خزمەتی پیلانەكانی جولەكەو فەلەو تاغوت و سیخورەكان دەكەن ، جا یەكسانە لەوەی هەستی پێدەكەن یان نا ، ئەوانەی وا بەردوامیش تانەو تەشەر لەكردەوەكانی زانایانی ئومەت دەدەن ئەوە دوور كەوتونەتەوە لەمەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەت كەدەڵێت: وعلماء السلف من السابقين ومن بعدهم من التابعين اهل الخير والبركة والاثر واهل الفقه والنظر لايذكرون الا الجميل ومن ذكرهم بسوء فهو علی غير السبيل . واتە زانایانی سەلەف لەپێشینەكان و هەروا ئەوانەی لەدوایان هاتوون ، كەئەهلی خەیرو فیقه و ڕان، ئەوا دەبێ هەر بەچاكە ناوببرێن ، ئەوەی بەخراپە باسیا بكات، ئەوەلەڕێگای ڕاست لای داوە[2].

بەڕاستی كەسانێكم بینیوە جنێویان دەدا بەزاناو فەقیهو فەرمودەناس و بانگخوازان، بەڵكو هەندێكیان چەند سەركردەیەكی بزوتنەوە ئیسلامیەكانی بەبێ عیلم كافر دەكرد، هەندێكیشیان بەغەیبەت كردنی زانایان و تانەو تەشەر لێیان لەزەت و خۆشی وەردەگرنو، ئەمەش لەسەر مینبەرو ڕۆژنامەكان بڵاودەكاتەوەو، خەریكە لەخۆشیان دەفڕیت، بەڵام ئایا نازانێ ئەو نەفامە ، كە گۆشتی زانایان ژەهراویەو عادەتی خواش دیارو ئاشكرایە لەهەتكردنی ئەو كەسانەی تانەو تەشەریان لێ دەدەن، هەروا ئایا نازانێ ئەو نەفامە ، كە حوكم دان لەسەر خەڵكی دەبێ ڕەچاوی چاكەو ئیشە باشەكانی بكرێت، لەو بارەیەوە زانای

---

[1] ـ البداية والنهاية ب ٣١ لا ٣٩

[2] ـ شرح الطحاوية ب٢لا٧٤٠

پایە بەرز ابن القیم رحمە اللە. دەفەرموێ: ئەوەی عیلمی بەشەرع و واقیع هەبێ ئەوا بە تەواوی ئەزانێ ،کە ئەو پیاوەی لەئیسلام کاروی چاکەو شوێنەواری باشی هەیەو لەئیسلام شوێنی دیارە ئەوە بۆی هەیە هەڵەو پێ خلیسکانی هەبێت، موعزوریشە، بەڵکو لەسەر ئیجتیهادەکەی پاداشتیش وەردەگرێ ، بۆیە نابێ باسی بکرێ‌و پلەو پایەو پێشەوایەتیەکەی لەناو موسوڵمانان کز بکرێ[1].

بەڕاستی ئەو میژووە گەورەیەی ئیسلام گرنگی ڕێزگرتن لەزانایان و بانگخوازانمان بۆ دەردێخێ، کەچۆن بوینە مایەی بەعیززەت کردنی ئەو ئایینە، جا ئەوانەی هەوڵ دەدەن بۆ گەڕانەوەی ڕابردووی ڕەسەنمان و هەوڵ ددەن بۆ گەڕانەوەی عیززەتەکەمان ، پێویستە کار بکەن بۆ ئەوەی زانایان و فەقیهەکان ڕۆڵیان بێتەوە بەوەی ڕێزیان لێ بگرن و خەڵکیش فێرە ڕێز گرتنی زانایان بکەن، ئەو بەکرێ گیراوە نگریسانەی لەناوماندا هەیە ڕێیان لێ بگرن و قەدەغەیان بکەن بۆ ئەوەی بەقسەی ڕازاوەو شێوازە فیلاویەکانیان نەتوانن جنێوو تانەو تەشەر لەزانایانمان بدەن و لاوەکانمان فریو بدەن بۆ ئەوەی نە لەدین نە لەدونیا سەرکەوتوو نەبن.

دووەم: دیاردەیەکی تری ڕوون ، لە کەسایەتی صلاح الدین خۆش ویستنی بوو بۆ جیهاد قاضي ابن شداد وتویەتی: صلاح الدین زۆر موکڕ بوو لەسەر جیهاد کردنو زۆریش گرنگی پێدەدا، ئەگەر یەکێك سوێندی بخوارد بایە، بەوەی صلاح الدین کاتێك دەربچوو بایە بۆ جیهاد کردن ئەوا پارە پولی هەر لەو پێناوەدا سەرف ئەکرد ئەوا سوێند خواردنەکەی ڕاست بوو کەفارەتەکەی نەدەکەوتە سەر، بەڕاستی جیهاد هەموو شتێکی صلاح الدین بوو دڵی داگیر کردبوو بەجۆرێك ، کە هەموو قسەو باس و خواسی هەر جیهاد کردن بوو زۆر گرنگی بەکەرەستەکان و پیاوەکانی دەدا ، لەبەر خۆش ویستنی بۆ جیهاد ماڵ و مناڵ و نیشتیمانی بەجێ هێشتو لەبەر خاتری ئایینی خۆی ڕازی بوو بەوەی لەژێر چادرێك بژیت، کە با بەلای ڕاست و چەپ ئەم لاو ئەو لای پێ دەکرد، هەر پیاوێکیش بیویستبایە بچێتە لای ئەوا کاتێك دەچوە لای هانی دەدا لەسەر جیهاد کردن. ڕۆژێك لەگەڵ سوڵتان چووین بۆ

---

[1] ـ اعلام الموقعین ب٣/٢٨٣

کەنار دەریا بۆ ئەوەی بچینە عەککا زستانێکی زۆر ساردیش بوو دەریاش شەپۆلەکانی زۆر قایم بوو وەك چیاکان بەرز دەبۆوە بۆ ئاسمان، منیش یەکەم جارم بوو دەریا ببینم بۆیە سەیرم دەهات بەو کەسانەی دەچوونە ناوی و سواری کەشتی دەبوون من لەو قسانە دا بووم، سوڵتان ڕووی بۆ لای من وەرگێراو وتی: دەبێ خوای گەورە بۆم ئاسان بکات بۆ ئەوەی کەنارەکان هەموو فەتح بکەم و پاشان سواری کەشتی بم و بچم بۆ فەتح کرنی جەزائیر بۆ ئەوی کەس نەهێلم لەسەر زەوی کوفر بەخوا بکات یان لەو پێناوەیا بمرم ، بەڕاستی ئەو قسانە زۆر کاری تێکردمو شوێنەواریکی قووڵی لەدڵمدا بەجێ هێشت، سەیری ئەو هیممەتە بەرزە بکەو سەیری ئەو دەروونە پاکە بکە، کە چەندە ئازاو بەجەرگە خودایە خۆ تۆ دەزانی ئەو ئەوەندوی پێ کرابێ هەوڵی داوە بۆ سەرکەوتنی ئایینەکەت بۆ ئەوەی لێی خۆش بی، خوایە رەحمی پێ بکەی ، سەربارەت بەئارام گرتنیشی جارێك لە عەککا زۆر نەخۆش بوو بەهۆی بەدیار کەوتنی چەند قونێرێك ،کە لەناوکیدا هەتا ئەژنۆی دایگرتبوو لەبەر ئەوەی ئازارێکی زۆری هەبوو نەیدەتوانی دابنیشێ‌و ئارامیەکی زۆریشی لەسەر دەگرت، جا هەر لەکاتی چێشتەنگاوە دەرۆیشت بەرەو نوێژی نیوەڕۆو دەیوت: کاتێك سواری ئەسپ دەبم و بەرەو نوێژ دەڕۆم هیچ هەست بەئێش و ئازار ناکەم.[1]

بەڕاستی ئەمڕۆ لەو ڕۆژگارەی ئێمە گەرمو گوڕیەکی بەتین هەیە بۆ ناو گۆرەپانەکانی جیهادو تیکۆشان، وەك ئەوەی لە ئەفغانستان ڕوویدا، هەروا لەو تێکۆشان و قوربانیانەی گوێمان لێ دەبێ لە زەوی داگیرکراو ارض المحتلة بەلاّم لە هەندێك وڵاتی موسوڵمانان برایانێکمان هەن، کە سەرپەرشتی بزووتنەوە جیهادیەکان دەکەن‌و شارەزاییەکی کەمیان هەیە بەو سوننەتە خواییانەی ،کە خودا داینـاوە بۆ گۆڕینی گەل و کۆمەڵگاکان، لەوەش گرنگتر لەئاینی خودا زۆر باش تێ نەگەیشتونە بەتایبەت لەسیاسەتی شەرعی و فیقهي جیهادو پەلە نەکردن لەپەروەردەکردنی خەلکی هەتا ئامادە دەبێ بۆ ئەوەی جیهاد بکات، جا ئەوانە دەستیان کرد بەفەتوادان و هەڵێنجانی حوکمەکان لەخوێندنەوی ئەوکتێبانەی خزمەتی مەبەستەکەیانی گەنجەکانیشیان لەسەر پەروەردە دەکردو ، شوێن کەوتەکانیان

---

[1] ـ الروضتين ب٢لا٢٢١ـ٢٢٢

تووشی جەنگێکی دۆڕاو کرد دژی حوکمەتەکانیان لەکێشەیەك، کەکۆتایی پێهات بەوەی هەندێکیان بکوژرێن و هەندێکشیان بکرێنە بەندیخانەو خێزانە بەشەرەفەکانیشیان دەربەدەر بوون‌و بوونە هۆکاریش بۆ لەکار خستنی چەند پرۆژەیەکی دەعەوی و تەربەوی ، جا کارەکەیان لەچەند ڕویەکەوە زیادە ڕۆییو سنوور بەزاندنی تێدایە:

یەکەم: جیهاد کردن لەهەقی ئوممەتە نەوەك لەهەقی چەند تاکێك و کۆمەلێك بێت ، بەلکو ئوممەت بەپێی ئەهلی حەلل‌و عقد[1] لەو فەقیهو زانایانەی هەلیان دەبژێرن بڕیاری

---

[1] ئەمە لەفیقهی ئیسلامی وتەیەکی زۆر نامۆیە ،کە جیهاد کردن بگەڕێتەوە بۆ ئەهلی حەلل‌و عەقد،بەلکو لەهەموو کتێبە فقهیەکانی ئەهلی سوننە بڕیار لەسەر ئەوە دراوە ،کە هەر کاتێك دوژمن هێرشی هێنایە سەر موسولمانان ئەوا جیهاد کردن واجب دەبێت ئەنجا ئەهلی حەلل‌و عەقد هەبوو یان نا ئیمام هەبوو یان نا، بەلکو ئەم وتەیەی دانەر ،کە نازانم لەکوێی هێناوە ئەوا ڕێك وتەی عەمامە بەسەرەکانی شیعەیە ،کە جیهاد بەڕەوا نابینن تەنها لەگەلّ ئیمام نەبێ بەلام ئەوان هەر بە خۆیان موخالەفەی ئەو رایەی خۆیان کرد لەشەڕی عیراق‌و ئێران ،کە جیهادیان کرد بەبێ ئیمام‌و ئەو ڕایە فیقهیەی خۆیان لەبن پێیان نا لەبەر خاتری بەرژەوەندی خۆیان،جا دانەر لەو مەسەلەیە هەلّەیەکی ئاشکرای کردوەو موافەقەی شیعەی کردوە لەگەلّ ئەوەی زۆر دژی شیعەشە، لەلایەکی تریش ئەم رایە زۆر دوورە لە واقیع چونکە ئێمە وەك موسولمان دەبێ غیرەتمان بەرامبەر دینەکەمان و ئابرو ناموسمان هەبێت و دینەکەشمان دینی هێزو جیهادو غیرەتەو قەبول ناکات هەلگرانی دەستە وەستان دابنیشن و بەرگری لە دینەکەو ناموسیان نەکەن جا چ بەلگەیەکمان هەیە بلێت ئەگەر ستەم لە یەکێك کرا ئەوا دەبێ ڕا بوەستێ و دیفاع لە خۆی نەکات و تۆلەی لە بەرامبەرەکەی نەکاتەوە هەتا پرسی ئەهلی حەل و عەقد دەکات ئەگەر هەبوو ئەگەریش نەبوو ئەوا دەبێ رابوەستێ هەتاوەکو دورست دەبێ، چ زانایەك لە ئوممەتی ئیسلام ئەمەی وتوە! ئەمەیە نا واقیعی لە فەتوا دان و بڕیارداندا، عەرەب گوتەنی (من وقع بئرا لخیە وقع فیە) دانەر چونکە لەدوور تەماشای بزووتنەوە جیهادیەکان دەکات و بە دیعایەی ئیعلامی جولەکەو ئەمریکاو هەندێك لە موسولمانە سادەکان ئەوانەی روانینێکی شەرعیانەو واقیعیانەیان نیە بۆ ڕووداوەکان باوەڕ دەکات ، دانەر هەر بە خۆی لە کاتی شۆرشی گەلی لیبی لە دژی تاغوتی ستەم کار معمر القذافي لە چەند چاو پێکەوتنێك کە کەنالی جەزیرە موقابەلەی کردبوو وتی: ئەوەی شۆرش گێرەکان دەیکەن لە دژی معمر القذافي ئەوا جیهادێکی پیرۆزەو ئەوەی بکوژرێش شەهیدە، خۆ ئەو جیهادەی کراش دژی حاکمی لیبیا بەبێ بوونی ئەهلی حەل و عەقد بوو کەواتە بۆ کاتێك لەناو واقیعە نەبوو بریارێکی داو کاتێکش کەوتە ناو واقیعەکە بریارێکی دژی بریارەکەی یەکەمی دا؟ ئەمە لەلایەك بە بۆچوونی من تێنەگەیشتنە لە عیلمی شەرعی و بەتایبەتی فیقهی جیهاد و لەلایەکی تریش دووریە لە واقیعی سەردەم کە چی لەناو ڕوودەداو ئەگەریش لەدووری تەماشای شتێك بکەی ئەوا ڕاستیەکی زۆرت لەکیس دەچێو نادادگەرانە بریاری هەلّەی لەبارەیەوە دەدەی،بەلام ئەو لەبەر فیکرە

لەسەر دەدات، پێش ئەوەش دەبێ ئوممەت لەلایەنی پەروەردەو فیقه شارەزاییەکی هەبێت ئەمەش دەبێ لەژێر سەرپەرشتی زاناو فەقیهەکان بێت ،جا ئەو گەلەی ئێمە لەبارەی دەدوێین ئەگەر زانا فەقیهیان تێدا نەبوون ئەو دەبێ کۆمەڵێك لەنەوەکانی خۆیان تەرخان بکەن بۆ ئەوەی عیلمی شەرعی لەمامۆستا شەرع زانەکان فێربن ئەوانەی ئوممەت شاهێدی بۆ داون ،کە شایەنن بۆ ئەم کارە بۆ ئەوەی بۆ چارەسەری گیرو گرفتە گەورەکان بگەڕێنەو لایانو ئەوانیش دەستیان بگرن بۆتەحکیم کردنی شەریعەتی خوا بە لەسەرە خۆیی بەتایبەتیش لەسەدەی ئەمڕۆ ، کەپڕیەتی لەفیتنەو ئاشوب.

کاروبارە گەورەکان وەك جیهاد کردن دەگرێتەوە بۆ ئەهلی عیلم ئەوانەی خاوەن ڕوانینێکی ڕاستو ڕوونن: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡۗ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾ النساء ٨٣ نەوەك بگەڕێتەوە بۆ ئەوانەی هەموو تەمەنی خۆیان لەئەندازیاری بیناسازی یان پیشەسازی سەرف کردوە، یان سەرفی کردوە لەدیراسەکردنی نەشتەرگەری پزیشکی یان لەعیلمەکانی ترو، پاشان هەندێك کیتابی خوێندوّتەوەو لەبەری کردوەو بەگوێرەی تێگەیشتنە سنور دارەکەشی تێی گەیشتوەو دەستی بەشەرێکیش کردوە بۆ سەر زانا و فەقیه و بزوتنەوە ئیسلامیەکان ئەوانەی خاوەن مەفهومێکی گشت گیرن، کە ئەوانەی دایان مەزراندوەو بەگەڕیان خستوەو سەر پەرشتیان کردوە زانایان و بانگ خوازان بوونە، ئەوانەی ئوممەت شاهێدی عیلم و ئیخلاس و ڕاست گۆیی بۆ داون ،نەوەك بگەڕێنرێتەوە بۆ ئەوانەی موتابەعەی ڕۆژنامەو ئێزگەکانیان کردوەو لەسەر کتێبەکانی حرب العصابات ی ماوتسی تۆنغی صینی و جیفارای ئەمریکای لاتینی بووینە قوتابیو ویستویەتی لاوەکانی ئوممەت

---

ئیخوانیەکەی ،کە زاڵە بەسەریدا تووشی ئەم هەڵەیەی کردوە لەفیقهی ئیسلامی واقیعی سەردەمدا،خودا لەهەموو لایەکمان ببورێ.

پاڵ پێوە بنێ بەرەو ئەو ئامانجەی خۆی داینـاون و هێڵی بۆ کێشـاونو[1] ،یان دوور کەوتنەوە لەسەرکردە گەورەکانمان وەك نورالدین و صلاح الدین ،پێش ئەوانەش گەورەی هەموو **پێغەمبەران** لەگەڵ هاوەڵە پاك و بێگەردەکانی.

زانای پایە بەرز ابن سعدی رحمە الله لەبارەی تەفسیری ئەو ئایەتەی سورەتی نیساء فەرمویەتی: ئەو ئایەتە تەئدیبە لەلایەن خواوە بۆ بەندەکانی لەسەر کارە ناشیاوەکەیان، کەپێویستە لەسەریان ئەگەر کارو بارێك گرنگ بوو بەرژەوندی گشتی تێدابوو پەیوەندی هەبوو بەلایەنی ئەمنی و خۆشی باوەڕداران، یان پەیوەندی بەترسەوە هەبوو ، ئەوا دەبێ لەهەواڵەکە بکۆڵنەوەو پەلە نەکەن لەبڵاوکردنەوەی ، بەڵکو دەبێ بیگەڕێننەوو بۆ لای **پێغەمبەر** یان بۆ لایەنی پەیوەندی دار ئەوانەی ئەهلی عیلمن و خاوەن ڕای ڕاستن و بیرێکی تیژیان هەیەو شارەزان بە فیقهی بەرژەوندیەکان و پێچەوانەکەی ، جا ئەگەر بینیان لە بڵاوکردنەوەی خێری تێدایە ، یان بینیان ئەگەر لە بڵاوی کردنەوەی شەڕی زیاترە لەخێری ئەوا بڵاوی ناکەنەوە ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿لعلمه الذي يستنبطونه منهم﴾ واتە : بەفیکرە ڕاستەکەیانو عیلمە چڕو پڕەکەیان لێی دەکۆڵنەوە پێش ئەوەی بڵاوی بکەونە.

جا لەمەدا بنەمایەکی گرنگ بەدەست دەکەوێ ئەویش ئەگەر هاتوو لەکاروبارێك کۆڵدرایەوە ئەوا پێویستە بدرێتە دەست ئەو کەسانەی شایەنن بۆ ئەم کارەو کەسیش بەپێشیان نەکەوی و نەدرێتە دەست کەسانی تر، چونکە ڕای ئەوان ڕاسترەو دوور ترە لە هەڵە.

هەر ئەو ئایەتە قەدەغەی پەلە کردن دەکات لە بڵاوکردنەوەی ئەو کاروبارانەی مرۆڤ دەم و دەست گوێی لێدەبێ و فەرمانیشی کردوە بەوەی پێش ئەوەی لێی بدوێین بیری لێ

---

[1] ـ دانەر زۆر بێ بەزییانە هێرش دەکاتە سەر بزووتنەوە جیهادیەکانو تۆمەت باریان دەکات بەوەی چەتەنەو لەکوێش فێر بووینە لە ئەمریکای لاتینیو ماتسی تۆنغی صینی ،ئەمە چ میزانێکە بەکاری هێناوە ،ئەم وتەیە هیچ خزمەت بەهیچ جۆرە موسوڵمانیك ناکات ،بەڵکو پەرتەوازەییو دووبەرەکی دەخاتە نێوان موسوڵمانان،کە دانەر بەخۆی لەو کیتابەو کیتابەکانی تری زۆر جەخت دەکاتەوە لەسەر یەك ریزیو یەك هەڵوێستی موسوڵمانان ، بەڵام هەروەکو گوتم لەبەر زاڵبوونی فیکرە ئیخوانیەکەی بەسەریو دەمار گیری بۆی تووشی ئەم ستەمو زوڵمەی کردوە.

بكەینەو تێی رابمینێین بۆ ئەوەی بزانین ئەگەر بەرژەوەندی لەبڵاو کردنـەوەی دابـوو ئـەوە بڵاوی بکەینەوە ئەگەر نا بارا بوەستین و بڵاوی نەکەینەوە.

بەڕاستی مەسەلەی جیهادو سیاسەتی شەرعی هەر دەبێ زانا بلیمەتەکان ئەوانەی خاوەن عـیلم و زانیاریـەکی قـووڵن فـەتوای بـۆ بـدەن، چـونکە ئـەوان زانـاترن بەمەبەسـتەکانی شەریعەتو دەزانن هاوسەنگی لەنێوان مەصالیح و مەفسەدەکان بکەن، ناشـکرێ گەنجێکـ، کە هێشتا لەسەرەتای تەمەنی دایەو کاتەکانی هەر لەقیل و قال بەسەر بردوەو دانەنیشـتوە لـەکۆرێك لـەکۆرەکانی عـیلم بـۆ ئـەوەی گـوێی لەمامۆسـتای شـەرع نـاس بـێ، ئـەوا نـابێ لەکاروباری جیهاد فەتوا بدات، کە لەدەست دانی گیانی تێدایە و ماڵ و سـامانی بـۆ سـەرف دەکرێ و تێیدا دەست درێژی دەکرێتە سەر ناموس.

پاش لێکۆڵینـەوەیەکی ورد بۆ ژیانی چاکسازو موجاهید صلاح الدین بۆمان ڕوون دەبێتەوە ،کـە ئەوانـەی لـەزانانیان فـەتوایان داوە لـەو سـەردەمی ئـەوا لەشـەریعەتو مەبەسـتەکانی تێگەیشـتوونو زانیویانـە هاوسـەنگی لـەنیوان مەصـالیح و مەفاسـیدەکان بکـەن و باشـیش شارەزا بوونە لەو واقیعەی تیایدا ژیـاون و هونـەر سازیشـیان کـردوە لـەزانینی مەصـالیح و مەفاسیدەکان.

من لێرە ئامۆژگاری موسوڵمانان دەکەم فریو نەخۆن بەو کەسەی ،کە کەس شـاهێدی بـۆ نەداوە ئەهلی فەتوایە، مرۆڤیش بەئاینی خۆی لەهـەموو کەسـێك وەرنـەگرێ تـەنها لەوانـەی ئوممەت شاهێدی عیلمی بۆ داون و لەسەر دەستی زانایە سەر ڕاستەکان فێری عـیلم بوونـەو لەو پێناوەدا ئارامیان گرتوە ،چونکە ئاینو تێگەیشتن لێی وەك ئێسك و گۆشت و خوێنتە، جا بزانە ئایینت لەکێ وەردەگریو نەکەی لەوکەسانە وەری بگـری ،کـە هەنـدێك دەنوکیـان لەعیلم داوەو چەند لاپەڕەیەکیان لـێ خوێندۆتـەوەو پاشـان شـانازیان بـەخۆیان و عـەقلیان کردوە.

بەراستی عیلمـی شـەرعی لەماموّسـتا شـەرع زانـەکان بـەدەم وەردەگـیریو نـاکرێ مـرۆڤ بەتەنها لەکیتابەکانەوە فێری بێت ، بەڵکو ئەگەر بەتەنها لەکیتابەکان فێربێ ئەوە بەڵایەکـە لەبەڵایەکان، هەروا ئەو لاوانەی لەگەڵ یەکتر کۆدەبنەوەو بەبێ مامۆستایەکی زانا دیراسـەی زانست دەکەن.

پێشـەوا شـافیعی فەرمویـەتی: ئـەوەی لـەناوەرۆکی کیتابـەکان عـیلم وەربگـرێ ئـەوە ئەحکامـەکان بـەفێرۆ دەدات.[1] .هەنـدێك زانایـانی سـەلەفیش فەرمویانـە : گـەورەترین بـەڵا ئەوەیە، کەمرۆڤ لە لاپەڕی کیتابەکان فێری عیلم ببێ.[2]

بەراستی زانایانی ئوممەت هیچ کات ئالایان لەسەر سەری خۆیان بەرز نەکردۆتـەوەو هـیچ دروشمێکیشیان نەبووە خەڵکی بۆ بانگ بکەنو دواشـیان لەخـەڵك نـەکردوە ئینتیمایـان بـۆ بکەن، بەڵکو داوایان لەخەڵك کردوە ئینتیما بۆ سوننەتی **پێغەمبەر** بکەن ،جا بـرای بـەڕێزم ئاگـادار بـە نـەوەك وەك خەواریجـەکانت لـیبێ ئەوانـەی خـاوەن عـیلم و فـەزل بـوون بـەڵام لەهاوەڵەکان دابڕانو بەدوای ئەو ئەعرابیانە کەوتن کەوا تەنها وتاری گەرم گوڕیان دەزانی و سۆزی خەڵکیان دەوروژاند، جاموکڕبە لەسەر ئەوکەسـەی لـەئایین و عـیلم بـاروەر پێکـراوە چونکە : ئەو عیلمە ئاینە جا بزانن لەکێ وەری دەگرن[3] .

بەڕاستی جیلی صلاح الدین بەسەر کردەو سەربازەکانی باش لەوە گەیشتبوون ،کە عـیلم چەند نرخی هەیەو لە کێش وەری دەگرن بۆیە مەسەلەی فەتوادانیان دایە دەسـت کەسـانی شـیاو ، جـا زانایـە خواناسـەکان سیاسـەتی ئوممـەتیان بـەڕێوەبردوو قۆنـاغ بـە قۆنـاغ دەرۆیشتنو هەمووشیان مەبەستی ڕەزامەندی خـوای گـەورە بـوو، گرنگـی دانیـان بـە عـیلمو زانایانو جیهادو دەرپەڕانـدنی وزەکـان شـتێکی بەرچـاو بوو،بەڕاسـتی جیهـاد کـردن دەبـێ ئەممـەت بڕیـاری لەسـەر بـدات نـەوەك چـەند تاکێـك ،بەڵکوئەممـەت بـەهۆی خڕبوونـەوەی لەدەوری ئەهلی حەللو عەقد بڕیاری لەسەر دەدات.

دووەم: یەکێك لەنیشانەکانی کەسایەتی صلاح الدین گرنگی دانـی بـوو بەدادگـەری. ئـەمیرو وزیرەکانی پێشتر دەست درێژیان دەکردە سـەر مـاڵو زەویو زاری خـەڵکیو پادشـاکانیش ڕێگەیان پێدەدانو رازیان دەکردن بۆ ئەوەی هەر گوێڕایەڵیان بن.

سێیەم: ژیانێکی سادەی لەدونیا بردە سەرو لەدەست بڵاویـان هـیچ موڵـكو سـامانی بـەجێ نەهێشت ،بەڵکو بەخشیە خەڵك بەگشتیو هـەتا دوژمنیشـی بێبـەش نەکرد،لـەجلو بـەرگـو

---

[1] ـ ابن جماعة ، تذکرة السامع لا٨٧

[2] ـ هەمان سەرچاوەو لاپەری پێشوو

[3] ـ مقدمة صحیح مسلم ب١لا١٤

خواردنو خواردنەوەش زۆر سادەبوو تەنها ئەو پۆشاكانەشی لەبەردەكرد،كە دورست كرا بوون لە لۆكەو سوفو كەتان.

چوارەم: زۆر گرنگی بەزمانی عەرەبیو مێژوو دەداو لەشیعریش دیوانی ابو تمامی لەبەر بوو.

پێنجەم: بەردەوام نوێژەكانی بەجەماعەت دەكرد، وتراوە، كە بۆ ماوەیەكی دوورو درێژ نوێژی جەماعەتی نەچوە، هەتا لەو نەخۆشیەی پێی وەفاتی كرد،ئیمام دەهاتە لایو جەماعەتی بۆ دەكرد،ئەویش سەرەڕای نەخۆشی بە هەڵسانەوە نوێژەكانی دەكرد.

شەشەم: دڵێكی زۆر ناسكی هەبوو بۆیە كاتێك گوێی لەفەرموودەی خوا یان پێغەمبەرەكەی ببوایە یەكسەر فرمێسك بەسەر كوڵمەكانیدا دەهاتە خوارەوە.

حەوتەم: زۆر بەدەم پێكەنین بوو ئارامیەكی ئێجگار زۆریشی هەبوو لەسەر تاعەتو كاری چاكە.

ڕەحمەتی خوا لە صلاح الدینو دۆستانی بێو خودا لە چاكە كاران هەژماریان بكات.

## جوانترین ئەو سەر خۆشیانەی لەبارەی صلاح الدین وتراوە:

عماد الاصبهانی وتویەتی: شەوی یەك شەممە چوینە لای صلاح الدین ،كە نەخۆشیەكەی هەر توند دەبوو رۆژ بە ڕۆژیش خەڵكی دڵیان توندتر دەبوو، پاشان لەدار الفنا بۆ دارالبقا كۆچی كرد، جا بە مردنی ئاوات و هیوای پیاوەكان پچڕاو بەئاوا بوونی خۆریشی ئاسۆی چاكەو كاری باش تەنگ بویەوەو شاعیرانیش پێیاندا هەلگوت و سەرەخۆشیان لێ كرد، لەم بارەیەوە عماد الاصبهانی لەمرثیة بەناو بانگەكەی وتویەتی :

| | |
|---|---|
| شمل الهدى والملك عم شتاته | والدهر ساء وأقلعت حسناته |
| بالله أين الناصر الملك الذي | لله خالصة صفت نياته |
| أين الذي مذ لم يزل مخشية | مرجوة رهباته وهباته |
| أين الذي كانت له طاعتنا | مبذولة ولربه طاعاته |
| أين الذي ما زال سلطانًا لنا | يُرجى نداه وتتقى سطواته |
| أين الذي شرف الزمان بفضله | وسمت على الفضلاء تشريفاته |

لا تحسبوا من مات شخصًا واحدًا ... قد غم كل العالمين مماته
ملك عن الإسلام كان محاميًا ... أبدًا لماذا أسلمته حُماته
قد أظلمت مذ غاب عنا دوره ... لما خلت من بدره داراته
دُفن السماح فليس تنشر بعدما ... أودى على يوم النشور رفاته
الدين بعد أبي المظفر يوسف ... محفوفة بوروده حافاته
من لليتامى والأرامل راحمُ ... متعطف مفضوضة صدقاته
لو كان في عصر النبي لأنزلت ... في ذكره من ذكره آياته
بكت الصوارم والصواهل إذ خلت ... من سلها وركوبها عزماته
يا وحشة الإسلام حين تمكنت ... من كل قلب مؤمن روعاته
يا داعيًا للدين حين تمكنت ... منه الذئاب وأسلمته رُعاته
ما كان ضرك لو أقمت مراعيًا ... دينًا تولى مذ رحلت ولاته
فارقت ملكًا غير باق مُتعبًا ... ووصلت ملكًا باقيًا راحاته [1]
من للثغور وقد عداها حفظه ... من للجهاد ولم تعد عاداته
ماكان أسرع عصره لما انقضى ... فكأنما سنواته ساعاته
فعلى صلاح الدين يوسف دائمًا ... رضوان رب العالمين بل صلواته [2]

**جوانترین ئەو نامانەی باسی وەفاتی صلاح الدینی تیدا هاتوە:**

خاوەنی کتابی النجوم الزاهرة وتویەتی: لەو کاتژمێرەی صلاح الدین تیایدا وەفتی کرد قاضي الفاضل نامەیەکی بۆ کوڕەکەی مەلیك ظاهیر خاوەنی حەلەب نووسی ، کە ناوەڕۆکەکەی ئەمەی خوارەوە بوو:

﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ الاحزاب ٢١

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ﴾ الحج١

---

(١) النجوم الزاهرة (ج٦/٦٠،٦١).

(٢) صلاح الدين بطل حطين ومحرر القدس، ص ١٠٢.

ئەوا بۆ کوڕی خۆم مەلیك ظاهیر دەنووسم ئەو بەڵایەی خودای گەورە بەسەری هێناوین بەباشە بیگێڕیێو یەکێکیش لەجێی پادشای ڕۆیشتو دابنێ ، ئەو بەڵایەی تووشمان هات خەڵکی هەژاند بەجۆریك فرمێسکەکان شوێنەواری خۆیان لەسەر کولمەکان بەجێ هێشتو دڵەکانیش لەتاوان گەیشتنە گەروو، ڕووە پرشنگ دارەکەیشم لەباتی خۆم و خۆت ماچ کردو تەسلیمی لای پەروەردگارم کرد ،کە لەمەدا دەستەوسانم و بێ هێزم ،لەهەمان کاتیشدا رازیم لەخواو، لەبەر دەرگاش سەربازیکی زۆر هەیەو شمشێرەکانیش لەنێو کالآنی خۆیانن و بەڵاو قەزاو قەدەری خوا بەم شتانە ڕەت نابێتەوەو ، چاوەکانیش وا فرمێسك دەبارێنو دڵەکانیش غەمگینن‌و شتێکیش نالێین خوا بڕەنجێنێو ئێمەش ئەی یوسف بە لەدەست دانی تۆ زۆر دڵ تەنگین،..والسلام.[1]

رەحمەتی خوا لەصلاح الدین و ئەوانەی لەپێشیو ئەوانەش ،کە لەدوای دێن، کە دەستیان بە سنة التمکین گرتبوو....

بۆی هەیە خوێنەر پرسیار بکاتو بڵێ بۆچی ئەوها درێژە بدرێ بەژیانی صلاح الدین و نورالدین لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێم لەڕووخانی دەوڵەتی عوبەیدی هۆکاری ڕاستەو خۆو ناڕاستەوخۆ هەبووە منیش بەڕای خۆم پێم وایە ،کە لەگرنگ ترین ئەو هۆکارنەی بووە هۆی ڕووخانی دەوڵەتی عوبەیدی هەوڵ و کۆششی هەردوو سەرکردە صلاح الدینو نورالدین بوو، بۆیە درێژەم بەسیرەو ژیانە پڕ بەرکەتەکەیان داو لەگەڵ ڕوون کردنەوەی هۆکارەکانی سەرکەوتن،کە هەردوو سەرکردە پێی پابەند بوونو دەستیان پێوە گرتبو، لەگەڵ بەدیارخستنی کۆششی عیلمی و پەروەردەییو فیقهی ،کە زانایان لەو سەردەمو پێشە خۆیان پێی هەڵسان بۆئەوەی خوینەری بەرێز بگاتە ئەوەی ،کە صلاح الدینو نورالدین بێ پێشەکیو ڕێخۆشکردنو بێ نیشانەو بەڵگە لەناکاوی نایەن، بەڵکو دەبێ پێش ئەوان زانایان و بانگ خوازان و شەرع ناسەکان کاریان بۆ کردبێ و هەوڵیان بۆدابێ، هەروەها بۆ ئەوەی خوێنەری بەرێز بزانێ کەوا گۆرانکاری لەئوممەتدا ڕوونادات، ئەگەر لەپێشیدا کارێکی تۆکمەو پوختی بۆ نەکرابێ لەلایەن ئوممەت، بۆیە زۆر گرنگە بزانین هۆکارەکانی

[1] ـ النجوم الزاهرة ب٦لا ٥٢ ـ ٥٣

سەرکەوتن‌و فاکتەرەکانی ڕووخان چیە، لەوەش گرنگ تر ئەگەر مرۆڤ ئیخلاس‌و دڵسۆزی لەگەڵ تێکەڵ بکات کە ناکرێ .ئەم دووانە لەیەکتری دابڕێن.

بەم ئەندازەیە کۆتایم هێنا بەنووسینی دەوڵەتی عوبەیدی لەباکوری ئەفریقیا، ئەگەر ڕاستم پێکابێت ئەوا تەنها لەلایەن خواوەیە، ئەگەریش هەڵەم کردبێ ئەوا لەکەم تەرخەمی خۆمە.

داوا لەخوا دەکەم کردەوەکانم تەنها بۆ ئەوبێت و مسوڵمانیش سوودی لێوەر بگرن.

## ئەنجامەکانی لیکۆلینەوەکە :

١- کاتێك ئوممەت بەهێزە دوژمنانی پۆشاکی ئاین دەپۆشن بۆ ئەوەی لەناوەوە تەفرو تونای بکەن‌و، دروشمی بریسکەدارو ساختە بەرز دەکەنەوە بۆ خەڵەتاندنی موسوڵمانان، یەکەمین کەسیش ئەو کارە دزێوەی کرد عبداللە بن سبأی زەندیق ی جولەکە بوو، کە بەناوی شیعە گەرایەتی و سەرخستنی ئەهل و بەیتی پێغەمبەر تۆوی رافیضە ی لەناو ئوممەت چاند.

٢- بەڕاستی ئەهل و بەیت بەتایبەت زاناکانیان سەرەتا لەپێشەوا علی کوڕی تالیبەوە ئەوا لە زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعەت ئەژمار ئەکرێن‌و بەهەموو ئەو هێزو توانایەی هەیان بووە دژیەتی بیدعەو گومڕاییان کردوە.

٣- رافیزەکان زەیدی کوری عەلیان شەرمەزار کرد چونکە بەگوێی ئەوانی نەکردو جنێوی بە ابوبکرو عومەر نەدا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی رەوافیزەکان زۆر ڕقیان لەهاوەڵە بەرێزەکانە.

٤- شیعە گەرایەتی بوون بە گروپێکی زۆر لەناوچە جیاجیاکانی زەوی بڵاو بوونەوەو بوونە خاوەن دەوڵەتێك، کە پاریزگاریان لێ دەکا، شتێکی زانراویشە، کە فیکرەکان ناگۆڕێن بەڵکو پۆشاکیان دەگۆڕێ بەگوێرەی پێویستی ئەهلی هەموو شوێن و ڕۆژگارێك، جا ڕوون کردنەوەی گروپەکانیان ،کە بەربڵاون و هەندێکیشیان ناوی خۆیان گۆڕیوە ئەوا جیهادەو کارێکە خواو پێغەمبەرکەی خوشی دەوێ.

٥- خەتەرناکترین گروپی شیعە لەم رۆژگارەدا نوصەیریەکانن ئەوانەی لەڕابردودا لەگەڵ نەصرانیەکان ڕێککەوتن بۆداگیر کردنی دیار الشام، کەزۆر غەمبار دەبوون کاتێك

موسولمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنابـاو ئاسـودەش دەبـوون کاتێـك بـدۆڕابان و بەردەوامیش هاوپەیمانن لەگەڵ جولەکەو نەصاراو، دەوڵەتێکیشان هەیە لەسوریا ، کە ئەهلی سوننەیان تووشی چەرمەسەریەکی کوشندە کرد بگرە لەکوشتن و ئازار دان و دەربەدەرکردن و بەندکردن.

٦ـ ترسناکترین گرووپیان لەو سەردەمە اثناعشریە یەکانن، کە دەوڵەتێکیان لەئێران دامەزراندوە، بە لەسەر خۆییش بیرو فیکرەکانیان لەهەموو جیهاندا بڵاودەوکەنەوە، با پێشمان سەیر نەبێت ئەگەر ئەهلی سوننە هەر بەردەوام لەناو خەوە قوڵەکەیان بن ئەوا هەڵبستن بەدابڕینی ئیماراتی عەربی و بەحرەین و کەمێکیش لەعیراق و سعودیە ،ئەو فراون بوونەش بەجیهادو دین دادەنێن و خۆیان پێ لەخوا نزیك دەکەنەوە.

٧ـ ئیسماعیلیەکان بەرێك و پێکی کاروباری خۆیان رێکخست و هەموو هۆکارێکی بۆ فەراهەم کرد بگرە لەکەل و پەلی سەربازی و ماددی و خەڵکی خاوەن کەفائەشی هەڵبژارد بۆ ئەوەی بتوانێ پلان دابنێ و جێ بەجێ بکات.

٨- سەرکردایەتی ئیسماعیلیەکان شوێنێکی هەڵبژارد ،کە تیایدا کێشەیەکی تووند هەبوو لەنیوان دەوڵەتی عەباسی و چەند هۆزیکی تر، بەقۆناغیش بانگ خوازەکانی نارد هەتا ڕۆڵی ابوعبداللـه الشیعی هات، کە پیاویکی فێڵبازو زیرەك بوو، کیتابەکانی مێژوو ئەوە دەردەخەن، کە پیاویك بووە دروستکەری دەوڵەت بووەو توانایەکی سەربازی و فیکری و زۆری هەبووەو بەکاری هێناوە بۆ هینانەدی ئامانجەکانی ،جا کە توانی خاڵی هێز لەکۆمەڵگای مەغریبی لەکوێیەو خاڵە لاوازەکانیشی دەست نیشان کرد هەڵسا هێزی بەکارهێنا بۆ شەکەت و ماندوو کردنی دەوڵەتی ئەغالیبەکان بەم شێوەیە هەر لاواز بوو هەتا بەتەواوی لەساڵی ٢٩٧ کۆچی ڕووخا.

٩- خەڵکی لەسەردەمی ابو عبداللە ی شیعی ئامادەکاری ئەوەیان تێدابوو گۆڕانگاریەك دروست بکەن و دەگەڕان لە بەدیلێك و هەوڵی ئەوەیان دەدا ئەو زوڵم و ستەم کاریانە لابەرن، جا لێرەدا کێشەیەکی سەخت ڕوویدا لەنێوان ئەمیرەکان و گەلی باکوری ئەفریقی.

١٠- عبیداللە المهدی کاتێ حوکمی کەوتە دەست دەستی کرد بە لە ناوبردنی ئەو کەسە دلسۆزانەی دەوڵەتەکەیان بۆ دامەزراند، ئەمەش لەمێژووی مرۆڤایەتی شتێکی زانراوە، کە

هەر شورشێك بكرێ ئـەوا دەبـێ هەنـدێك ببنـە خـۆراكی شۆڕشـەكە ، منـیش دەڵـێم: ئەمـە دەچێتە ناو سوننەتێك لە سـوننەتەكانی خـوا ئـەویش ئەوەیـە هەركەسـێك یارمـەتی سـتەم كاریك بدات دەرەنجـام خـوا بەسـەریدا زاڵ ئەكاتـەوە، تۆڵـە سـەندنەوەی سـەرۆكی عـیراق لەوەزیرو زاواكەی زۆر لەئێمە دوور نیە، بەڵكو زۆربەی شۆڕشەكان تووشی ئـەو پـاك سـازیە دەبن.

١١- عبيدالله المهدی سوودی لەبیرو باوەڕی موسوڵمانان دیت لەبارەی المهدي چاوەڕوانكراو بۆیـە هەڵسـا كارەكـەی رازانـدەوەو رێكـی خسـت و قەناعـەتی پێكـردن كـەوا خـۆی مهـدي چاوەڕوانكراوە .

١٢- كاتێك تاریكایەكی شەوەڕەش دادێتو ئیسلام لەگورەپاندا نیە ئـەوا بـەردەوام زانایـانی ئەهلی سوننە بەرۆڵی خۆیان هەڵدەستن و ئوممەت دەبوژێننەوە ئەگەر چی بـا لەپێناویـدا ماڵ و سامان و كەسو كاریان لەدەست بدەن.

١٣- پەروەردەكردنی ئوممەت لەسەر بیروبـاوەڕی ئـەهلی سـوننەتو جەماعـەت پـەرژینێكی عەقەدی و فیكری و نەفسیە، كە لە شەپۆل و تەزووی گومڕاكەرەكان دەیپاریزێ.

١٤ـ خـەڵكی تـەرابلس دژی شـەپۆلی رافیضـەو بیروبـاوەڕی بـاطینی چوونە نـاو شـەڕێكی سـەخت، كـە لەدەرئەنجامـدا ئـەهلی طـرابلس بـەزەبری هێـز چـۆكیان دادا بـۆ دەوڵـەتی عوبیدیەكان.

١٥- عوبەیدیەكان تاوانی زۆر گەورەیان ئەنجامدا لەگەڵ خەڵكی بەرقە بەجۆرێك ئەگـەر بـۆت باس بكرێ موچوڕك بەلەشت دادێو منال پیر دەكات، جا ئەهلی بەرقـە لەبـەر ئـەو تاوانانـە دژی عوبەیدیەكان هەڵسانو كاربەدە ستەكەیانو زۆریش لەپیاوانی هۆزی كەتامەیان كوشت ، بەڵام دوایی عوبەیدیەكان توانیان بەسەریاندا زاڵ ببنـەوەو خـەڵكێكی زۆریشـیان ئـازاردراو كوشتو ئافرەتەكانیشیان بۆخۆیان حەلال كرد.

١٦- ابو یزید الخارجي توانی كیـانی دەوڵـەتی عوبەیـدی بلـەقێنێو نزیـك بـوو لـەناوی ببـات بەڵام بەداخەوە نەیتوانی ، چونكە عەقلیەتەكەی عەقلیەتی پیاوی دەوڵـەت نـەبوو پلانێكـی ڕوونیشی نەبوو بۆ ئەو ئامانجەو، پاشان غەدری لەهاو پەیمانـەكانی كـرد، كـە بـووە مایـەی ئەوەی خەڵكی متمانەی پێنەكەن.

١٧ـ زانایانی ئـەهلی سـوننە بڕیاریانـدا لەسـەر ئـەوەی یارمـەتی ابـو یزیـد الخـارجی بدەن ئەمەش بەپێی ئەو بنەما فیقهیەی، کەدەڵی ارتکاب اخف الضـررین ،جا لـە وانـە بەسـوودە فێری ئەوە دەبـین ،کـە دەبـێ زۆر ئاگامـان لـەخۆ بـێ لـەو هاوپەیمانیانـەی لەگـەڵ ئـەهلی بیدعەو ئەحزابە عەلمانیەکان دەیبەستین‌و دەبێ زۆر باشیش مەصالیح‌و مەفاسیدەکان لێـك بدەینەوە چونکە موسوڵمانی زیرەك و چاپووك نابێ لەکونێك دووجار پێوە بدرێ.

١٨ـ یەکێك لەهۆکارەکانی سەرکەوتنی شۆڕشـی ابویزیـد الخـارجی ئـەوە بوو،کـە خەلیفـەی عوبەیدیەکان القائم بامرالله جنێوی بەپێغەمبەران دەداو کوفرەکەی خـۆی ئاشـکرا کرد،جـا ابویزید ئەمەی قۆستەوەو هەڵسا بەهاندانی اباظیـەکـانی مـەغریب و هەنـدێك هـۆزو فەقیـە و خواناسەکانی کۆکردەوە لەسەریان.

١٩ــ الخلیفـە المنصـور العبیـدی ئیسـلامەتی خـۆی ئاشـکرا کـردو هەڵسـا بـەپێش خسـتنی فـەقیهو زاناکـان‌و چـیتر سـتەمی لـێ نـەکردن هـەتا ،کـە وڵات هێـور بویـەوە تـوانی بەسـەر خاریجیەکاندا زاڵ بێت و لەناویان ببات.

٢٠ـ خەڵکی باکوری ئەفریقی زۆر نەفەس درێژن‌و جگە لەمنهەجی ئەهلی سـوننەو جەماعـەت بەهیچی تر ڕازی نین‌و ئامادەشن چی لەتواناياندا هەیـە بیکـەن لـەپێناوی ئـەو بـیرو باوەڕە ڕاستە، بۆیە خەلیفە عوبیدیەکان ناچار بوون بیربکەنەوە بۆئـەوەی بڕۆنـە میسـر بـۆ ئەوەی ڕزگاریان بێت لەو شورش و هەڵچوونانەی ئەنجام دەدران.

٢١ـ دەوڵەتی عوبەیدی بوو بە پارێزەرو بەڕێوەبردنی فیکری بـاطيني لـەجیهانی ئیسـلامی و بەماڵ و کەل و پەلی سەربازی و ئەوەی پێویستی بوو بۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی بـەهێز بـێ لەدژی ئەهلی سوننە، قەرامیتەو عوبەیدیەکان بڕیاریاندا هاوکاری یەکتری بکەن بەڵام دوایـی لەسەر ماڵی دونیا کێشە کەوتە نێوانیان.

٢٢ـ دەوڵەتی عوبەیدی چەند هۆکاریکی جۆراو جۆری گرتـەبـەر بـۆ لـەناو بردنـی عەقیـدەی ئەهلی سوننە بەڵام ئامانجەکانیان هەموو نەهاتە دی.

٢٣ـ زانایانی ئەهلی سوننە بەهەموو شێوازێك دژی شەپۆلی عوبەیدیـەکان ڕاوەسـتان بگـرە لەعیلم و هەڵگرتنی چەك دژی ئـەو تاغوتـە سـتەم کارانـەو لـەم پێناوەشـدا بەرگـەی ئـازارو بەندیخانەو کوشتنیان گرت.

٢٤- زانایانی ئەهلی سوننە لەئەمیرەصنهاجیەکان نزیك بوونەوە بۆئەوەی ئامۆژگاریان بکەن و ئاراستەیان بکەن ،کەلەمەدا سەرکەوتو بوون بەتایبەت زانای پایە بەرز ابوحسن الزجال.

٢٥- گرنگی دان بەموعیز بن بادیس لەلایەن ئەهلی سوننەوە دەست کەوتێکی گەورەبوو ، موعیز بن بادیس زۆر لێزانانەو حکیمانە جیا بوویەوە لەدەوڵەتی عوبەیدیو زانانیان و فەقیهەکانی ئەهلی سوننەی لەخۆ کۆکردەوەو تەنگی هەڵچنی بەرافیزەکان و ،بەڵکو ڕای کێشان بۆ چەند جەنگێکی خوێناوی و لەوێ تەفرو تونای کردن.

٢٦- دوەڵەتی صەنهاجی بەربەری زیری لەسەردەمی موعیز بوو بەدەوڵەتیکی سوننی، ئەمەش سەرەتای لاواز بوونی دەوڵەتی عوبەیدی بوو بەڵکو یەکێك بوو لەهۆکارەکانی ڕووخانی.

٢٧- بەڕاستی ڕەت کردنەوەی مەزهەبە سوننیەکانو ئیلزام کردی خەڵکی بە یەك مەزهب بنەمای بەرگری کردنی تەسك کردوە لەبارکوری ئەفریقی، باشتر وابوو هەموو مەزهەبە سوننیەکان لەخۆ بگرێ وەکو ئەوەی ،کە نورالدین محمود وای کرد لەگەڵ ئەوەی خۆی حەنەفی مەزهەبیش بوو هەروا وەك ئەوەی ،کە صلاح الدین وای کرد لەگەڵ ئەوەی ،کە شافیعی مەزهب بوو.

٢٨- بەڕاستی سوننەتی خوا ڕوون و ئاشکرایە لەنەمانی پادشاو کار بەدەستەکانو ئەو بیرو فیکرانەی ،کە دەوڵەتەکان دەیان پاراست و، زۆر گورانکاریش بەسەر نەوەی کەسانێك دا هاتوە ،کە دوژمنی ئەهلی سوننە بوونە.

٢٩- دەوڵەتی عوبەیدی فێڵی لەموعیز بن بادیس کرد بەوەی هۆزەکانی ناردە باکوری ئەفریقی ،یەکێك لەهۆکارەکانی ڕووخانی موعیز ئەو کێشە سەختانە بوو ،کە لەنێوان صەنهاجە وکەتامەو زەناتە هەبوون، هۆکاریکی تریش ئەوە بوو، کەپێك هاتەی سوپای موعیز لەعەبیدەکان بوو ، کە پەروەردەیەکی ئیمانی باش نەکرابوونو موعیزیش زۆر گرنگی پێ دەدان.

٣٠- سەردەمیی تمیم بن موعیز باشتر بوو لەسەردەمی باوکی ، چونکە توانی ئەو شوێنانەی لەدەوڵەتەکەی دابڕا بوون بیگەڕێنێتەوەو ، هێزە عەرەبەکان بهێنێتە ناو سوپاکەی و

چەکداریان بکات، هەروا توانی بەسەر کوڕە مامەکاکانیدا زاڵ بێت، کە خاوەنی دەوڵەتی حەمادیە بوون. تەمیم هەر لەسەر ڕێڕەوی باوکی ڕۆیی و بانگەشەی بۆ کرد.

٣١- سەردەمی یەحیا بن تمیم لەبەهێزترین سەردەمەکانی دەوڵەتی زیری بوو بە تایبەتی لەبواری دەریاو هێرش کردنە سەر نەصرانیەکانو ناردنی کەتیبە جیهادیەکان بۆ حەوزی دەریای ناوەڕاست، هەروا بازرگانیش زۆر پێش کەوتوو بوو توانیشی لەگەڵ عەرەبەکان بەسیاسەتەکی حەکیمانە مامەڵە بکات.

٣٢- لەسەردەمی ئەمیر عەلی بن یەحیا تەماعی نەصرانیەکان بەدیار کەوتو کەشتیەکانیان لە صقلیە بەڕێکەوت بۆ دەریای ناوەڕاست بۆئەوەی پەلاماری موسوڵمانان بدەن.

٣٣- مەهدیە، کە پایتەختی زیریەکان بوو لەگەڵ تەرابلس و مدن الساحل لەباکوری ئەفریقی لەساڵی٥٤٣ کۆچی کەوتە دەستی نەصرانیەکان .

٣٤- موەحیدەکان توانیان باکوری ئەفریقی پاك بکەنەوە لە نەصارا و توانیان یەکێتیو یەك ڕیزی وڵاتەکان بپارێزن لە مەغریبی ئەقصاوە تاکو سنورەکانی میسر.

٣٥- ڕووخانی دەوڵەتی زیری چەند هۆکارێکی هەبوو گرینگ ترینینان ئەو کێشە ناوخۆیەی ،کە لەنێوان صەنهاجەو زەناتەو کەتامەدا هەبوونو کێشەکەش بەرەبەر هەر بەر فراوان بوو هەتا عەرەبەکان هاتن ناویەوە کە وای کرد دەوڵەتی زیری لاواز بێت لە بواری سەربازیو بازرگارنی و سیاسیو ، زاناو فەقیهەکانیش دەستیان بەکۆچ کردن کرد بۆ ئەندەلوس و مەغریبی ئەقصا.

٣٦- دەولەتی زیری سەدو هەشتا١٨٠ ساڵ حوکمڕانی کرد، پاشان کۆتایی پێ هات وەك ئەوەی هەر نەبوبێ ﴿لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ إِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ یونس٤٩.

٣٧- ئەگەر عوبیدیەکان سەرکەوتن لەلاواز کردنی دەوڵەتی موعیزبن بادیس ئەوا خوای گەورە برایانی موعیزی لەعەقیدە بەسەر زاڵ کردن وەك نورالدین محمودو صلاح الدین بۆئەوەی عوبیدیەکان لەناو ببەن.

٣٨- کۆششو ماندوو بونی ئوممەت چڕ بوویەوە لەدژایەتی کردنی شەپۆلی ئیسماعیلیە باطینیەکان ئەمەش زۆر بەڕوونی بەدیار کەوت لەوەی سوڵتان محمود الغزنوی پێی هەڵسا

لەولاتی هیند لەگەڵ سوڵتان ئەلب ئەرسەلانی سەلجوقی لەولاتی شام بۆ دژایەتی کردنی عوبەیدیەکان، غەزنەوی‌و سەلاجیقەکان لەبیرو باوەڕدا سوننی بوون.

٣٩- لەدەوڵەتی سەلجۆقی وزیر حەسەن کوڕی عەلی بەدیار کەوت ،کە خاوەن هیممەتێکی گەورە بوو بۆ ژیاندنەوەی سوننەو مراندنی بیدعە بۆ ئەم مەبەستە پیلانێکی دوورو درێژی دانا ،کە ئامانج گربوو بۆدەرچواندنی چەند نەوەیەکی تێگەیشتو لەئاین‌و لەهەمان کاتیشدا ئامادەکار بۆ قورابانیدان‌و لەم پێناوەدا هەڵسا چەند قوتابخانەیەکی لە نەیسابورو عیراق و شام دروست کرد هەتا گەیشتە میسرو زاناو فەقیهە کانیشی هاندا بۆخۆێندن‌و فێربوون‌و بانگەوازکردن و تێگەیاندنی خەڵکی‌و ، هەموو هۆکارێکی حەوانەوەشی بۆ زاناو فەقیهەکان دابین کرد، بەناو بانگترین زانا لەو قۆناغە دژوارەدا ابو المعالی الجوینی و الامام الغزالی‌و پێش ئەوانەش الماوردی‌و ابو اسحاق شیرازی بوون، کەئەوانە هەموویان زۆر بەڕاست و دروستی دژایەتی رافیزکانیان دەکردو سوننەتیان دەژیاندەوەو ئەمانە سەرۆکی قوتابخانەی شافیعی سوننی بوون ،کە رۆلێکی بەرچاوی هەبوو لەماوەی ڕاپەراندنی ئوممەت لەخەوەکەی و ئامادەکردنی بۆ فەتحەکانی نورالدین محمودو صلاح الدین.

٤٠- بەدیارکەوتنی زانایانی قوتابخانەی حەنبەلی سوننی وەك ابو الفاء بن عقیل وابو الفرج بن الجوزی،کە کاریان تەنها فێرکردن و پەروەردەکردنی خەڵکی بوو ، قوتابخانەی ابوسعید المخرمی حەنبەلیش لەم بوارەدا ڕۆڵێکی بەر چاوی هەبوو بەتایبەتی پاش ئەوەی زانای خواناس عبدالقادر الجیلانی کاروباری قوتابخانەکەی گرتە ئەستۆ ، کە زۆرێك لەزانایانی بەغدا لەسەردەستی پەروەردە بوون.

٤١ ـــ پاش ئەوەی کۆششێکی پەروەردەیی گەورە ئەنجام درا، کە گەورەترین دێدەوانەکانی‌و ناودار ترینیان الامام الغزالی و عبدالقادرالجیلانی بوون، پاشان کۆشش و ماندوو بوونی تریش ئەنجامدارا لەلایەن قوتابخانەی حەنبەلی و شافیعی، کە لەمەدا نەوەیەك لەدایك بوو کە خاوەن ئامانجێکی ڕوون‌و هیممەتێکی بەرز بوون ، لەو نەوەیەدا چەند سەرکردەیەکی خواناس بەدیارکەوتن وەك عمادالدین زەنکی، کە دەستی کرد بەسەندنەوەی زەوی و زاری مسوڵمانان لەژێر چەپۆکی نەصارا داخ لەدڵەکان‌و هاوپیمانە باطینیەکانیان.

٤٢ـ سەردەمی نورالدین سەردەمی گۆڕانی ئوممەت بوو مەشخەڵو ڕوخساری جێگیر بوونی پێوەدیار بوو، ئەمەش بەهۆی دادگەریەکەی و ، هەروەها خۆش ویستنی بۆ بەرژەوەندی هەرە گەورەو خۆبەخت کردن لەپێناوی ئەنجامدانی ئەم واجبە، ئەوانە هەموو پێکەوە کاریان کرد بۆ هێنانەوەی ئامانجە بەرزەکان.

٤٣ـ دەوڵەتی زەنکی وامەزەندەی کرد کەوا ئوممەت بەهێز نابێ هەتا عیراق و شام یەك نەگرن، بۆیە دەوڵەت هەڵسا بەیەکخستنی ناوچە ئیسلامیەکانو پێکەوەیانی گرێدا، هەروا بەتێڕوانینە دوورەکەی وای بینی، کە سەروەری بۆ ئوممەت نابێتو ناتوانرێ سەرکەوتن بەسەر نەصارادا بکرێ هەتا دەوڵەتی عوبەیدی رافیزی لەناو نەبردرێ، جا بۆ ئەم کارە خۆیان ئامادەکردو، نورالدین توانی دەوڵەتی عوبەیدی بروخێنێو توانی لەساڵی٥٦٤ سەنگەری شەڕی شام و میسر یەك بخات ئەمەش لەسەر دەستی یەکێك لەیارمەتیدەرە دلسۆزەکانی ،کە صلاح الدین الایوبی بوو.

بۆ خوێنەری بەرێز ڕوون دەبێتەوە، کە ئوممەت ناتوانێ بەرپەرچی هێرشەکانی نەصارا بداتەوە هەتا میسر وشام یەك نەرگرێ ، سەبارەت بە ڕۆڵی ئوممەتیش لەهێرش بردندا بۆ بەردەوام بوونی ڕەوڕەوەی جیهادو چوونە ناو ئەوروپا ئەوا بۆیان نایەتەدی هەتا باکوری ئەفریقیا لەگەڵ شامو میسر یەك نەگرێ.

٤٤ ـ دەوڵەتی زەنکی زۆر بەباشی چەند تۆڕیکی ئەمنی دانا بۆ بەدوا داچوونی ڕێکخستنە بیدعیەکان، کە کاری دەکرد بۆ لەناو بردنی دەوڵەتی زەنکی سوننی،جا دەوڵەتی زەنکی گرنکی دەدا بە بەدوا داچوونی کەمایەتیە نەصرانیەکان و ، لەلایەکی تریش تەنگی بەعوبەیدیەکان هەڵچنیو واشی لێکردن لەبەر چاوی دەوڵەت بنو لێی بزر نەبن ، جا بۆیە پێویستە بۆ ئەو بزووتنەوە ئیسلامیە سوننیانەی کە هەوڵ دەدەن بگەن بە حوکم بۆ ئەوەی شەرعی خواجێ بەجێ بکەن ئەوا پێویستە لەسەریان گرنگی بەنوسینگە ئەمنیەکانیان بدەنو برەوی پێبدەن بۆئەوەی بگونجێ لەگەڵ ئاستی ئەو قۆناغەی پێیدا تێدەپەڕێ بۆئەوەی بتوانی ڕۆڵی ڕێکخستنە بیدعیەکان یان عەلمانیەکان یان نەصرانیەکان یان جولەکەکان کەم بکاتەوە،جا گرنگی دان بەو لایەنەو لێهاتویی تیایدا یەکێکە لەگرنکترین هۆکارەکانی جێگربوون.

٤٥- دەوڵەتی زەنکی کاروبارە قیادیەکانی دەدا دەست سەربازو سەرکردە دڵسۆزەکانی ، ئەوانەی بەتەواوی بڕوایان بەبیرۆکەی دەوڵەت هەبوو، بۆیە کاتێك نورالدین محمود وەفاتی کرد صلاح الدین ئاڵاکەی هەڵگرتو، بەردەوام بوو لەسەر ئەو ئامانجانەی، کە دەوڵەت دیاری کردبوو.

بەڕاستی یەکێك لەو هەڵە لەناو بەرانەی ، کە هەندێك جار ئوممەت پیایدا دەڕوات ئەوەیە، کە پەیوەست دەبن بەچەند کەسیك جا، کە مردن ئەوا بێ ئومێد دەبنو ئەگەریش لارێ بوو ئەوا لارێ دەبن، بۆیە پێویستە لەسەر بانگ خوازان هەتا پێیان دەکرێ ئوممەت پەیوەست بکەن بەمەنهەج و بەردەوام بن لەگەیاندنی پیامەکەیان.

٤٦ ـ ئەگەر بمانەوێ دەوڵەتی کوفرو ئەحکامی نەفامی لابەرین ئەوا پێویست دەکات لەسەرمان لایەنی پەروەردەو لایەنی سەربازی تێکەڵ بکەینو ، پێویستە سەرکردایەتیش بۆ خاوەن زانایە سەر ڕاستەکان بێت و ئەوەی گومانیش ببات ، کە ئوممەت بەتەنها بەڕێگای سەربازی دەگاتە سەروەریەکەی ئەوە رێگای هەڵەی کردوە، خۆ ئەوەی لەئەفغانستان ڕوویدا هێندە لەئێمە دوورنیەو ئەوەی گومانیش ببات ،کە تەنها لایەنی سۆز ئوممەت بەهێز دەکات ئەوا ڕاستی نەپێکاوە، خۆی ئەوەی لەجەزائیر ڕوویدا هێندە لەئێمە دوور نیەو ئەوەی گومانیش ببات ،کە تەنها لایەنی پراکتیکی یان سیاسی دەبێتە چارەسەرێکی عیلمی ئەوا ڕاستی نەپێکاوە، بەڵکو چارەسەری ئەوەیە، کەئیسلام هەمووی بەتێکرایی وەربگریو، پێویستە خۆئامادە کردنیش هەموو ئەو لایەنانە بگرێتەوە ،کەئیسلام تیایدایە بگرە لەدەوڵەتو نیشتیمانو حوکومەتو ئوممەتو خەڵكو هێزو دادگەریو ڕۆشنبیریو یاساو عیلمو قەزاوەتو جیهادو بانگەوازو سوپاو ..هتد. جا ئیسلام چۆن عەقیدەیەکی ڕاستە ئەوها عیبادەتیشی ڕاستە،ئەوەش بوو، کە جیل التمكين لەسەردەمی نورالدین محمودو صلاح الدین گرینگیان پێداو بەهەندیان وەرگرت.

٤٧- صلاح الدین الایوبی لەسەرەخۆ کۆتایی هێنا بەدەوڵەتی عوبەیدیو ڕازیش بوو بەوەی وەزارەتی تەفویز بگرێتە دەستو دەستیشی کرد بە بنبڕکردنی عوبەیدیەکانو مەزهەبی سوننیشی بەدیار خستو لەدەرەنجامەکانیش پەلەی نەکرد، جا پێویستە سوننەتی تدرج پەیڕەو بکرێت لەگۆڕینی گەلان و لابردنی دەوڵەتەکانو پێویستیشە گرنگی بەپسپۆری

بدرێ لەکاروباری دەوڵەتو هونەرسازیش بەکار بهێنرێ بۆ دابەش کردنی ڕۆڵەکان بۆ ئەوەی بەتەواوی‌و بەتۆکمەیی بانگ خوازان ئامانجەکانیان بێننە دی.

٤٨- صلاح الدین،کە دەسەڵاتی لەدەست بوو چەکی لێخۆش بوونی بەکار هێنا لەگەڵ نەیارنی، جا بەم هەلوێستە نەبەردە توانی دڵی زۆر کەس بۆلای خۆی ڕابکیشێ‌و ، توانی موسوڵمانان بکاتە یەك ریزو توانی کۆتایی بینی بەفیتنە ناوخۆییەکان ، جا لێخۆش بوون لەکاتی دەسەڵاتدا ئەگەر لەجێی خۆی بێ ئەوا دەوڵەت بەهێز دەکاتو، دڵانیش بۆلای خۆی ڕادەکێشێ‌و دوژمنانیش لەناو دەبات.

٤٩- کاتێك صلاح الدین توانی بەرەی ناوخۆ یەك بخات سوپاکەی برد بۆ پاکردنەوەی شام لەخاچ پەرستەکان، ئەمەشی بەپلانێکی زۆر وردو عاقلانە کرد بەوەی هەڵسا بەسەندنەوەی ئەو قەڵاو شارۆچکانەی نزیك بوون لەمیسرو نەصاراشی ڕاکێشا بۆ شوێنێك بەناوی حطین، جا لەوێ گورەزە پیرۆزەکەی وەشاند، کەبووە هۆی کلیلی فەتح کردنی قودس.

٥٠- ئەخلاقی بەرزی سەرکردەکان لەفتوحاتەکان بەدیار دەکەوێت، بەراستی صلاح الدین لەفەتح کردنی قودس چاکترین‌و باشترین نمونەی نواند لەئەخلاق پاکی و دەست کراوەیی و لێخۆش بوون، هەتا پادشاکانی نەصاراو مێژوو نووسان بەو کردەوانە کاریگەربوون، چاکەش بەوە دەزانری کە دوژمن گەواهیت بۆ بدا.

٥١- سەرکردایەتی فیکری‌و عیلمی لەدەست صلاح الدین نەبوو، بەڵکو لەلای قاضي الفاضل بوو،کە دەستی صلاح الدینی گرت بۆ پەیرەوی کردنی شەریعەتی خوا، جا کاتێك سەرکردایەتی فیعلی لەئوممەت بۆ زانایە خواییەکان‌و سەرکردەو سەربازەکانە ئەوانەی مل کەچن بۆ فەرمانی خوا، ئەوا سەرکەوتن یاریان دەبێت‌و خوداش جێگیریان دەکات لەسەر زەوی هەتا ئەوە سیفەتیان بێت.

٥٢- ئوممەت کارلێك دەکا لەگەڵ سەرکردە بەجمو جۆلەکان کاتێك بیرو هزرەکان دێننە دونیای خەڵکی‌و ژیانی پێ بەڕێوە دەبەن‌و خەڵکیش لەدەوریان کۆدەبنەوەو ئەوەی لەتوانایان دایە پێشکەشی سەرکردەکانیان دەکەن ، بەڵام ئەگەر سەرکردەکان هەر قسەیان هەبوو عەقیدەکەیان مردبوو دڵانی نەدەبووژاندەوەو دادەنیشتن بۆ قسەی بێ مانا ، ئەوا ئوممەت پارچە پارچە دەبێت ، ئەوەش ، کە تێبینی کراوە لەسیرەی نورالدین محمود، کە

ئیسلامی هەموو لەخۆی جێ بەجێ کردو خۆشی بەفیعلی دەهاتە ناو گۆرەپانی جەنگ و هەروا قوتابیەکانیشی وابوون.

٥٣- هەرچەندە زوڵم ستەم درێژە بکێشێ و بەرفراوان بێ ئەوا دەبێ کۆتاییەکی هەبێ ،جا یەکسانە ئەگەر خۆی دەنواند لەتاکێك یان لەدەوڵەتێك، ئەو کۆتاییەش بەپێی سوننەتو یاسای خوایە لە ڕاکێشانی ستەم کارەکان بۆئەوی تۆڵەیان لی بسەنتەوەو بیان کاتە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەوانی تر، کوانی کار بەدەستانی عوبیدیەکان؟ کوانی مولك و دەوڵەت و سامانیان؟

٥٤- کاتێك جیهادکردن هەموو ئوممەت پێی هەڵدەستێ بە سەرکردایەتی ئەهلی حەلو عەقد ئەوا بەروبوومەکەی دێتە بەرهەم ، بەڵام کاتێك کەسانی نەفام و گەنجە خوێن گەرمەکان سەرکردایەتی جیهاد دەکەن ئەوا دەرەنجامەکەی خراپ دەبێت!

٥٥- من وا دادەنێم ،کە ئەوەی صلاح الدین و نورالدین پێی هەڵسان لەو کردەوە چاکانەی کردیان ئەوە بەروبوومو ماندووبونی چەند زاناو فەقیهو پەروەردەناسێك بوو، کە ئەو نەوەیەیان دروست کردو، بووە هۆی لەناوبردنی عوبەیدیەکان و نەصاراشی لەجەنگی حطین شکاندو مزگەوتی ئەقصاشی پاك کردەوە لەخاچ پەرستەکان.

٥٦- گرنگیدان بەسیفاتی سەرکردە خواناسەکانو زانایە چاڵاکەکان سوود بە ئوممەت دەگەیەنێ لە پەروەردەکردنە درێژخایەنەکەیو خۆ ئامادەکردنەکەی بۆ ئەوەی جارێکی تر لەسەر مەنهەجێکی ڕاست و ئاراستەیەکی سەلیم بێتەوە دونیای واقیع .

٥٧- ئەو لێکۆلینەوەیە سادەیە ڕەخنەو پێشنیار بەخۆیەوە هەڵدەگرێو نێوانی منو ڕەخنەگریش وتەی شاعیرە،کە وتویەتی:

ان تجد عیبا فسد الخللا جل من لاعیب فیه وعلا

وأخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمین.

## ناوڕۆك